# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتووری بیانی

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

٦٤
ساڵی دوانزەهەم
پاییزی
٢٠١٠



**ناونیشان:**

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
شەقامی سالم - سلێمانی
تەلەفۆن: دەزگای سەردەم ٣١٢٨٩٢٠ - ٣١٢٠٨٩٠
سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

**لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:**
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

**نرخی (١٢٥٠) دینار**

# ناوەڕۆک

## سەردەم - ژمارە ٦٤

### فیکر و فەلسەفە



### گفتوگۆ



### ئەدەب

## وێستگەکانی سەردەم



## بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

---

• سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.

• داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.

• ئەو بەڕێزانەی بە نووسین و ئامادەکردن بەشداری دەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمییەکان لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە پێڕەوبکەن.

• بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ بکرێن، سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێڕ هاوپێچ بکرێن.

• ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و ڕۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.

• بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

• گۆڤاری سەردەم مافی چاکردنی زمان و باشترکردنی بابەتەکانی لە ڕووی هونەریەوە هەیە، بەبێ دەستێوەردان لە ناوەڕۆکی بابەتەکە.

• پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەر و سایتی گۆڤارەکەوە ئەنجام دەدرێن.

# سەردەم و ستراتیژیەتێکی نوێ

هەر لە سەرەتاوە دەزگای سەردەم بایەخێکی تایبەتی داوە بە وەرگێڕان لە بوارەکانی فیکر وفەلسەفە و ئەدەب وهونەر، هەمیشە سەردەم هەوڵی داوە لەم بوارەدا پێشەنگ بێت. ئەم هەوڵە مەعریفیە لە هەموو پرۆژەکانی دەزگای سەردەمدا لە دوانزە ساڵەی تەمەنیدا رەنگیداوەتەوە.

گۆڤاری سەردەم لە ژمارەکانی داهاتووەوە دەخوازێت هاوشان بەو ستراتیژیەتەی کە دارێژاوە، دەلاقەیەکی ئەکادیمی لە سەر وەرگێران وەک تیۆر بکاتەوە. ئێمە لە سەردەم هەستمان بەم گرنگییە کردووە. کاتی ئەوە هاتووە وەرگێران وەک ستراتیژیەتێکی کەلتووری بە رۆشنبیری کوردی بناسێنین، هەستمان بەوە کردووە کە چەندان بواری دیکە لە وەرگێران وبابەتەکانی پەیوەست بە وەرگێران هەن پێویستە لایان لێبکەینەوە، دەبێت دەست بۆ ئەو بوارانە درێژ بکەین کە تا وەکو ئێستا پەنهانن. کاتی ئەوە هاتووە هێڵە گشتی وبنەما تیۆریەکانی وەرگێران راست لە زمانە سەرەکییەکانەوە بۆ ئەم کارە داهێنەرانە دارێژرێت. ساڵانێکی دوور و درێژە لێشاوێکی ئێجگار زۆر ئەم بوارەی گرتۆتەوە وپانتاییەکی فراوانی لە دیمەنی رۆشنبیری کوردی داگیرکردووە.

بێ دووودڵی، کەلێنێکی گەورە هەیە دەخوازێت دەستبەجێ پێداچوونەوەیەکی فراوانی بۆ بکەین وبناغەیەکی پتەوی بۆ دامەزرێنین وهەڵسەنگاندنێکی ووردی بۆ بکەین بۆ هەنگاونان بۆ قۆناغێکی دیکە، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئەرکە، پێویستە هەوڵ و لێکۆڵینەوە پراکتیکییەکان وئەکادیمییەکان رێکبخەین، وپلانی نوێ دارێژین وپابەندی بین. دواجار، هەر ئەم کارە دەبێتە باشترکردنی ناوەرۆکی بابەتەکان وناساندنی بەردەوامی ئەو لێکۆڵینە رەسەنانەی لەم بوارەدا هەن بە رۆشنبیری کوردی.

زۆر جار هەستمان کردووە ئەو نووسینانەی بە شەکەتییەکی زۆرەوە خراونەتە بەردەم خوێنەر لە یادەوریدا نەماون، زۆر جار هەستمان بە گوناە کردووە، وتومانە رەنگە هەڵە لە جۆری ئەو پەیوەندییە بێت کە لە نێوان بابەت/ دەق و خوێنەردا دروستمان کردووە، هەندێ جاری دیکە وتومانە رەنگە خوێنەر هەستی بە گرنگی بابەتێکی تایبەت نەکردبێت. بۆ چارەسەرکردن وپتەوکردنی ئەم پەیوەندییە ئێمە لەمەودوا بابەتێکی وەرگێراو بە چەندان پەراوێز وتەفسیری کراوە بۆ پشتیوانی کردنی خوێنەر ئامادە دەکەین، بۆ ئەوەی بابەتەکان تۆکمەتر خۆیان بنوێنن و بە چاوێکی رەخنەگرانەوە بخوێنرێنەوە، گفتوگۆیەک لە گەڵ بابەت و خوێنەردا بەرجەستە بکەین کە خوێنەر وا هەست بکات لە وۆرکشۆپێکی فیکریدا ئامادەیە.

دەخوازین لەم پرۆسەیەدا خوێنەر بەشێکی سەرەکی پرۆژەکەمان بێت، پردێک لە نێوان سەردەم وخوێنەردا دامەزرێنین؛ ســـەردەم لەلایەک ببێتە رەنگدانەوەی پێداویستییە رۆشنبیرییە سەرەکییە جیهانییەکان لە ناو رۆشـــنبیری کوردیدا، لەلایەکی دیکەوە رەنگدانەوە وتەفســـیرێکی زۆر نزیک لە ناوەرۆکی راســـتەقینەی بابەتەکان بێت، بە مانایەکی دیکـــە دەبێت خۆمان بپارێزین لەو لێکدانەوە لاوەکیانەی کە چەندان ســـاڵە هەگبەی رۆشـــنبیری کوردی قورس کردووە وبوونەتە تارمای ناوەرۆک و دەق وبابەتـــەکان نەوەک دەرخســـتنی بابەتـــەکان وەک خۆیان. دەخوازین خوێنـــەر بۆ ژووانێکی نوێ بانگهێشـــت بکەین کە بابەتەکانـــی وەک چەمک وتیۆرە جیاوازەکانی وەرگێـــران، لێکۆڵینەوە جیاوازەکانی وەرگێران، مێژووی وەرگێران، گەشەســـەندنی وەرگێران راڤەکردنی ئاســـت و ســـتراتیژ و خیتابـــە جیاوازەکانـــی وەرگێـــران ، پەیوەندیەکانی وەرگێـــران و کەلتوور و میدیا و شـــوناس و رۆژنامەگەری بەرجەستە بکات.

ئێمـــە پێمان وایە کـــە تەنها وتەنها ئەم کارە بـــە مامەڵەکردن لەگەڵ نووســـین ودەق وبابەتی رەسەندا لە زمانە سەرەکیەکانەوە دێتە دی، بابەتێک کە بە چەندان جۆری سانسۆردا تێنەپەریبێت. بەداخەوە، زۆر جار وەرگێران پرۆسەیەکی زۆر میکانیکی بووە، نە رۆح و نە بەرجەستەکردن بووە، و نە نووسینەوەیەکی داهێنانەی دەق بووە، و نە تۆمارێکی زیندووی دیکە بووە، و نەهەمان تەفسیری ماناکانی دەق لە زمانێکی دیکەدا بووە. وەرگێران زۆر جار لە پیاســـەیەکی رێبوارانە وســـەردانێکی سەرپێیانەی دەق زیاتر نەبووە.

هاوشان بەم کارە بایەخێکی زۆر تایبەت بە بوارەکانی میدیا وەک بەشێک لە زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کەلتوورییەکان دەدەین، بابەتەکان لە جۆری تیۆرەکردنی میدیا وجیهانگیری، سیستمی میدیـــای خۆرئاوا، بـــە میدیاکردنی جیهانگیری، بە میدیاکردنی کۆســـمۆپۆلیتیزم .. هتد. هەروەک ئاگادارن کە ئەمرۆی رۆشـــنبیری کوردی پێویســـتییەکی ئێجگار زۆری بە ئاشـــناکردنی خوێنەر و پســـپۆرانی کورد هەیە بە سیستمە سیاســـی وکەلتووریەکانی میدیا، و ڕامالێنی ئەو نەنگییەی لە بەکارهێنانی چەمکەکاندا هەیە.

ئەم تەوەرە نوێیانە دەچنە پاڵ بوارە ســـەرەکییەکانی دیکەی ســـەردەم کە ئەوانیش گۆرانکاری ریشـــەییان بەسەردا دێن. بە هیوایین لە ئاســـت چاوەروانییەکانی خوێنەردابین و وەرزەکانی سەردەم هەمیشە پڕ مانا وپەیام بێت.

**سەردەم**

# ئەرِیستۆتێلیس




ئێرنست ر. زاندفۆس
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

## 1-ڕەوتی پێگەیشتن

ئەڕیسـتۆتێلیس لە ٣٨٤ ی پ.ز. لە ستاگیرا هاتۆتە جیهانەوە. ستاگیرا ناوچەیەکی بچووک بوو، دەکەوتە سـەر ڕۆخی باکووری خۆرهەڵاتی نیمچە دوورگەی کالکیدیکە کە بە ناوی دایکە شـاری کالکیسـی سەر یۆبۆیاوە ناونرابوو. فیلیپی دووەم (٣٣٦-٣٥٩) کە پاشای مەکدۆنیا بوو، ساڵی ٣٥٠ پ.ز. فەرمانی دا ستاگیرا و سی شاری دیکە، کە دژی ئەو لە یەکێتیی شارەکانی کالکیدیکیدا یەکیان گرتبوو، وێران بکرێت. وەک دەگوترێت، ئەڕیسـتۆتێلیس هەوڵی داوە سـتاگیرا سەرلەنوێ دروست بکرێتەوە، بەڵام ئەم هەوڵەی پاشـان لە سـەردەمی فەرمانداریی فیلیپ یان ئەلێکساندەری کوڕیدا بەدیهاتووە.

ئەرِیستۆتێلیس «نیمچە گریکی» نەبوو، بەڵکو ئیۆنی بوو. وڵاتەکەی ئەو، ناوچەیەکی سەرسنووریی جەنگ بوو لە نێوان هێلاس و تراکیا و مەکدۆنیادا. ئەو بەهۆی ئەم زێدەوە وەک ئیۆنییەک، هەروەها لە رەچەڵەکییەوە وەک کوڕی خێزانێکی رۆشنبیر، توانای پێدرابوو بۆ ئەوەی فەلسەفەی سروشتیی ئیۆنیی و فەلسەفەی تێگەیی ئەسینایی پێکەوەبلکێنێت. باوکی ئەرِیستۆتێلیس، نیکۆماخۆس، پزیشکی تایبەتیی ئامینتاسی دووەمی پاشای مەکدۆنیا بوو، لە (٣٩٢ پ.ز. مرد) و شەش کتێبی لەبارەی هونەری چاککردنەوەی نەخۆشی و کتێبێکی لەبارەی سروشت نووسی بوو. دایکی ئەرِیستۆتێلیس ناوی فێستیس بوو، کچی خێزانێکی کۆچکردوو بوو لە کالکیسەوە. ئەرِیستۆتێلیس هەروەها برایەک و خوشکێکی هەبوو. پێدەچێت ئەم خێزانە زوو گواستبێتییەوە بۆ کۆشکی پاشا لە پێلا. ئەرِیستۆتێلیس لێرە نەک تەنیا پاڵهێزی بۆ خەریکبوون بە زانستی سروشتیی پزیشکییەوە وەرگرت، بەڵکو هەروەها فۆرمەکانی رەفتاری ژیانی بەگزادەیی ناسی. گەر لە رەچەڵەک و پەروەردەی ئەوەوە بڕوانین، ئەوا دەبینین کە لە لای ئەرِیستۆتێلیس زۆر کەم ئەو پێشمەرجانە لەگۆڕێدا بوون بۆ ئەوەی ببێت بە چاکسازی کۆمەڵگە یان تەنانەت بە شۆڕشگێڕ. لە بنەڕەتدا تێڕوانینە سیاسییەکانی ئەو، لە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی پلاتۆندا، کۆسەرڤاتیڤ دەنوێنن. ئەرِیستۆتێلیس هەر لە لاوێتییەوە پۆشاکەکانی بە پەرۆشەوە هەڵدەبژارد و زۆر ئاگادار بوو لە شێوازی رەفتاری خۆی. گەرچی رەچەڵەک و هاندان و ئەزموونی دەوڵەمەند دۆخی لەباریان بۆ گۆڕانی ئەو رەخساند، بەڵام ئەو لە لایەکی دیکەوە زوو بێ دایک و باوک کەوت. ئیتر یەکسەر بەدووی ئەم رووداوەدا پرۆکسێنۆس ی ئاتارنیۆسی پەروەردەی ئەوی لە ئەستۆ گرت. ئێمە بەگشتی زۆر کەم لەبارەی ساڵانی گەنجێتیی ئەو دەزانین، ئەمانەش ئەو ساڵانەن کە بۆ گۆڕانی ئایندەی ئەو گرنگن. مرۆڤ دەتوانێت گریمانە بکات کە ئەرِیستۆتێلیس هەموو هەلێکی دەقۆزتەوە بۆ ئەوەی خۆی پتر پێبگەیەنێت. ئەو لە سەرەتای 'مێتافیزیک'ـەکەیدا دەنووسێت: «سەرجەم مرۆڤان لە سروشتەوە هەوڵ بۆ مەعریفە دەدەن»، بەڵام لە بنەڕەتدا پێدەچێت ئەم رستەیە بەتایبەتی ئەو خۆی بگرێتەوە. لە ئەرِیستۆتێلیسدا، لەپاڵ شادیبینیندا لە فێربوون، زۆر زوو ئەو جیددییەتەی ژیان چەسپی کە لە خۆشەویستترین واژەی ئەودا دێتە دەربڕین، بێگومان واژەیەک کە زۆر بەزەحمەت شیاوی وەرگێڕانە: سپودایۆس (spoudaios) (چوست، چالاک، جددی، سەرڕاست). پێدەچێت ئەرِیستۆتێلیس بەدرێژایی ژیانی پیاوێکی تەنیا بوو بێت. ئەو کەسێکی ناخەکی بوو، هەروەها مێلانکۆلییەکی تایبەتمەندی تاڵ ئەوی تەنی بوو، کە بەزەحمەت بۆی دەلوا هاوسەنگی بە گرژی و نەسازییە ناخەکییەکانی بدات، کەچی ئەو، سەرەڕای ئەم مۆرکە، بوو بە وەستای هاوسەنگکردنی بۆچوونە دژبێژەکان، بە باوکی لۆگیک، بەکورتی بوو بە باوکی رستەی دژبێژی. بەڵام پێدەچێت کە ئەو سەروەریی بەسەر دژبێژییە ناخەکییەکانیدا وەرگرتبێت، توانیبێتی شرۆڤەیان بکات و لێوەیان شتێک دروست بکات. ئەو لە نووسینی «ئانالیتیکەکان»دا هەوڵ دەدات رووناکی بپەخشێنێتە سەر ئەو تاریکییە کە لە نێویدا بوونی نەساز خۆی حەشار داوە. واژەیەکی دیکەی خۆشەویستی ئەو بریتی بوو لە «نووس» (nous / هۆش). بەڵام نووس هاوکات ناوبانگی ئەو خۆی بوو لە ئەکادیمیا. لە «نووس»دا بە

چڕترین شـــێوە رووە ئۆبژێکتیڤییەکانی بوونی ئیدیال پێکەوە لەتەک لایەنە ســـەبژێکتیڤییەکانی کەسایەتیی مرۆڤدا دەردەکەون.

ئەرپیســـتۆتێلیس ویستی لە ئەسینا لە فەلســـەفە بکۆڵێتەوە، بەڵام ئەو لە کاتێکدا ئەکادیمیای ناســـی کە پلاتۆن لەوێ نەبوو: دووەم ســـەفەری بۆ سیســـیلیا (٣٦٧-٣٦٥ پ.ز.) ئەنجامدابوو. لەو ماوەیەدا یۆدۆکســـۆس ی کنیدۆســـی ئەکادیمیای لەبریی پلاتۆن بەڕێوەدەبرد. ئیدی ماوەیەک دوای ئەمە ئەرپیســـتۆتێلیس بەو پیاوە گەیشت کە بۆ ماوەی بیست ســـاڵ کاری لەگەڵدا کرد و لەتەکیدا چووە نێو پەیوەندییەکی دۆستانەوە. پلاتۆن نزیکەی چل و پێنج ساڵ لە ئەرپیستۆتێلیس بەتەمەنتر بـــوو. بـــەڵام زۆری نەخایاند پلاتۆنیش دەرکی کـــرد کە «فێرخواز»ەکەی خاوەنی ســـەربەخۆیی و پابەندبوونە بە رووداگەوە، خاوەنی سەروەریە بەسەر خۆدا و توانایەکی بەرزی بۆ ئەبستراکتکردن هەیە. ئەرپیســـتۆتێلیس کە سەرەتا هەســـتی کرد لەلایەن ئەو زانا مەزنەوە تەحەدا کراوە، ئەوا پاش ماوەیەک پلاتۆنیش ناچار بوو دەرک بەو هەقیقەتە بکات کە پەیوەندییەکەیان یەکلایەنی نییە. لەبەر ئـــەوەی ئەو دوو پیاوە خاوەنی مەزنێتییەکی ناخەکیی پڕ بوون، ئەوا لە تەقەلاکانیاندا بۆ مەعریفە جێگەی تەماح و پێداویســـتیی زاڵبوون نەدەبووەوە. لە گرژییە ئافرێنەرەکەی نێوان هەردووکیانەوە پەیوەندییەکی هەتا بڵێیت بەبەرهەمی پێدان و وەرگرتنی دوولایەنی ســـەری هەڵدا. بێگومان لێرەدا و لۆمەکەریش کەم نەبوون کە هەوڵیان دەدا لە لای پلاتۆن وێنەیەکی بەدی ئەرپیستۆتێلیس بهێننە ئاراوە، بەڵام لەم هەوڵەیاندا ســـەرکەوتوو نەبوون. ئەرپیســـتۆتێلیس زۆر جیاواز بوو لە سروشتێکی خشۆکی خۆبەرەپێش یان خۆژێرخەر؛ ئەو نە هەبوویەکی نشوستیهێناو بوو و نە هەڵپەی کاری دەکرد، کە ئیتر لێرەشـــەوە هەوڵ بدات بەرێی هۆشـــی دژبێژەوە، بەرێی ئۆپۆزیسیۆن و ئیستیفزازکردنەوە دەرکپێبکرێت و ئینجا لە کۆتاییدا لە لای مامۆستاکەی ناو و پۆست داگیر بکات. بەڵام ئەرپیستۆتێلیس لە حاڵەتی ناکۆکیدا رەخنەگرێکی تیژ بوو و هەتا رادەی شیان رەخنەکانی دەردەبڕی، لە راستیشدا هیچ شتێک وەک رەخنەی ئەنگێوەر مرۆڤ بێزراو ناکات. جگە لەوە ئەرپیستۆتێلیس ئەسینایی نەبوو. ئیتر ئەو بەهۆی تێمپەرامێنت و خۆشەویســـتییە ریشـــەییەکەیەوە بۆ راســـتی، هەمیشە پتر تەنیا دەکەوت. ئەرپیســـتۆتێلیس، کە لە رادەبەدەر تاسەی بۆ دۆست و دۆستایەتی هەبوو، ژمارەیەکی کەم دۆستی پەیداکرد، بەڵام بەرانبەر ئەمە هێندەیش زۆر دوژمنی لێپەیدابوون. بەتایبەتی مەرگی پلاتۆن زۆر بەقورسی ئەوی هەنگێوت. پاشان برازاکەی پلاتۆن، سپیۆزیپۆس، رابەرایەتیی ئەکادیمای گرتە ئەســـتۆ. پێدەچێت کە ئەرپیستۆتێلیس هەســـتی کردبێت بازی بەسەردا دراوە، چونکە ئەو دەمەیش هیچ گومانێک سەبارەت بەو پرسیارە نەبوو، کە داخۆ کێ بۆ بەرێوەبەرایەتیی ئەکادیمیا گونجاوترین کەس بێت. ئیدی ئەرپیســـتۆتێلیس بەدووی ئەمەدا داوەتەکەی هێرمیاســـی قبووڵ کرد، کە ئەویش لە رابوردوودا ئەندامێکی ئەکادیمیا بوو و ئێســـتاش دەســـەڵاتداری ئاتارنیـــۆس بوو- ناوچەیەکی بچووک لەســـەر رۆخی باکووری خۆرئاوای ئاســـیای بچووک و بەســـەر ئاسۆســـەوە کە شارێک بوو لەسەر کەنداوی ئەدرامیتێن لە میســـیا. کەواتە کاتێک سپیۆزیپۆس بەرێوەبەرایەتیی ئەکادیمیای وەرگرت (٣٤٧-٣٣٩ پ.ز.)، ئەوا ئەرپیســـتۆتێلیس پێکەوە لەتەک کسێنۆکراتێسدا کە ئەکادیمییەکی

دیکــە بوو و لە ئاینددەدا بوو بە بەڕێوەبــەری ئەکادیمیا (٣٣٩ — ٣١٥ پ.ز.)، کەوتە ڕێ بەرەو ئەو ناوچە دڵگیرەی ئاســیای بچووک. لەوێ هەردووکیان سێ ساڵی بێخەم و پڕکاریان بەسەر برد. بەڵام بەداخەوە ئەو ماوە بەختەوەرە بە کۆتاییەکی نالەبار تەواو بوو: فارســەکان هێرمیاسیان لە خاچ دا، چونکە کاتێک فارسەکان ویستیان ناچاری بکەن بۆ درکاندنی پلانەکانی فیلیپی دۆستی کە پاشای مەکدۆنیا بوو، ئەو جەسوورانە ئەو داواکارییەی گەڕاندەوە.

ئەرِیســتۆتێلیس ســەرلەنوێ یەکێک لە دۆســتە دەگمەنەکانی دۆڕاند، بەڵام هەر چۆنێک بێت، نیشــتەجێبوونەکەی لە ئاســۆس شتی جوان و شادیبەخشــی بۆ هێنا: پیتیاس کە خوشکی (یان خوشــکەزای) هێرمیاس بوو. ئەرِیســتۆتێلیس لەم ژنەدا هاوســەرەکەی ژیانی دۆزییەوە؛ ئینجا لە تیۆفراســتدا هاوکارێکی دڵسۆزی دۆزییەوە کە نەک تەنیا بەردەوامیی بە میراتەکەی ئەو دا، بەڵکو دوای مەرگی ئەرِیستۆتێلیس پێریپاتۆسی دامەزراند. ئەرِیستۆتێلیس هەروەها کاتی بۆ لێکۆڵینەوەی فراوانی ئەمپیری هەبوو. ئەرِیســتۆتێلیس فەیلەسوفێکی گەنج بوو، بەڵام ئەو نەناسراو نەبوو. ئیدی ئەوە بوو دوای نیشــتەجێبوونێکی کورت لە میتیلێنەی ســەر لێســپوس، بانگهێشتەکەی فیلیپی پاشــای مەکدۆنیای پێگەیشــت، تاوەکو کوڕەکەی، میر ئەلێکساندەری ســیازدە ساڵان، پەروەردە بکات. ئەرِیســتۆتێلیس ئەم بانگهێشــتەی فیلیپی قبوڵ کرد و پێکەوە لەتەک تیۆفراستدا ڕۆیشتن بۆ پێلا. بەڵام ئێمە بە دەگمەن شتێک لەبارەی نیشتەجێبوونەکەی ئەو لە پێلا دەزانین. هەرچۆنێک بێــت، ئەم چالاکییەی فێرکارییەکی تایبەتی (پریڤات) لە مەکدۆنیا، دەرفەتی بۆ ئەرِیســتۆتێلیس ڕەخســاند کە ئەو شــتانەی فێریان بوو بوو، وەک کەرەسە بەکاریان بهێنێت، هاوکات بەردەوامی بە هزرین بدات و ئەو شــتانە بچەســپێنێت کە دەرکی پێکردبوون، هەروەها کار لە کۆنســەپتەکانیدا بــکات و پلان بــۆ پرۆژەی نوێ دابنێت. هاوکات ئەو چالاکییــە پەروەردەییە وەک تاقیکردنەوەیەک بوو بۆ هێزی مۆتیڤ و گرنگیدانە فەلســەفییەکانی. ئەلێکســاندەر فێرکارەکەی خۆش دەویست و هۆشســام بوو پێــی، هەروەها ئەو درەنگتر گۆتی، کە لە باوکی خــۆی ژیانی وەرگرتووە، بەڵام لە ئەرِیستۆتێلیســەوە فێر بووە چاک بژی. کەواتە ئەو حەوت یان هەشت ساڵە کە ئەرِیستۆتێلیس لە کۆشــکی مەکدۆنیا بردنییە ســەر، نە بۆ ئەوی پەروەردکار و نە بۆ فێرخوازەکەی کاتی دۆڕاو بوون. بە هەر حاڵ، بۆ ئەرِیســتۆتێلیس دوای سێ ساڵ وانە بەردەوامەکان کۆتاییان پێهات، چونکە باوکی ئەلێکســاندەر لەدژی بێزەنت کەوتە لەشکرکێشــی و لەبەر ئەم هۆیە کار و بارەکانی حوکمداریی بە کوڕەکەی سپارد (٣٣٩/٣٤٠).

چەند ساڵێک دوای ئەمە، پیتییاسی هاوسەری ئەرِیستۆتێلیس مرد. ئەو لەم ژنە کچێکی هەبوو کە بە نــاوی دایکییەوە ناونرابوو. هاوســەرە نوێکەی ژیانی، هێرپیلیس ی ســتاگیرایی، کوڕێکی بۆ هێنایە جیهانەوە کە ناوی نیکۆماخۆســی لێنرا و ئەرِیستۆتێلیســی فەیلەســوفیش «ئێتیکی نیکۆماخی»ی پێشــکەش کرد. بەڵام هێندەی نەخایاند کە لەنێوان فێرکار و فێرخوازدا نامۆبوونێک هاتە ئاراوە، چونکە ئەلێکســاندەر ڕێی دا خزمێکی ئەرِیســتۆتێلیس بە ناوی کالێســتینێس لەدار بدرێت. فیلیپی دەســەڵاتدار لەو هێرشــە مەزنەدا مۆرالێکی شــاهانەی خۆرهەڵاتیی خستە ڕوو و

ئەمەش وای کرد کە کالێســـتینێس هەڵوێســـتێکی دژبەر بەرانبـــەری وەربگرێت. هۆیەکی دیکە بۆ هاتنەئـــارای ئەو نامۆبوونە ئەوە بوو کە ئەرِیســـتۆتێلیس پەیوەندیی دۆســـتایەتیی لەتەک ژەنەراڵ ئەنتیپاتەردا هەبوو کە دژی ئەلێکســـاندەر وەســـتابۆوە. ئێستا ئەو زانا بێپشووە هەستی دەکرد لە ســـتاگیرا تەنیاترە وەک لە هەر کاتێکی دیکەی ژیانی. ئیدی ئەرِیستۆتێلیسی سەروو پەنجا ساڵان، سیازدە ساڵ پاش مەرگی پلاتۆن، بریاری دا بگەرِێتەوە بۆ ئەسینای نیشتمانی کولتووریی. ئێستا کســـێنۆکراتێس بەرِێوەبەری ئەکادیمیا بوو. بێگومان کاتی گەرِانەوەی ئەرِیســـتۆتێلیس بۆ ئەسینا نەگونجاو نەبوو (٣٣٥): ئاخر ئەلێکســـاندەر کە ناوبانگە ژەنەراڵییەکەی گەیشـــتبووە رادەیەک کە بەســـەر هەر ناوبانگێکی پێش خۆیدا بدرەوشێتەوە، هێشتا هەر پشتیوانی بوو. ئەرِیستۆتێلیس لە باکوری خۆرهەڵاتی ئەســـینادا، لە نزیکی پیرۆزگەکەی (تێمپلەکەی) ئەپۆلۆنەوە، چەند بینایەکی بـــۆ وانەبێژی بەکرێ گرت. ئەم وانەبێژگەیە بە یەکێک لە ناوەکانی ئەپۆلۆنەوە (واتا لیکایۆس) ناو نـــرا لیکایۆن (هـــەر لەمەوە لیزیوم وەرگیراوە). لە رێرِەوەکانی گەرِاندا کە بە ســـێبەری درەختەکان فێنـــک داهاتبوون، پێریپاتێییـــەکان (گەرِەندەکان / هاتوچۆکەران) ئیدێکانـــی خۆیانیان ئاڵوگۆرِ دەکـــرد. بەم شـــێوەیە ئەکادیمیا هاڤرکێکەرێکـــی بۆ پەیدا بوو. ئەرِیســـتۆتێلیس بۆ ماوەی دوازدە ســـاڵ لە شـــوێنەوارێکدا خەریکی توێژینەوە و وانەبێژی بوو، کە بێگومان چیدی بۆ ئەو هێندە نوێ نەبـــوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا هیچی لە کەش و کاریگەرییە هۆشـــەکییەکەی بزر نەکردبوو. ئیدی لە کۆتایی ئەم کاتەدا ئیشـــێک سەریهەڵدا، کە رووبەرِووی ســـەدەکان، بەڵێ تەنانەت رووبەرِووی هەزارەکان وەســـتایەوە و دەیتوانی شان لە دیالۆگەکانی پلاتۆن بدات. ئەرِیستۆتێلیس پێشنیوەرِوان لەتەک فێرخوازە پێشـــکەوتووەکاندا لەسەر بناغەی نووسینە ئیزۆتێرییەکانی، واتا نووسینە ئاڵۆزە هزرییەکانی لە رووی زانستییەوە، کاری دەکرد، پاش نیوەرِوان لە تێکستە ئێکزۆتێرییەکانییەوە کە ئاسانتر شیاوی تێگەیشتن بوون، موحازەرەی لەبەردەم گوێگرانی زۆرتردا دەخوێندەوە. کۆمەڵەیەکی ژیان و زانســـت ئەوی بەســـت بە گوێگرانییەوە. زۆربەی جار لە ژەمەکانـــدا پێکەوە دەیانخوارد، بۆ ئەم پەیوەندییەش، وەک بۆ ســـەرجەم پێکەوەبوونەکان، ئەرِیســـتۆتێلیس گۆرِانی بە رێکخستنێک دابوو. ئەو وەک پلاتۆن هێندە رەفزکەر بەرانبەر موڵک نەدەوەســـتایەوە. ئەو بێگومان بە رەچەڵەک دەوڵەمەند بوو، هاوکات ئەلێکســـاندەر پشتیوانیی لێدەکرد، ئەم پشتیوانییەش تەنیا بریتی نەبوو لە ناردنی کەرەسەی پێویست بۆ پلانەکانی توێژینەوە. جگە لەمە ئەرِیستۆتێلیس لە تیۆرییەکەیدا، زۆرتـــر لە پلاتۆن، ســـامانە ماتەریالەکانی بـــەرز دەنرخاند و وەک پێشـــمەرجی ژیانێکی بەختیار دەیبینیـــن. ئەو هەروەها لایەنی کەم خاوەنی کتێبخانەیەکی مەزن بوو. هەتا ئەو کاتە کە ناوبانگی ئەلێکســـاندەر بەردەوام پەرەی دەسەند، ئەو پێویستی نەدەکرد لە ئەسینا لە هیچ شتێک بترسێت، بـــەڵام دوای ئەوە کە هەواڵی مەرگی کتوپرِی ئەو ژەنەراڵە مەزنە گەیشـــت، ئیتر مەســـەلەکە تەواو پێچەوانە بوو. ئەرِیستۆتێلیس بۆ هەندێک ئەسینایی غەریبێک بوو و هەر وەک ئەوەیش مابۆوە، ئەو دۆســـتێکی دوژمنەکانیان بوو، مەکدۆنییەک بوو، هەر بۆیە کینیان لێی دەبۆوە. ئینجا بۆ پاڵ ئەمە ئەرِیســـتۆتێلیس بە رەخنە توندەکانی نارِەزاییەکی زۆری بۆ خۆی خستبووەوە. بەم شێوەیە کاتێک

بە مەرگی ئەلێکساندەر پشتگیرییەکەیشی نەما، ئیتر ئەو خۆی لە بەردەم بەرەیەکی دوژمناندا بینییەوە، کە هێندەی نەخایاند تۆمەتێکیان بۆ بەرزکردنەوەی شکاتێک دۆزییەوە: ئەمیش، بە هەمان شێوەی سۆکرات پێش خۆی، تۆمەتی گومرایی بەرانبەر بە ئایین درایە پاڵی. دێمۆفیلۆس، کە لەلایەن هیرۆفانتەوە (کاهینی باڵا) بەناوی یۆریمێدۆن هاندرابوو، شکاتی ئەوەی لێکرد کە گوایە هێرمیاسی خوداییاندووە. کێشەکە ئەمە بوو: هێرمیاس لە لایەن فارسەکانەوە لەخاچ درا، پاشان ئەرِیستۆتێلیس لە هۆنراوەیەکدا ئەوی بە پاڵەوانە خوداوەندییەکانی پێشکات/ پێشمێژوو چواند. هیچ گومانی تێدا نییە کە تۆمەتی گومرایی بەرانبەر بە ئایین تەنانەت پەیوەست بە پێوەرەکانی ئەو سەردەمەوە دوور بوو لە راستییەوە. بەڵام ئەرِیستۆتێلیس هەستی کرد چ کین و دوژمنایەتییەک لە ئەسینا بەرەنگاری بوونەتەوە، بۆیە ئەو شارەی بەجێهێشت. ئەو گۆتی، نابێت جارێکی دی هەل بۆ ئەسینایییەکان برِەخسێنرێت لەدژی فەلسەفە بە تاوان هەستن. ئەوە بوو ئەرِیستۆتێلیس پاییزی ٣٢٣ پ.ن. رۆیشت بۆ کالکیسی سەر یۆبۆیا. لەوێ هاوینی ئاییندە، لە خانوویەکی گوندیانەدا کە موڵکی کەسانی دایکی بوو، مرد.

## 2-لە فەلسەفەوە بۆ زانست

«ئەوە ئەرِیستۆتێلیس بوو کە وەرچەرخانێکی ریشەیی لە مەزەنەوە رووەو توێژینەوەی ئەمپیری ئەنجام دا. ئەرِیستۆتێلیس فێرخوازەکانی بۆ توێژینەوەی نێوکۆیی پلاندار، بۆ کۆکردنەوە و پشکنینی کەرەسەکان پێگەیاند، بەم کارەش بوو بە دامەزرێنەری زانستی خۆرئاوایی، بە ئافرێنەری ئایدیێ رێکخراوی زانستی. لە سەرجەم بوارەکانی زانینی مرۆڤدا — ئەو تەنیا لە پزیشکی خۆی بەدوور گرت، هەرچەندە کورِی پزیشکێک بوو —کەرەسەیەکی لە رادە بەدەر زۆری بە یاریدەی فێرخوازەکانی کۆکردەوە و لایەنی کەم هەندێکیانی خستە فۆرمی نووسینە پوختکراوەکانییەوە. ١٥٨ دەستووری دەوڵەتی (لەنێو ئەم دەستوورانەدا «دەستووری ئەسینا» (Athenaion Politeia) بەناوبانگترینیانە کە لەسەر پاپیروسێک دۆزرایەوە و لە مۆزەخانەی بەریتانیدا پارێزراوە)، هەروەها لیستی تەواوی براوەی گەمەکانی دەلفی (پیتییاکان)، بەڵگەنامەی نمایشکردنە درامایییەکان لە ئەسینا، توێژینەوەگەل لە بواری فیزیک، کەشناسی، زۆلۆژی، رووەکناسی — ئەمانە و نووسینی دیکە بەڵگەن بۆ فراوانی و توانستی کاری هۆشە بێپشووە لێتوێژەرەوە و رێکخەر و نرخێنەرەکەی ئەو. ئەرِیستۆتێلیس لە توێژینەوەکانیدا رەچاوی کێشەکانی تیۆریی مەعریفە و ئێتیکی کرد، بەو رێیەشەوە ئەو لەسەر ترۆپکی ژیانی، لەنێو خۆیدا نزیکەی سەرجەم زانستەکانی کۆکردەوە: ئەو وەک توێژەرێکی یونیڤێرساڵ خۆی لە سەرەتای زانستی خۆرئاواییدا دەبینێتەوە کە پاش مەرگی خۆی بەسەر ژمارەیەکی زۆر کەرتە کایەدا دابەشی. زۆری خایاند، بەڵێ نزیکەی دوو هەزار ساڵ تێپەرِی، هەتا ئیتر بە لایبنیتس کەسێتییەکی ئاوها دەرکەوتوو و بەرِاستی یونیڤێرسێڵی هاوشێوەی ئەو بۆ خۆرئاوا سەریهەڵدا»[1].

## 3-دیالۆگەکان

لەو نۆزدە نووسینەی کە لە کاتی ژیانی ئەرپستۆتێلیس خۆیدا بڵاوکراونەتەوە، تەنیا فراگمێنت ماوەتەوە. ئەو سەرەتا لەسەر نموونەی پلاتۆن دیالۆگی دەنووسی، بەڵام بەشداریکەرانی گفتوگۆکانی نێــو ئەم دیالۆگانە هێندە خاوەنی (کەســایەتی) نەبوون. کاتێک پلاتۆن لــە دیالۆگەکانیدا رۆڵە رابەرییەکــەی بە ســۆکرات دابوو، ئەرپســتۆتێلیس لە دیالۆگەکانیدا خۆی ئــەو رۆڵەی وەردەگرت. دیالۆگەکانی ئەرپستۆتێلیس لە رووی ناوەرۆکەوە، بە هەمان شێوەی ئەوانەی پلاتۆن، تەنیا تەرخان نەکــراون بۆ بابەتی تایبەتی، بەڵکو بەنێو ســەرجەم یان زۆرینەی کێشــەکایەکانی فەلســەفەدا تێدەپەڕن. ئەو نووســینانە کە ســەر بە گرووپی دیالۆگەکانن، بریتین لە «یۆدێمۆس»، «لەبارەی فەلســەفە» و «لەبارەی دادپەروەری». بەڵام نووسینەکانی «پرۆترێپتیکۆس»، «لەبارەی چاکە / فەزیلە»، «لەبارەی ئیدێکان»، لە فۆرمی دیالۆگدا نەنووســراون. ئەرپستۆتێلیس لە «یۆدێمۆس»دا کە پێشکەشــی دۆســتێکی خۆی کردبوو و ساڵی٣٥٣ پ.ز. لە سیســلیا کوژرا بوو، لەتەک کێشەی نەمریی دەروونداا خەریکە. دیالۆگی «لەبارەی فەلســەفە» چ توخمی پلاتۆنی، چ رەخنە لە تیۆریی ئیدێکانی پلاتۆن و چ ســەرەتاگریی هزرییانەی خودی ئەرپســتۆتێلیس لــە خۆ دەگرێت. دیالۆگی «پرۆترێپتیکۆس» لەســەر ئەو ژانرەی نووسراوی فەلســەفی دەڕوات، کە ژانری داگیرسێنەرە و بۆ فەلســەفە ورەبەرزکەرەوەیە. دیالۆگە پلاتۆنییەکان هەروەها لەپاڵ بەشی ئێلێنکتی، دیالێکتیکی، دیداکتیکی، ئەفســانەیی و ناڕاتیڤدا، بەشــی پرۆترێپتی لە خۆ دەگــرن. دیالۆگی «یۆدێمۆس» ئاڕاســتەی تێمیســۆ کرا بوو کە میری کیپروس بوو. سیســەرۆ لەســەر نموونەی ئەرپستۆتێلیس دیالۆگەکەی خۆی بە ناوی «هۆرتێنسیوس» داڕشت، ئەم دیالۆگەش لە لایەنی خۆیەوە ئۆگوستینی باوکی کلێسەی بۆ ئەوە بزواند کە لە رەوانبێژییەوە بۆ فەلسەفە بپەڕێتەوە.

## 4- پراگماتەکان

پراگماتەکان، یان نوسیینە فێرکارییە پەخشانییەکان، گرنگترن لەو نووسینانەی کە ئەرپستۆتێلیس ســەرەتا لە فۆرمی دیالۆگدا دەینووســین. بەڵام ئەو ١٠٦ کتێبەی «کۆرپوس ئەرپســتۆتێلیکوم» (ســەرجەم بەرهەمی ئەرپســتۆتێلیس) تێکڕا دانراوی ئەو نین. جگە لەمە هەتــا ئەمڕۆ نەتوانراوە روون بکرێتــەوە، کــە کێ ئەم هەڵبژاردنەی ئەنجام دا، کەی و لەکــوێ و چۆن ئەمە رووی دا. ئەو میراتە زانســتییە کە ئەرپســتۆتێلیس پاش مەرگی خۆی بەجێیهێشــت، بە درێژایی ٢٥٠ ساڵ بزر بوو. بۆ یەکەم جار لە سەدەی یەکەمی پێش زایینیدا ئەندرۆنیکۆسی رۆدۆسی نووسینەکانی ئەوی لەو شــێوەیەدا کۆکردەوە، کە ئەمڕۆ لە بەردەســت ئێمەدان. لێرەدا دەشێت جیاوازی لە نێوان چوار گرووپی نووســیندا بکرێت: نوسینی زمانە فەلسەفەی، نووسینی فەلسەفەیی سروشتی، نووسینی فەلسەفەیی بەگشتی، واتا: مێتافیزیک یان یەکەم فەلسەفە، ئینجا لە کۆتاییدا نوسینە فەلسەفەییە کۆمەڵایەتییەکان، واتا: ئێتیک و پۆلیتیک.

راڤەکارانـــی ئەنتیکە زۆرینە و بەواتاترین نووســـینەکانی گرووپی یەکەمیان لەژێر ناونیشـــانی «ئۆرگانۆن»دا (ئامرازدا) داناوە. ئەو نووسینانەی سەر بەم گرووپەن، بریتین لە: 'کاتیگۆرییەکان'، «تۆپیک»، «هێرمینیۆتیک»، هەروەها هەردوو «ئانالیتیکەکان». دوو نوسینەکەی دی بە ناونیشانی «رێتۆریک» و «پۆئێتیک» سەر بە لۆگیک نین، بەڵکو سەر بە فەلسەفەی زمانن.

ئەو نووســـینانە کە سەر بە گرووپی دووەمن، بریتین لە «فیزیک»، لە نووسینە کۆسمۆلۆژی و بایۆلۆژی و پسیکۆلۆژییەکان کە ئەمانیش بریتین لە: «لەبارەی ئاسمان»، «لەبارەی دروستبوون و لەناوچوون»، «مێتەریۆلۆژی»، «ئاژەڵناسی»، «لەبارەی ئەندامەکانی لەشی ئەژەڵان»، «لەبارەی بزووتنـــی ئاژەڵ»، «لەبارەی زاووزێـــی ئاژەڵەکان»، «لەبـــارەی دەروون»، هەروەها کاری دیکەی بچووکی سروشتناسی کە روو دەکەنە دەرککردن، زاکیرە، نووستن و بێداری، خەون و راڤەی خەون، خایاندنی ژیان، گەنجێتی و پیرێتی، ژیان و مەرگ و هەناسەدان.

گرووپی سێیەم لە ریزێک ئیش پێکدێت، کە ناوی 'مێتافیزیک'ی لێنراوە. بەڵام گرووپی چوارەم لە ســـێ ئێتیکەکـــە پێکدێت: 'ئێتیکی نیکۆماخی'، 'ئێتیکی یۆدیمۆنـــی'، هەروەها 'ماگنا مۆرالیا'، پاشان لەپاڵ 'پۆلیتیک'دا نووسینی 'پۆلیتێیا'.

## 5- فەلسەفەی زمان

ئەریســـتۆتێلیس لە 'کاتیگۆرییەکان'دا کە نووسینێکی زمان فەلسەفەییە، جیاوازی لە نێوان دە تێگەی بناغەییـــدا دەکات: جەوهەر (Seiendheit)، چەندێتی، چۆنێتـــی، پەیوەندی (رێژە)، جێ، کات، دۆخ، هەبوون، کردن، خەم. زانینی نومای کاتیگۆرییەکان بەندە بە لێکۆڵینەوەی زمانەوە. لەلای ئەریســـتۆتێلیس، بە پێچەوانەی پلاتۆنەوە، رەهەندی ســـیمانتیکی-لۆگیکیانەی زمان سەربەخۆیی وەردەگرێـــت، جا گەرچـــی واز لە پەیوەســـتبوونە ئۆنتۆلۆژییەکـــەی زمان ناهێنێـــت. زمان لە لای ئەریستۆتێلیسیش وێنەی رووداوگە دەداتەوە.

گرنگترین کاتیگۆری بۆ ئەریســـتۆتێلیس بریتییە لە جەوهەر (Seiendheit). لایەنی هاوبەشـــی سەرجەم جەوهەرەکان ئەوەیە کە ئەوان لەنێو شتێکدا نین کە بناغەیانی پێکهێنابێت. سەبژێکتێک بریتی نییە لە ســـەبژێکتی ســـەبژێکتێک، بەڵکو ئەو ســـەبژێکتە خۆی بناغـــەی پەیوەندییە بۆ دەربڕراوێک. کاتێک لای پلاتۆن گشتێتی لە ریزی یەکەمدا هەیە، ئەوا ئەریستۆتێلیس بە پێچەوانەوە هەبوون (ئەکزیســـتێنس) بۆ تاکە بابەتەکان تەرخان دەکات. ئیدی لەمەوە، لە سەردەمی دوای ئەو خۆیدا، چییەتی و بوون، واتا ئێسێنســـیا و ئەکزیستێنســـیا، لە یەکتری جیاکرانەوە. جەوهەر لە رووی رێزمانەوە بریتییە لە ســـەبژێکت کە پرێدیکاتێک (هەڵگیراوێک / مەحمول) رووی تێدەکات، بەڵام ســـەبژێکت خۆی هەڵگیراو نییە. لە بنەڕەتدا لێرەدایە هۆی دابەشـــبوونەکە بەسەر سەبژێکت (hypokeímenon) و ئۆبژێکت (antikeímenon) دا، لێرەدایە هۆی سەرهەڵدانی لۆگیکی سەبژێکت-پرێدیکات، کە پاشـــان بۆ یەکەم جار بێرتراند رەســـل لە لۆگیکی رێژەکاندا فۆرمێکی نوێی بەرانبەر

دانا کە بریتییە لە فۆرمێکی ماتماتیکی و سیتەماتیزەکراو و بەرەوپێشبەری لۆگیکی.

ئەرِیستۆتێلیس دووەم جەوهەرەکانی لە یەکەم جەوهەرەکان جیاکردەوە. ئەو لەم دووەم جەوهەرانە مۆرکەکانی جۆر و رەگەز تێدەگەیشت، بەڵام ئەو لێرەدا وایدادەنا کە تێگەکانی جۆر نزیکترن لە یەکەم جەوهەرەکان. کەواتە لێرەدا بەرِوونی رەهەندەکە لە راڤەیەکی گشتی-تێگەییانەی رووداوەگەوە رووەو راڤەی کۆنکرێتی رووداوگە دیارە. لە هزری گریکیدا پەیوەندییەکی پێکەوەگونجاو لە نێوان هەقیقەت و زمان لە لایەک، زمان و تێگە لە لایەکی دیکە، هەیە، کە بێگومان پەیوەندییەکی وێنەدەرەوەیە نەک هاوشێوە. راستیی زمان، واتا لۆگۆسی زمان، بریتییە لە رووداوگە، هەروەها رووداوگەش کۆسمییە (گەردوونییە)، لۆگیکییە.

سۆکرات بە هونەرەکەی خۆی، واتا هونەری ئێلێنکتیک (دژبێژی)، سۆفیستەکانی ناجەخت کردبوو؛ پلاتۆن بە هونەرەکەی خۆی، واتا هونەری گفتوگۆ یان هونەری دیالێکتیک، دژبێژیی سۆفیستەکانی کرد؛ پاشان ئەرِیستۆتێلیس لەسەر ئەم رێگەیە رۆیشت، بەڵام ئەو لێرەوە بە ئەنالیتیک و لۆگیک گەیشت. ئەو لە نووسینی 'تۆپیک'دا شرۆڤەی برِیار (Urteil)ی ئەنجام دا و خستیە پاڵ شرۆڤەی تێگەکان کە لە نووسینی 'کاتیگۆرییەکان'دا ئەنجامی دابوو. ئەو پاشان لە نووسینی 'ئانالیتیکەکان'دا، بە یاریدەی پەرچاندنی قووڵی مێتۆدی، درێژەی بەم توێژینەوانە دا، ئەویش بەوە کە ئەو دەستی دایە شرۆڤەی پێکەوەلکاندنەکانی برِیار، لێرەشدا سیلۆگیزمی دۆزییەوە، واتا تیۆریی دەرئەنجاماندنی لۆگیکیی دۆزییەوە و ئینجا سیستەماتیزەی کرد. ئەو جگە لەمە زانیندنوماکەی خۆی سەبارەت بە سەلماندن (ی لۆگیکی) بینا کرد. مسۆگەرکردنی راستی بریتی بوو لە ئامانجە نێوکۆییەکەی سۆکرات و پلاتۆن و ئەرِیستۆتێلیس.

'تۆپیک'، کە تێیدا ئەرِیستۆتێلیس بەزۆریی لەتەک تێگە و پێناسەکاندا خەریکە، هەروەها توێژینەوە لۆگیکییەکانی دیکەی، لە توێژینەوەکانی نێو ئەکادیمییەوە سەریانهەڵدا. 'تۆپیکا' (skripta) بریتین لەو نووسینانە کە روو لە کایە تایبەتییەکانی بابەتەکان دەکەن (تۆپۆس واتا جێ / کایە)، یان روو دەکەنە کۆکردنەوەی نموونە وەک بناغەی دانانی تیۆری.

پاش روونکردنەوەی کاتیگۆری و برِیار، ئەرِیستۆتێلیس لە نووسینی 'لەبارەی دەربرِینی زمانییانە'دا (Peri hermeneías / De interpretatione) لەتەک جۆرەکانی دەربرِیندا خەریک دەبێت. ئەو لێرە درێژە بەو لێکۆڵینەوانە دەدات کە پلاتۆن لە دیالۆگەکانی 'کراتیلۆس'، 'تێئایتێتۆس' و 'سۆفیستێس'دا سەبارەت بە ناولێنان ئەنجامی دابوون، بەڵام ئەرِیستۆتێلیس لەم کارەیدا ناچێتە ریزی ناتورالیستەکانەوە، بەڵکو دەچێتە ریزی کۆنڤەنسیۆنالیستەکانەوە.

هەردوو نووسینەکەی 'ئانالیتیک' پێکەوە بریتین لە کرۆکی فەلسەفەی زمانی ئەرِیستۆتێلیس. ئەو، بە پێچەوانەی مێتۆدەکانی دیئێیرێزە و دیشۆتۆمی و دیالێکتیک لای پلاتۆن، دیارتر وشە بەرانبەر بە بابەت لە لایەک، هەروەها بەرانبەر بە واتا لە لایەکی دی، جیادەکاتەوە، هاوکات کار بە پیت و سیمبۆل دەکات، ئەمەش سەراپا بوو بە پاڵهێز بۆ ئەوە کە زمان لەپاڵ «ئۆنتۆلۆژی»دا سەربەخۆیی وەربگرێت. ئەرِیستۆتێلیس گرنگیی دەدا بە پابەندبوونی مۆرک بە تێگەوە. کاتێک ئەو تێگەکان

و زمانی لە بوونی ئیدیال جیاکردەوە، ئیتر بەم ڕێیەوە بە سەربەخۆییەکی مەزنتری هزر گەیشت. ئەو لەبریی واژە، سیمبۆلی (هێمای) بەکار هێنا، ئەو بەم ڕێیەوە بوو بە پاڵهێزێک بۆ برەودان بە فۆرمالیزەکردنی لۆگیک و پێکەوەلکاندنی ماتماتیک و زمان. ماتماتیکییەکان ئەو دەمەیش بە هێما کاریان دەکرد. مێتۆدەکەی ئەرِیستۆتێلیس، کە مێتۆدێکی شرۆڤەیی پێشڤەرۆ بوو، دەرفەتی ڕەخساند بۆ ئەوەی کە بەپوختی کایەکانی ڕوودانگە لە یەکتری جیابکرێنەوە، ئەمەش بێگومان باشتر لەوە کە بۆ پلاتۆن لوا. ئەرِیستۆتێلیس توانی لە 'ئانالیتیکەکان'دا بیسەلمێنێت کە زمان گونجاوە بۆ ئەوەی ببێت بە ئامرازی مەعریفەی زانستی. ڕەخنەی ئەرِیستۆتێلیس لە مێتۆدی «دیئێرێزیس»ی پلاتۆن ئەوە بوو، کە ئەم مێتۆدە ناتوانێت دەرفەت بۆ دەرئەنجامی چواندوو برەخسێنێت. ئەرِیستۆتێلیس سەرەنجامی تیۆریی سیلۆگیزمی لەم ڕستەیەدا کۆکردەوە: «لە دەرەنجامدا کە ئاخافتنێکە، وەک پێویست شتێکی جیاواز لە شتێکی گریمانەکراو دەکەوێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم شتە هەیە (dass diese ist)“. سیلۆگیزم خۆی گریمانەی ئەکسیۆم (پرنسیپ) دەکات. ئەم ئەکسیۆمانە بێ دەرەنجامن، بەڵکو بە شێوەیەکی ئیندوکتیڤ (epagogé) دەدۆزرێنەوە. کاتێک هەرەمی ئیدێکان لای پلاتۆن بوو بەهۆی سەرهەڵدانی تیۆریی دوو جیهان (charismós)، لێرەشدا ڕوودانگەی فەزاکاتی نرخاندنێکی نزمی وەرگرت، ئەوا ئەرِیستۆتێلیس بە پێچەوانەوە کێشی مەسەلەکە دەخاتە سەر ئەم ڕوودانگەیە و ئینجا بەرِێی پێکەوەلکاندنی لۆگیک و ئەزموونەوە بناغەیەک بۆ تێگەیشتنێکی ئەوتۆی ڕیالێتی دەرِێژێت، کە چیدی تەنیا تێگەیشتنێکی دیالێکتیکی نییە، بەڵکو تێگەیشتنێکی زانستییە. پاشان لە دووەم 'ئانالیتیک'دا، لەسەر بناغەی دەرئەنجاماندنی دیالێکتیکی و ئاپۆدیکتی، کە لە 'تۆپیک' و 'یەکەم ئانالیتیک'دا گۆڕان پێدرا بوون، تیۆریی سەلماندنی زانستی دێت کە بەکورتی جۆرێکە لە تیۆرییەکی زانست (Wissenschaftstheorie). ئەگەر ئەرِیستۆتێلیس لەو بڕوایەدا بەهەڵەدا چووبێت، کە گوایە سیلۆگیزم دەتوانێت لە ناسراوەوە مەعریفەی نوێ وەک دەرئەنجام بباتەوە، ئەوا ئەو سەربارى ئەمە هێشتا هەر توانیویەتی ڕۆڵێک بۆ ڕێکخستنی تێگەکان بگێرِێت.

ئەرِیستۆتێلیس چ دیالۆگ ('گریلۆس'، 'لەبارەی هۆنەران') و چ دارِشتنی پەخشانیانەی (پراگماتی) سەبارەت بە ڕەوانبێژی و پۆئێتیک نووسیوە. بەڵام زۆرینەی نووسینەکانی ئەو سەبارەت بەم بوارە دەگەرِێتەوە بۆ دوایەمین قۆناغی دیراسەکەی ئەو لە ئەکادیمیا. نووسینی 'ڕێتۆریک' سیمای پێکهێنانێکی ڕێکخراوی پێوە دیارە و بۆ بڵاوکردنەوە دەگونجێت، بەڵام بە پێچەوانەوە نووسینی 'پۆئێتیک' (لەبارەی هونەری هۆنینەوە) لە فۆرمە بەردەستییەکەی ئەمرِۆیدا زۆر نابەجۆریی دەنوێنێت. لۆگیک و زانست لە ڕوانگەی ئەرِیستۆتێلیس مەعریفەی تەواو، بەڵام دیالێکتیک و ڕێتۆریک (ڕەوانبێژی) بە پێچەوانەوە مەعریفەی ناتەواو دەخەنەوە. هەر بۆیە مرۆڤ لەسەر شێوازێکی تایبەتی دەتوانێت سەرجەم مرۆڤانی هزرڤان ناو بنێت ڕەوانبێژ و دیالێکتیکی، بەڵام ئەوان سەرباری ئەمە هێشتا هەر نابن بە زانا. ڕەوانبێژی بۆ ئەرِیستۆتێلیس زانست نییە، بەڵکو تەکنیکە، جا گەرچی هەندێک بەشی ڕەوانبێژی، وەک بۆ نموونە دەرکێشانی دەرئەنجامی

ناتەواو (ئێنتیمێم) یان دەرئەنجامی ڕەنگەیەتی، لە شێوازی پەیڤینی زانستی نزیک دەکەونەوە. ئەمانە بەشە لۆگیکییەکەی ڕەوانبێژین. ئەریستۆتێلیس لە نووسینی 'ڕێتۆریک'دا هۆشیارییەکی تایبەتی بۆ سۆزەکان (ئافێکتەکان) تەرخان دەکات. ئەم خەریکبوونەی ئەو بە سۆزەکانەوە وای کرد کە چیدی پێویست نەبێت ئەو خۆی سەرلەنوێ لە پسیکۆلۆژییەکەیدا بە هەمان کێشەوە خەریک بکاتەوە. بێگومان بردنەوەی کەرتە مەعریفە لە کایەی ڕەوانبێژییەوە واتای بۆ «ئێتیک»یش هەیە. لە نووسینی 'ڕێتۆریک'دا نزیکەی سەرجەم ئەو ڕەوشتانە دەردەکەون، کە هاوکات لە نووسینی 'ئێتیک'دا هەن: دادپەروەری، دلێری، ڕەزامەندی، جوامێری، شەهامەت، بەخشندەیی، نەرمی، زیرەکی، دانایی، تەنانەت بەختیاریش. ڕەوانبێژی، بە پێچەوانەی لۆگیک، فەزل بە لێچواندن و نموونە و وێنە دەدات. جۆرە جیاوازەکانی ڕەوانبێژی بریتین لە ڕەوانبێژیی ئامۆژگاریکەر و دادگایی و ئاهەنگی (...). بێژتنی ئامۆژگاریکەر ڕوو دەکاتە پرسیارە سیاسییەکان، بێژتنی دادگایی ڕوو دەکاتە ماف و ناماف، بێژتنی ئاهەنگی ڕوو دەکاتە ستایش و لۆمە. ئەم جۆرەی بێژتن بەزۆریی هەڵچواندن یان پەرەپێدانی هونەریانەی دەربڕینەکە (ئامپلیفیکاسیۆن) بەکاردەهێنێت، بێژتنی دادگایی، سەلماندن یان دەرکێشانی دەرئەنجامی ناتەواو (Enthymem) بەگەڕدەخات، بەڵام بێژتنی ئامۆژگاریکەر، نموونە یان پارادیگما بەکاردەهێنێت. هەموو ئەم ژانرانە دەپرسن: ئایا چی دەشێت؟ ئایا چی ڕوویداوە؟ ئایا چی بەهادارترە؟ تیۆریی هونەری بێژتن لە سەلماندن و شێوازی بێژتن و بینای بێژتن دەکۆڵێتەوە. زمانی بێژەر جیاوازە لە زمانی هۆنەر: گەرەکە زمانێکی گونجاو بێت و ڕێگەیەک لە نێوان بێخشڵی و وشەڕازاندنەوەدا بگرێتە بەر. هونەری بێژتن چوار بەشی سەرەکیی هەیە: نەخشەی یان پلانی بابەت (ئێکسپۆزیسیۆن)، داڕشتنی حاڵەتەکە، سەلماندن و پوختاندن. بەڵام ئەوەی ئەریستۆتێلیس بەدەستییەوە دەدات، کەمتر پەرتووکێکی فێرکارییە بۆ بەکارهێنانی پراکتیکییانە لە لایەن بێژەرەوە، بەڵکو پتر تیۆریی هونەری بێژتنە. ئەریستۆتێلیس، بە پێچەوانەی دەروازە پراکتیکییەکانی ڕەوانبێژییەوە کە لە ئەنتیکەدا زۆر بڵاوبووبوونەوە، هیچ گرنگییەکی بە داڕشتنی ڕەوانبێژی نەدا، بەڵام تیۆرییەکەی ئەو سەبارەت بە هونەری هۆنینەوە جیاواز بوو.

هونەر چ بۆ ئەریستۆتێلیس و چ بۆ پلاتۆن بریتی بوو لە لاسایی (میمێزیس)، بەڵام هەر یەک لەم دوو هزرڤانە نرخاندنێکی جیاوازیان بۆ داڕشتنی میمێزیانە هەبوو. بۆ پلاتۆن جیهانی فەزاکاتی بریتی بوو لە دەروێنەی جیهانی ئیدێکان، جیهانی هونەریش تەنیا دەروێنەی جیهانی فەزاکاتی بوو، کەواتە دەروێنەی دەروێنە بوو. ئەم نرخاندنە واتای هونەرەکانی زۆر کەم کردەوە. بەڵام ئەریستۆتێلیس توخنی بەها خۆییەکەی جیهانی هونەر نەکەوت، ئەم کەمتر هونەرمەندی وەک پەروەردکار دەبینی. هونەرمەند بۆ ئەریستۆتێلیس بریتی بوو لە داڕێژەری ڕوودانگە (ئەکتوالێتی). هونەرمەند، بە هەمان شێوەی زانا، ئەو ڕوودانگەیە شرۆڤە دەکات، بەڵام پاشان، بە پێچەوانەی زاناوە، پێکییەوە دەلکێنێت و دەیکات بە سەرجەمێک. ئێمە تەنیا لەم تێڕوانینەوە دەتوانین لە ڕستە ناسراوەکەی ئەریستۆتێلیس تێبگەین، کە دەڵێت، لەبەر ئەوەی هونەر لەتەک گشتێتیدا خەریکە، ئەوا لە مێژوونووسین فەلسەفەییترە. ئەریستۆتێلیس کۆمیدیا و هۆنراوە، هونەری فلووت

و ژەنیدنی زیتەر، لە هۆنینەوەی ئێپیکی و تراژیدیانە جیادەکاتەوە. سەرجەمی ئەم ژانرانە لایەنێکی هاوبەشـیان هەیە کە لاساییە، بەڵام لە دەسوێژ و بابەت و جۆری لاساییدا لە یەکتری جیادەبنەوە: لەم لاسـاییەدا ریتم و وشـە و هارمۆنی یان بەجیا یان پێکەوە بەکاردەهێنرێن. لەبەر ئەوەی لاسایی تەنیا لاسـایی کرداری چاک یان خراپە، ئەوا لە هونەردا جیاوازییەکانیش سەرهەڵدەدەن. کارەکتەرە داڕێژراوەکان چاکترن یان خراپترن لە مرۆڤانی ریال یان هاوشێوەیانن: پۆلیگنۆت فیگورەکانی خۆی جوانتر دادەڕشـت، پاوسۆن ناشرینتر لە خودی خۆیان دایدەڕشـتن، بەڵام دیۆنیسیۆس هاوشێوەی خودی خۆیان دایدەڕشـتن. هەروەها کارەکتەری چاکتر و خراپتر لە کۆمیدیا و تراژیدیاشـدا هەن. لایەنە هاوبەشـەکەی ئێپۆس (داستان) و تراژیدیا ئەوەیە کە هەردووکیان لاسایی کارەکتەری مەزن دەکەنـەوە، بەڵام لە کێشـی بەیتەکاندا، لە جۆری داڕشـتندا، واتا گێڕانـەوەی چیرۆک لە لایەک و کردار لە لایەکی دی، هەروەها لە خایاندندا، جیاوازن لە یەکتری. ئێپۆس داڕشـتنەکە بە نموونەی کەسـی خۆ یان کەسـێکی دیکە ئەنجـام دەدات، بەڵام هۆنـراوە بە دەربڕینی خۆیـی و دراما بە کرداری خۆیی داڕشتنەکە ئەنجام دەدەن. بەگشتی پێناسەی تراژیدیا لەلای ئەرپستۆتێلیس یەکێکە لەو تێکسـتانە کە بەناوبانگترینـن و زۆرترین راڤە کراون: «کەواتە تراژیدیا بریتییە لە لاسـایی کردارێـک کە ناوەرۆکێکی بەواتـا و رەوتێکی تەواو کۆتاییهاتوو و قەوارەیەکـی دیاریکراوی هەیە، ئینجـا بە زمانێکی هونەریانە جوانکراو داڕێژراوە و هەر یەکەی دەسـوێژە جوانکەرەکانی ئەو زمانە لە بەشە جیاوازەکانی تراژیدیادا بەگەڕ دەخرێن؛ هەروەها کەسانی کردارنوێن لە هەنووکەدا نمایشی دەکـەن نەک وەک چیرۆک بگێڕرێتەوە؛ هەروەها، لە کۆتاییدا، بەرێی بەزەیی و ترسـەوە چاپێدراوە شـئورییەکان خاودەکاتەوە. من 'زمانی هونەریانە جوانکراو' ناو دەنێم زمانێک کە ریتم و هارمۆنی و گۆرانی لە خۆ دەگرێت، من هەروەها لە 'بەکارهێنانی جیای هەر شێوازێکی تایبەتیی داڕشتن' ئەمە تێدەگـەم: هەندێک بـەش تەنیا بە بەیت رادەگەیەنرێن، بەڵام بە پێچەوانەوە بۆ داڕشـتنی تەواوی بەشەکانی دیکە گۆرانی پێویستە»[٢].

تێگەیشـتنی ئەوە ئاسـانە کە پێویستە قەوارەی تراژیدیا سـەرجەمێکی سنووردار بێت، بەڵام تێگەیشتن لەو پرسیارە زەحمەتترە، کە داخۆ دەبێت مەبەستی ئەرپستۆتێلیس لە ترسان و بەزەیی و پاکژبوونەوە (خاوبوونەوە — و) چی بێت و داخۆ بە چ شێوەیەک ئەم فاکتەرانە پێکەوەبەسترابن. مەبەسـتی ئەرپیسـتۆتێلیس ئازادکردنی مرۆڤە لە هەسـتگەلی ئەوتۆ کە بە ترس و ناچارکردن، بە موئانات و ناکۆکیی ناخەکی، ئارامیان لێبڕیوە. ئەرپستۆتێلیس لە رووی هەژاندنی ناخەوە شێوەیەکی یەکگرتنـەوە لە نێوان کەسـە داڕێـژراوەکان (پاڵەوانەکان) و ئەکتـەران و لێڕوانەراندا دەهێنرێتە گۆڕێ. ئەو پاڵەوانە کە لێڕوانەر لەتەکیدا یەکدەگرێتەوە (ئیدێنتیفیکاسـیۆن دەکات- و)، رێگەکە بەرەو خودئازادکردن دەبات، لێرەشدا کاتارزیس، لەپاڵ تەوەرە ئێستێتیکییەکەدا، هەروەها تەوەرەی پسـیکۆلۆژیانە و ئێتیکی و پزیشـکی لە خۆ دەگرێت. بەم پێیە تراژیدیا دەتوانێت بەوە بگات کە دانا بەرێی خودناسین، یۆگین بەرێی مێدیتاسیۆن (رامان) و کەسی پیرۆز بەرێی قوربانیدانەوە بە خودی خۆی، هەوڵ دەدەن پێیبگەن. ئامانجی هاوبەشی هەموویان بریتییە لە گەیشتن بە دۆخێکی

باڵاتر، بە خەڵاسی (رزگاربوونی) خۆیی لە مەغزای خودئازادکردندا.

بەگشـــتی لە درامادا (لە 'دران'ـەوە وەرگیراوە و واتای کردن یان کردار دەگەیەنێت) ســێ فاکتەر کاران: کردار (پراکســـیس)، داستان (میتۆس، پلۆت)، کارەکتەر (ئێتۆس). لە داستانەوە کەرەسەی کردارەکە دەکەوێتەوە، داســـتان بریتییە لە «دەروونی تراژیدیا». کارەکتەر لە کرداردا، لە رەفتاردا، لە قەراردانـــدا، دەردەکەوێت. کردار بەبێ وەرچەرخانێکی کتوپڕی قەدەریی (péropéteia) یان بەبێ ناســـینەوە (anagnorismós) کردارێکی سادەیە، بەڵام کردارەکە بە پێچەوانەوە لەتەک یەکێکی ئەم پێکهاتانەدا یان لەتەک هەردووکیاندا، کردارێکی ئاڵۆزە. چاکترین ناسینەوە لە روانگەی ئەرِیستۆتێلیس ئەوەیە کە بە وەرچەرخانێکی کتوپڕی قەدەرییەوە بەســـتراوە. پرۆلۆگ بە پێش هاتنەناوەوەی کۆردا رادەبوورێـــت. ئێپایزۆدۆن خۆی لە نێوان گۆرانییەکانی کۆردا دەبینێتەوە. کۆتایی (exodos) ناوی ئەو بەشـــەی تراژیدیایـــە کە بەدوویدا هیچ گۆرانییەکی کۆر نایەت. تراژیدیای کلاســـیکیی گریکی، وەک بـــاو بـــوو، لە پێنج بەش پێکهاتبوو. تراژیدیایەکی چاک نـــە دەهێڵێت مرۆڤێکی چاک بخزێتە نێـــو بەدبەختییەوە (ئاخر ئەمە نە بەزەیی و نە ســـڵەمینەوە، بەڵکو تووڕەبوون دەبزوێنێت) و نە دەهێڵێت مرۆڤێکی بەد بەرەو بەختەوەری هەڵزنێت (ئاخر ئەمە بە هیچ شـــێوەیەک تراژیدی نییە). بە پێچەوانەوە پاڵەوانی تراژیدی خۆی لە نێوان رەوشت و بەدێتیی تەواودا دەبینێتەوە. ئەو هەڵەیەک (hamartía) دەکات کە ســـەرەنجامی کارەســـاتاویی لێدەکەوێتەوە، لێرەشدا دۆخی کەسی تێوەگلاو چەند چاکتر بووبێت، وەرچەرخانەکەی بەختیش ئەوەندە گەورەتر دەبێت.

هۆمێر بۆ ئەرِیستۆتێلیس نەک تەنیا نموونەی هۆنەرە بەرەهایی، بەڵکو لە مەغزایەکی فراوانتردا هۆنەرێکی تراژیدیشە، چونکە ئەو تاکە هۆنەرێکە کە خاوەنی سەرجەم ئەو چۆنێتییانەیە کە هۆنەری کامیل پێکدەهێنن. ئەرِیستۆتێلیس بە شرۆڤەی هونەری هۆنینەوە (پۆئێزی) و ستایشکردنی هۆمێر پەیوەندییەک بە سەرەتاکانی هونەری وشەی گریکییەوە دەهێنێتە گۆڕێ. لە کۆتاییدا ئەو سەبارەت بە کرۆکی هۆنەرێتی لێدەهزرێت و ئەم لێهزرینەشی لەسەر باڵاترین ئاست ئەنجام دەدات.

## 6- فەلسەفەی سروشت

چەنـــد ســـاڵێکی درێژخایەن ئەرِیســـتۆتێلیس خۆی لە ئەکادیمیاکەی پلاتۆندا بە کێشـــە زمانییەکانەوە خەریک کرد، بەدووی ئەم کاتەشـــدا وەرچەرخانی ئەو رووەو فەلســـەفەی سروشـــت نزیککەوتەوە. گەرچی ئەرِیســـتۆتێلیس هەمان ئەو سەروەرییەی بەسەر فەلسەفەی ئیۆنییدا نەبوو کە بەسەر فەلەسەفەی تێگەیی ئەسینایدا هەیبوو، بەڵام ئەو سەرباری ئەمە گۆڕانی بە سەنتێرێک دا لە نێوان فەلســـەفەی تێگەیی ئەســـینایی و فەلســـەفەی سروشـــتی ئیۆنییدا. هەروەها: گەرچی ئەرِیستۆتێلیس گۆڕانی بە فیزیک دا وەک دیسپلینێکی فەلسەفەیی سەربەخۆ، بەڵام سەرباری ئەمە هێزی ئەو لە بواری توێژینەوەی دیاردە نائۆرگانییەکاندا نەبوو، بەڵکو ئەو کە لە ماڵی پزیشکێکدا پێگەیشـــتوو، پتر مەیلی بۆ سروشـــتی زیندوو، واتا بۆ بیۆلۆژی و پســـیکۆلۆژی، هەبوو. زاســـتی

سروشـــتیی نوێســـەردەمی ئەوروپی هەتا رادەیەکی زۆر بۆری تێڕوانینەکانی ئەرپستۆتێلیســـی لە کایەی فیزیکدا داوەتەوە، بۆیە پێویست ناکات لێرەدا روو بکەینە هەموو لایەنەکانی فیزیکەکەی ئەو. فیزیک بۆ ئەرپیســـتۆتێلیس پتر زانستی پرنسیپەکان بوو نەک زانستی فاکتەکان. ئەو لە تێگەکانی فەزا و کات، بزووتن و دۆخگۆڕی، بێســـنووری و بەردەوامی، کۆڵییەوە نەک لە خودی فێنۆمێنەکان. هەر بۆیە فیزیکی ئەرپیســـتۆتێلیس تەنیا پێی دەکرێت کێشـــە فیزیکییەکان بەگشتی پیشان بدات بەبێ ئەوەی بتوانێت چارەســـەریان بکات. ئەمەش ئەو هەقە بوو کە ئەرپیســـتۆتێلیس دەبوو بەهۆی وەرگرتنی فەلســـەفەی تێگەیی ئەســـیناییەوە بیدات: بەهۆی پلاتۆنیزمەکـــەی خودی ئەو خۆیەوە. هەندێک تێڕوانین وەک روون و ئاشـــکرا (ئێڤیدێنت) دەردەکەون، بۆ نموونە: ئەرپیســـتۆتێلیس کات وەک ژمارەی بزووتن پێناســـە دەکات و پەیوەندیی دووســـەریی نێوان کات و بزووتن دیاری دەکات: کات بەرێی شـــیمانەی پێوانی بزووتنەوە، بزووتنیش بەرێی شیمانەی پێوانی کاتەوە سەرهەڵدەدات و هتد. ئەرپیســـتۆتێلیس بەگشـــتی لە فیزیکدا، واتا لە کۆسمۆلۆژی و کۆســـمۆگۆنیدا، ناگاتەوە بە تێڕوانینەکانی پلاتۆن و پیتاگۆرییەکان و فەیلەسوفە سروشتییەکانی ئیۆنیا.

بەڵام ئەرپیســـتۆتێلیس لە کایەکانی بیۆلۆژی و پســـیکۆلۆژیدا لەوان شـــارەزاتر بوو. دیاریکردنە تێگەییە روونەکانی دەرفەتیان بۆ رەخساند، بەپوختی بیناى پلەئاسای سروشت هەڵبەستێت، لەم کارەشدا لە فێنۆمێنە نائۆرگانییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئینجا روو دەکاتە رووەک و ئاژەڵ، هەتا پاشـــان بە زیندەوەرە زیرەکەکان و فێنۆمێنی هۆش دەگات. ئەم تیۆرییەی ئەرپیستۆتێلیس تەنانەت لە سەدەی بیستەمدا هێشتا هەر لایەنگر و گۆڕانپێدەری دۆزییەوە.

نووسینەکەی ئەرپیستۆتێلیس بەناونیشانی 'لەبارەی دەروون' یەکێکە لەو تێکستە فەلسەفییانە کە بەگشـــتی زۆرترین کۆمێنتار و راڤەیان لەســـەر نووسراوە. بەتایبەتی پیشـــاندانی کێشەکە لە دەروازەی نووســـینەکەدا ئاستێکی بەرزی زانستی-تیۆرییانە پیشان دەدات و نموونەییە بۆ مێتۆدە ئاپۆرێتییەکەی ئەرپیســـتۆتێلیس، واتا ئەو مێتۆدە کە بەرێی پرســـیارکردنی گونجاوەوە چارەسەری کێشەکان ئاسان دەکات. ئەرپیستۆتێلیس دوای لێکۆڵینەوەیەکی پوختی بۆچوونەکانی زانایانی پێش خۆی، واتا دوای ئەو کارە کە بە رەخنەی دۆکســـا (بۆچوون) ناســـراوە، لە ســـەرەتای دووەم بەشدا پێناسەی دەروون دەکات: دەروون بریتییە لە «یەکەم ئێنتەلەشیی لەشێکی سروشتی، (لەشێکی) ئامرازئاســـا» (B 5 F 412.). تێگەی ئێنتەلەشـــی مێژوویەکی خۆیی هەیـــە. گوێتە ئەم تێگەیەی وەرگـــرت و گۆڕانی تێدا کرد، هەروەها هانز دریش بۆ مەبەســـتی بەکارهێنـــان لە بیۆلۆژیدا گۆڕانی تێدا کرد. تێگەی ئێنتەلەشـــی لەلای ئەرپیســـتۆتێلیس هەبوویی / ئووســـیا (ousía/ Seiendheit) و فـــۆرم (Eidos) لە خۆ دەگرێت. پەیوەندیی دەروون بە لەشـــەوە هاوشـــێوەی پەیوەندیی فۆرمە بە کەرەســـەوە. دەروون خۆیشـــی جەوهەرە (سوبستانسە). ئەرپیســـتۆتێلیس دەیەوێت بە تێگەی «ئامرازئاسا» پیشانی بدات کە دەروون بونیادێکی ئۆرگانیی هەیە، کەواتە مەبەستی ئەو رووداکاتە کێشـــە دێرینەکەی هۆمێر: دەروون یەکســـانە بە ژیان. دەروون لە روانگەی ئەرپیســـتۆتێلیس، بە پێچەوانـــەی تێڕوانینـــی پلاتۆنـــەوە بۆ دەروون، بە هەمان شـــێوەی لەش بمرە، هـــۆی ئەمەش بە

تێگەیشـــتنی ئەو لەوەدایە کە دەروون کرۆکی فونکســـیۆنەکانی (کاراییەکانی) ژیانە، واتا کرۆکی فونکســـیۆنەکانی مەئریفە و بزووتنە. لەش سروشـــتییە، چونکە بەشێکە لە سروشت. گەر مرۆڤ بە شـــێوەیەکی زمانییانە شرۆڤەی تێگەی ئێنتەلەشـــی بکات، بەڵام لەم کارەیدا پابەندبوونی خۆی بە روودانگەوە بزر نەکات، ئەوا ئەو تێگەیە برێکی زۆر لە درەوشـــە میســـتیکییەکەی دەدۆڕێنێت. ئێنتەلەشـــی لە پرنســـیپدا کۆتایی هەیە. بەم پێیە ئەرِیستۆتێلیس بە یاریدەی پیتاندن یان بەرِیی زایین و مەرگەوە، جیاوازییەک دادەنێت: پرۆسە سروشتییەکان کە سنوورێکی کاتەکییان هەیە، لەو پرۆسە نائۆرگانیانە جیادەکاتەوە کە سنوورێکی دەرەکییان هەیە. رووبارێک، بەربوونەوەی بەردێک، هەرەســـێکی بەفر، بە هەمان شـــێوە پرۆسەن بە ســـەرەتایەک و کۆتاییەکەوە، بەڵام ئەمانە بەرِیی دۆخگەلی دەرەکییەوە ســـنووریان بۆ دانراوە، پرنســـیپی بەردەوامیی یـــان پرۆگرامی گۆڕانی ئەمان لەنێو خۆیاندا نییە. پێناســـەی دەروون لەلای ئەرِیســـتۆتێلیس لە چەند روویەکەوە تایبەتمەندی وەردەگرێت و ئەو رووانە بریتین لە: پێکەوەبەســـتنی پرۆســـە دەروونی و جەســـتەییەکان، تێگەی روون کە لە بەکارهێنانی جووتە کاتیگۆرییە ئەرِیستۆتێلییەکانی فۆرم-کەرەسە و روودانگە-شیمانە (ئەکتوالێتی / پۆتێنســـیالێتی) وەک سەرەنجام دەکەوێتەوە، هەروەها بەکارهێنانی تێگەی جەوهەر (سوبســـتانس)، ئینجا پوختکردنەوە و جیاکردنەوەی تێگـــەی دەروون لە کاتیگۆرییەکانی دیکەی فەلســـەفەی سروشت، ئەمەش بە یاریدەی واژەی ئامرازیانەی / زانستیانەی (terminus technicus) ئێنتەلەشـــییەوە ئەنجام دەدات، هەروەها بناغەرِشتنی تێڕوانینی ئۆرگانیانەی یان ئۆرگانۆلۆژیانەی سروشـــت کە پێوەی بەچڕی تێڕوانینی تێلیۆلۆژی لکاوە و بابە راستەقینەکەشی کەسی دیکە نییە جگە لە خودی ئەرِیستۆتێلیس.

بەڵام دارِشـــتنە کورتەکانی ئەرِیســـتۆتێلیس ســـەبارەت بە نـــووس (nous = هۆش، ئاوەز، ئینتەلیگێنس) کە لە ســـێیەم بەشی نووســـینی 'لەبارەی دەروون'دا ئەنجامیان دەدات، حاڵەتێکی شـــازن لەنێو ئەم کۆنسەپســـیۆنە داخراوەی دەرووندا. ئێمە دەبێت جارێـــک کەرتمەندانە (کەرتی جیـــاوازی دەروون) و جارێـــک رەهەندیانە (توێـــژەکان) دەروون وەربگرین. مەســـەلەکە لە رووی مێژووییەوە هەوڵێکە بۆ ئەوە کە ئەو تێگەیەی ئەناکساگۆراس بۆ هۆش هەیەتی، پتر هۆشەکێتیی پێببدرێت، پاشـــان مەســـەلەکە روو دەکاتە پاراستنی ئەو روانگە کەســـییەی دەروون کە زۆر جار پلاتۆن جەختی لێکردبوو و پێوەی بەچڕی تیۆریی دەروونی نەمر پابەندە. ئەرِیستۆتێلیس لێرەدا، وەک چـــۆن لـــە زۆر کایەی دیکەدا، بـــۆ میانەرێیەک دەگەڕا. ئەو جیاوازیی کـــرد لە نێوان دوو جۆر ئاوەزدا: ئاوەزێکی بمری پاسیڤ کە بەشێکی دەروون (ی بمرە)، هەروەها ئاوەزێکی نەمری چالاک، واتا ئاوەزی ئافرێنەر (nous poietikós) یان هۆشی ئافرێنەر. ئەم تێگەیە دەمان بات بۆ نێو تێگەی «مێتافیزیک»ی ئەرِیســـتۆتێلیس. بێگومان ئێمە نابێت لـــەم مێتافیزیکە ئاوها تێبگەین هەروەک بە فەلسەفەی سروشتی ئەرِیســـتۆتێلیس نەگونجاو بێت. بەڵام دابەشبوونی هۆش بەسەر بەشێکی بمر و بەشـــێکی نەمردا پرکێشـــەیە و لەنێو مێژووی مێتافیزیکی خۆرئاوادا بوو بە بارێکی بێچارە، جگە لەمە تەنانەت خودی ئەرِیســـتۆتێلیس لە نووســـینەکانی دیکەیدا تەنیا لە شـــێوەی ئاماژەدا

لێیدەدوێت. جگە لەمە تەنانەت تێگەی ئەڕیستۆتێلیانەی خودا ناتوانێت پتر روون و ئاشکرایی بە تیۆریی نووسی نەمر بدات، چونکە ئەڕیستۆتێلیس بۆ سەلماندنی ئەکزیستێنسی خودا لە پرێمیسی ناجەختەوە دەردەچێت، وەک بۆ نموونە بنەماکانی لێوەدەرچوون بریتین لە نەشیاویی پرۆسە دوایەکییەکان، یان ناچاربوونی خودی ئەڕیستۆتێلیس بۆ ئەوە کە رێ لە رۆچوونێک بۆ نێو بێدوایەکێتی (ئینفینیتوم) بگرێت.

جیاکارییەکی دیکەی ئەڕیستۆتێلیس کە روو لە کایەکانی بابەت دەکات، پتر بەردەوامی لە مێژوودا وەردەگرێت: جیاوازیی نێوان ئاوەزی تیۆرییانە (nous theoretikós)، ئاوەزی ئافرێنەر (nous poietikós) و ئاوەزی پراکتیکی (nous praktikós). ئاوەزی ئافرێنەر بەگوێرەی ناوەکەی یەکانگیرە بە هۆشی نەمر. دانانی هۆش لەتەک شێوە بناغەییەکانی دەستگرتن بەسەر جیهاندا، وەک بۆ نموونە ناسین، دروستکردن، کردارنواندن، بۆ مێژووی فەلسەفە زۆر بەبەرهەمتر بوو وەک لەو دووبەشکردنە ناجەختەی هۆش بەسەر ئاوەزێکی بمر و ئاوەزێکی نەمردا.

هەروەها، لە رووی تیۆریی مەئریفەوە، هاوتادانانی ناسەر و ناسراو لەنێو ئەکتی ناسیندا (energia)، زۆر رۆشن بوو. بەڵام ئەڕیستۆتێلیس ئەو پرسیارانە بەکراوەیی دەهێڵێتەوە، کە داخۆ ناسەر چی بێت یان داخۆ ناسراو چی بێت. ئەوە کانت بوو کە لەم جێیەوە درێژەی بە شرۆڤەی ئەو فاکتەرانە دا کە لە پرۆسەی مەئریفەدا بەشدارن، بێگومان بەبێ ئەوەی بە سەرەنجامێکی جیاواز لەوەی ئەڕیستۆتێلیس بگات.

## 7- یەکەم فەلسەفە

ئەڕیستۆتێلیس چ لە کایەی فەلسەفەی زمان و چ لە کایەی فەلسەفەی سروشتدا بە شێوەیەکی شرۆڤەیی هەنگاوی نا تاکو بە تێگەگەلی بنەمایی تایبەتی یان بە کاتیگۆریی تایبەتی بگات. بەڵام سروشت و زمان پێکهاتەی رووداوگەیەکن. ئەڕیستۆتێلیس هەرگیز ئەو زانا مەزنە نەدەبوو گەر سەرەنجامەکانی پەسند بکردایە و درێژەی بە شرۆڤەکانی نەدایە، تاکو بە تێگەی گشتیتر بگات، یان بەو گشتیترین تێگانە بگات کە بابەتی فەلسەفەیەکن لە پێش فەلسەفەی سروشت و زمانەوە، واتا بگات بە فەلسەفەیەکی فەلسەفەکان یان بە یەکەمین فەلسەفەیەک (پریما فیلۆسۆفییا) — وەک چۆن ئەو خۆی ناوی نابوو. ئەم فەلسەفەیە درەنگتر ناوی مێتافیزیکی لێ نرا کە ناوێکی ناڕۆشن و هەڵەبەرە و بۆ ماوەیەک وەک رێبازێکی هزریی نهێنی دەبینرا، کە بێگومان هەڵوێستێکی نادروست بوو. ئەم فەلسەفەیە لە بنەڕەتدا بریتییە لە فەلسەفەی رووداوگە، فەلسەفەی بوونی بوون، وەک ئەمەش چ شرۆڤەی کاتیگۆریالە و چ شرۆڤەی فاکتەرەکانی رووداوگەیە، چونکە شرۆڤەی زمان (لۆگیک) و شرۆڤەی سروشت (فیزیک) لە بنەڕەتدا تەنیا دوو لایەنی زانستێکن کە هەنگاوی قووڵتر دەنێت. چۆن ناسەر و ناسراو لەنێو ئەکتی ناسیندا (مەئریفەدا) یەک دەگرنەوە، بە هەمان شێوە لەنێو ئەم زانستەدا تیۆریی مەئریفە (گنۆزیۆلۆژی) و تیۆریی بوون (ئۆنتۆلۆژی) یەک دەگرنەوە.

کاتێک ئەرِیســـتۆتێلیس لەنێو چێوەی یەکەم فەلســـەفەدا شرۆڤەی فاکتەرەکانی رووداندگەی کرد، ئەوا لەو رەوتەدا بە چوار فاکتەر گەیشـــت: ئەســـتوو، فۆرم، هێز، مەبەســـت یان ئامانج. ئێمە هەروەها دەتوانین، گەر مۆدێرنتر بدوێین، لەبریی هێز و مەبەست، وزە (Energie) و ئینفۆرماسیۆن دابنێین. ناوی ئەم فاکتەرانە بە زمانی ترادیسیۆنی بریتی بوون لە: هۆی کەرەسە، هۆی فۆرم، هۆی کاریگەری و هۆی مەبەســـت. فەیلەســـوفە دێرینە ئیۆنییەکانی سروشت بەدووی دوایەمین هۆکاردا دەگەڕان و لە هۆی کەرەســـەیی ئەستووییدا دۆزییانەوە، ئێمپێدۆکلێس کۆنسەپتی وزەی دۆزییەوە، پلاتـــۆن ئیدێـــکان یان هۆی فۆرمی دۆزییەوە، بەڵام ئەرِیســـتۆتێلیس خۆی بە ئاشـــکراکەری هۆی مەبەست دادەنا و ئەم هەڵوێستەشی بەبێ هۆ نەبوو.

رووداندگە لە روانگەی ئەرِیستۆتێلیس شتێکی هەبوو نییە، واتا دراوێکی فاکتی نییە، بەڵکو لە پێکەوەکارابوونی هەر چوار فاکتەرەکەوە دێتە ئاراوە. مێتافیزیکەکەی ئەرِیستۆتێلیس بریتییە لە مێتافیزیکی دروستکردن، مێتافیزیکی فۆرماندنی هونەری، ئەمەش لەو نموونانەدا دەردەکەوێت کە ئەو بۆ روونکردنەوەی تێگە بناغەییەکان و پێکەوکارابوونیان بەکاریان دەهێنێت. جیهانی ئەســـتوو لە روانگەی ئەرِیستۆتێلیس بێفۆرمە، شێواوە، تەنیا بەگوێرەی شیمانە هەیە، رووداندگە نییە، تەنیا جیهانـــی ئاراییە (werdend)، جیهانی بزووتنە، جیهانی هێشـــتانەبوون و چیدینەبوونە، جیهانی دۆخگۆڕیی هەمیشەییە، جیهانی بێسنووری و نەشیاوی دیاریکردن و پرۆسە پەتییەکانە.

مرۆڤ گەرەکە پێشبینیی سەرهەڵدانی سەرجەم رووداندگە (das Wirkliche) لەو شێوەیەدا بکات کە چۆن پەیکەرســـازێک لە پارچە بەردێکی مەرمەڕ ئەفرۆدیتێک دەفۆرمێنێت: هونەرمەند ئەو فۆرمـــە یان ئەو ئیدێیە کە لەنێو هۆشـــی خۆیدا لێیرِوانیوە (نووس لە روانگەی ئەرِیســـتۆتێلیس بریتییە لە جێگەی ئیدێکان) بەســـەر کەرەسە بێفۆرمەکەدا بەکاردەهێنێت و بەمەش دەیفۆرمێنێت. هونەرمەند یان دەمیورگ بەرجەســـتەی هێزی دروستکردنە، ئەوەیە کە خاوەنی ئیدێیە و بەگوێرەی ئیدێ کەرەســـە دەفۆرمێنێت، ئیدێکە یان ئینفۆرماســـیۆنەکە بەنێویدا ئاوەڵا دەکات و پاشـــان ئەو کەرەســـەیە دەبێت بە دروســـتکراوێک. فۆرمی پەیکەرەکە و ئیدێی هونەرمەندەکە، واتا هۆی فۆرم و هۆی مەبەست، هیچی دیکە نین جگە لە دوو رووی رووداندگەیەکی هۆشەکی (ئیدیەل). ئەوەی ئیتر دەمێنێتەوە، تەنیا ئەســـتوو و وزەیە، کەرەسە و هێزی (هۆشەکییانەی) دروستکردنە. لێرە کارایی گەردوونیانەی نووس، لەو شـــێوەیەدا کە بەپێش چاوی ئەناکساگۆراســـەوە دەشەکایەوە، بەتەواوی دەردەکەوێت. گەر فۆرم و وزە و ئینفۆرماسیۆن (ئیدێ) پێکەوە بریتی بن لە فاکتەرە راستەقینەکانی کارایی یان رووداندگە، ئەوســـا بۆ ئەســـتوو تەنیا رۆڵی شیمانە دەمێنێتەوە. لەبەر ئەوەی مەبەستی ســـەرجەم فۆرماندن خودی فۆرماندن یان دۆخگۆڕی نییە، بەڵکو خودی فۆرمێندراو مەبەســـتە، یان مەبەســـتەکە بریتییە لەو بەرهەمە کە شـــیاوی ناســـین و ناولێنانە، ئەوا هۆی مەبەست یان هۆی فینال بریتییە لە هۆ ســـەرەکییەکە. ئەرِیستۆتێلیس لەو لایەنەدا پلاتۆنی دەمێنێتەوە، کە ئەویش رووداندگەی فۆرمێندراو لە ســـەرووی ئارایی بێفۆرمەوە دادەنێت و کرداری فۆرماندن وەک فۆرمپێدان دەبینێت. بەڵام ئەرِیستۆتێلیس لەو لایەنەدا لە پلاتۆن جیا دەبێتەوە، کە ئەو ئیدێکان لەنێو هۆشی

ئافرێنەردا دادەنێت و وەریاندەگۆڕێت بۆ شـێوەیەکی پێشـبینیی ئامانج. بەڵام پێشبینیی ئامانج لە حاڵەتی سـەرجەم کاراییدا هێشـتا هەر لایەنە کرۆکییەکەیە. کردنی پێشـبینییەکی ئامانج بە چییەتییەک بریتییە لە بەدیهێنان. چییەتییەکە ئەوەیە کە ناسـەر لەنێو سـەرجەم ئەوەدا کە ئەو وەک هەبوو ئەزموونی دەکات، سـەرلەنوێ وەک هەبوو دەیناسێتەوە و وەک بوونەوەر دیاریی دەکات. لە روانگەی ئەریسـتۆتێلیس چییەتییـەکان بۆ خۆیان (für sich) ئەکزیسـتێنس ناکەن، بەڵکو ئەوان بەندن بەو جەوهـەرەوە / هەبوویییەوە (Seiendheit) کە پێکهاتەیەکە لە یەکێتییەکی نێوان ئەکزیستێنس و ئێسێنس، بەبێ ئەوەی ئەوان لەو یەکێتییدا شیاوی جیاکردنەوە بن لە یەکتری.

بەڵام لێرەش، وەک لە هەموو جێیەکی دی، حاڵەتێکی شاز هەیە: لێرە ئەم حاڵەتە شازە لەوەدایە کە چیدی یەکەم فەلسەفە وەک ئۆنتۆلۆژی یان وەک مێتافیزیک دەرناکەوێت، بەڵکو وەک تیۆلۆژی. خودا بۆ ئەرپستۆتێلیس بریتییە لە بەرجەستەی رەهای ئەو هۆشە ئافرێنەرە کە لەنێو هزری خۆیدا بە باڵاترین پلەی سەرجەم پراکسیس و سەرجەم دروستکردن و بوون گەیشتووە. خودا لە روانگەی ئەرپستـۆتێلیس بریتییە لە هزرینی نەبڕاوەی هزر (نۆئێزیـس نۆئێزیۆس)، لە روودانگەی پەتی؛ خودا سەرمەدی و بێفەزا و نائەستوورییە و لەتەک خۆیدا یەکە: بریتییە لە بزوێنەری نەبزۆک. لێرەدا ئیتر هزر، فەلسـەفە، کۆتایی پێدێت و ئەقیدەی (ئیمانی) فەلسـەفەیی سـەرەتا دەگرێت. رەنگە ئەرپستۆتێلیس بەوەدا بە ئەوپەڕی نزیککردنەوەی ئاوەز و ئیمان (Glauben) گەیشتبێت، کە خودا بۆ ئەو بریتی بوو لە باڵاترین پرنسیپی ئاوەز، بریتی بوو لە «هۆش».

## 8- فەلسەفەی پراکتیکی

ئەرپستـۆتێلیس لە یەکەم فەلسـەفەدا لە تێڕوانینی تایبەتییـەوە دەردەچێت تاکو بە تێگە بناغەیییەکانی زمان و سروشت بگات، بەڵام ئەو هەروەها لە فەلسەفەی پراکتیکیشدا دیسان تێڕوانینی تایبەتی لە بوارەکانی تیۆلۆژی و مێتافیزیک و ئۆنتۆلۆژیدا دەکات بە بنەمای لێوەدەرچوون. بێگومان ئەوە بەبێ هۆ نییە کە ئەرپسـتۆتێلیس فەلسەفەی پراکتیکی، واتا ئێتیک و پۆلیتیک، بۆ تەمەنی کامڵ و ئەزموونداری پیاوانە تەرخان دەکات، لێرەشـدا دەبێت جەخت لە لایەنێک بکرێت: نەشـیاوە مـرۆڤ بتوانێت لەم بوارانەدا بە هەمان پلەی ئەو کامیلێتییە بگات کە ئەو بۆ نموونە دەتوانێت لە بواری ماتماتیکدا پێیبگات. جگە لەمە ئەرپستۆتێلیس رەخنەی لە تیۆریی ئیدێکانی پلاتۆن گرتبوو، بەتایبەتـی لە ئیدێی چاکە، بەم رەخنەیەش ئەو وازی لە پێکەوەلکاندنی راسـتەوخۆی ئۆنتۆلۆژی و ئاکسـیۆلۆژی هێنا، بۆیە ناچار بوو بەدووی پێوری نوێدا بگەڕێت. نەشـیاوە تیۆرییەکی چاکە (فەزیلە) بە شێوەیەکی ئەوتۆ هەبێت، کە ئیتر مرۆڤ بتوانێت ببێژێت، داخۆ چی هەمیشە چاک و چی هەمیشـە خراپ بێت. پێوری چاکە بریتییە لە کەسـی چاک، واتای ئەمەش بۆ ئەرپستۆتێلیس هەر ئەوە دەگەیەنێت، کە هەروەک ئێمە لێرەدا ببێژین، پێوری چاکە بریتییە لە کەسی دانا. کەواتە ئێتیکەکەی ئەرپسـتۆتێلیس پەیوەندییەکی بەهێزی بە ریالێتییەوە هەیە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە مرۆڤ ناوی ناوە فەلسەفەی کۆمۆن سێنس (common sense).

بناغە ریالیستییەکەی ئێتیکی ئەرِیستۆتێلیس هەروەها لە ریزێک سیمای دیکەدا دەردەکەوێت. ئەو شـــتێک ناکات کە لە حەوسەڵەی مرۆڤدا نەبێت، ئەو بە پێچەوانەوە بەئاگایە لە دەسەڵاتی خوو و لە لاوازیی ویســـتی مرۆڤ (لێرەدا هەر پێویســـت ناکات لەبارەی لەش بە حەزەکانییەوە بدوێین). ســـۆکرات لەو باوەڕەدا بوو کە زانین بەســـە بۆ ریالیزەکردنی رەوشت، پاشـــان پلاتۆن لەم لایەنەدا شـــوێن ســـۆکرات کەوت، لایەنی کەم لە ساڵانی گەنجێتییدا. بەڵام ئەرِیســـتۆتێلیس لەسەر بناغەی رەچاو و ئەزموون نکۆڵی لە تێڕوانینەکەی ســـۆکرات دەکات و دەبێژێت، کە ئەو تێڕوانینە بەئاشکرا نەســـازە بە فێنۆمێنەکان. چۆن ئەرِیســـتۆتێلیس لـــە دیاریکردنی چاکەدا پشـــتی بە نموونەگەلی پێش خۆی بەســـت، واتا پشتی بە زانینی ترادیسیۆنی بەست، ئەو بە هەمان شێوە لە دانانی تێگە رابەرییەکەی ئێتیکیشـــدا، واتا تێگەی یۆدێمۆنی (بەختیاری)، شـــوێن زانایانی پێش خۆی کەوت، بـــۆ نموونە دێمۆکریت، جا گەرچی ئـــەو لە حاڵەتی تێگەی ناخســـەنگیندا (Wohlbestelltheit) کـــە تێگەیەکی خودی خۆی بوو، چەند لایەنێکـــی کرۆکیانەی تیۆرییەکەی خۆی ئاخنییە نێویەوە، بەتایبەتی لایەنەکانی ســـایکۆلۆژی و مێتافیزیک، ئەم لایەنانەش بریتین لە: رووکردنە مەبەســـت، تێگەی رووداوگە، ئینجا تێڕوانینەکەی خۆی سەبارەت بە کرۆک (Wesen) و کارایی دەروون.

ئەرِیســـتۆتێلیس پێناســـەی بەختیاری دەکات وەک «چالاکیی دەروون بەگوێرەی رەوشت». بە تێڕوانینی ئەرِیســـتۆتێلیس مرۆڤ ناتوانێت لەنێـــو هیچنەکردندا بە بەختیاری بگات. بێگومان ئەو تێڕوانینە کە دەڵێت چالاکی باشـــترە لە ناچالاکی، کردن باشـــترە لە بوون، ئەمە پرێمیســـێکە کە ئەرِیستۆتێلیس دایدەنێت بەبێ ئەوەی پاشان بەوردی روونی بکاتەوە. لە بنەڕەتدا چەند کەم واژەی بەختیـــاری پێی دەکرێت کتومت واژەی یۆدێمۆنیی ئەرِیســـتۆتێلیس بداتەوە، ئەوەندەش کەم واژەی «رەوشت» (Tugend) لەتەک بەهاتێگەی ئارێتێ (arete) ی گریکیدا یەکدەگرێتەوە. باشتر دەبێت، کە مرۆڤ لەبریی «رەوشـــت» ببێژێت «چاکترین» یان «چوستی» یان مومتاز، بەڵام هەر چۆنێک بێت، تازە واژەی رەوشـــت بووە بە واژەیەکی باو و چەســـپیوە. مۆرکی تێگەی گریکییانەی رەوشـــت لەوەدایە، کە هەروەها ئەســـپێک یان چەقۆیەک بەرەوشـــت دەبن، گەر ئەسپەکە خێرا غار بدات یان چەقۆکە باش ببڕێت.

جگە لەو رەوشتانە کە پەیوەســـت بە 'رێتۆریک'ـەوە ناوبراون، ئەرِیستۆتێلیس لە 'ئێتیک'دا ئەم رەوشتانەی دی دیاری دەکات: سەرڕاستی، میللیبوون (رەفتاری کۆمەڵایەتیانە)، نەرمی (مورونەت)، هەڵوێســـتی راستەقینە، بەڵام دیارینەکراو، بەرانبەر بە تەماح یان بێتەماحی، هەروەها شەرم، بەڵام رەنگە ئەمیان زۆرتر ســـەر بە هەســـتەکان بێت نەک یەکێک بێت لە رەوشـــتەکان. ئەرِیستۆتێلیس لەنێو دەروونیدا سێ گرووپی دیاردە دیاری دەکات: توانستگەل (dynámeis)، هەستگەل (páthé)، هەڵوێســـتگەل یان شێوازگەلی رەفتار (héxeis). رەوشت ســـەر بەم گرووپەی سێیەمە. جگە لەمە رەوشـــت نێوەندێکە لە نێوان دوو تەوەرەدا، بەڵام ئێمە نابێت وا تێبگەین کە هەروەک ئەم نێوەندە بریتی بێت لە چارەسەرێکی نێوانی، یان «نێوەندێکی زێڕین» بێت، بەڵکو ئەم نێوەندە کۆتێزێکی (ســـەنتێزێکی) بەهاییە بەسەر هەر یەکەی هەســـتە پێچەوانەکانەوە. بۆ نموونە دلێری شێوازێکی

ڕەفتارە کە خۆی بەســـەر هەســـتەکانی جەبانی و جەسوورییەوە دەبینێتەوە. بەڵام ئەرپستۆتێلیس هەروەها جیاوازی لە نێوان ڕەوشـــتە ئێتیکی (ئاکاری) و دیانۆئیەکاندا (هۆشەکییەکاندا) دەکات. دانایی ســـەر بە ڕەوشتە هۆشەکییەکانە، بەڵام زۆرینەی شێوازەکانی دیکەی ڕەفتار سەر بە ڕەوشتە ئێتیکییەکانن. هاوکات تیۆریی حەز واتایەکی بناغەییتری بۆ ئێتیک هەیە، لێرەشدا جۆری جیاوازی حەز هەن، بۆ نموونە ئەو حەزە کە زۆرتر جەستەییە، یان ئەو حەزە کە زۆرتر هۆشەکییە. بەڵام ئایا حەز بریتییە لە چاکێک (فەزیلەیەک) یان ئایا باڵاترین «چاک»ـە، وەک چۆن زۆر کەس گریمانەی دەکەن؟ ئەرپیســـتۆتێلیس نەرێنیی ئەم پرســـیارە دەکات و حەز وەک دیاردەیەکی لاوەکیی ڕەوشـــت پێناسە دەکات.

رســـتە دەروازەییەکانـــی 'ئێتیکی نیکۆماخی' دەرفـــەت دەدەن کە چ گرنگترین پرنســـیپەکانی فەلســـەفە پراکتیکییەکەی ئەرپیستۆتێلیس و چ سیمای سەرجەم کۆنسەپسیۆنە مێتافیزیکییەکەی ئەو بناسین:

«پێدەچێـــت هەموو هونەرێک و هەمـــوو ڕێبازێکی هزری، هەروەها هەمـــوو کردارێک و هەموو قەرارێـــک، تەقـــەلا بۆ چاک-ێک (فەزیلەیەک) بدەن، بۆیە چاک بەتـــەواوی وەک ئەو ئامانجە دیاری دەکرێت کە هەموو شـــتێک تەقەلای بۆ دەدات. بەڵام لێرەدا جیاوازییەک لەنێوان ئامانجەکاندا هەیە. هەندێک ئامانج چالاکین، هەندێکی دیکە ئیشـــی یان شـــتی تایبەتین لە دەرەوەی چالاکیەکان. گەر ئامانجەکان لە دەرەوەی کردارەکاندا بن، ئەوا سەرەنجامەکان بەپێی سروشتیان بەهادارترن لە خودی چالاکییەکان. بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر فۆرمی کردار و هونەر و زانســـت هەیە، ئەوا لێرەوە زۆر ئامانج وەک ســـەرەنجام دەکەونەوە. ئامانجی هونەری پزیشکی بریتییە لە لەشساغی، ئامانجی هونەری پاپۆڕســـازی بریتییە لە پاپۆڕ، ئامانجی هونەری جەنگ بریتییە لە ســـەرکەوتن، ئامانجی هونەری ئابووری بریتییە لە سامان. بەڵام گەر ئەو جۆرە هونەرانە لەنێو 'یەک' کایەدا ریزبەندی کرابن (بۆ نموونە هونەری زینسازی بەندە بە هونەری سوارییەوە، هونەری دیکە هەن کە بە دروستکردنی بابەتەکانی سوارییەوە خەریکن و دەکەونە ژێر هونەری سوارییەوە، ئەمیش بە هەمان شێوەی خودی جەنگ دەکەوێتە ژێر ڕکێفی هونەری فەرماندەییەوە - بێگومان هاوشێوەی ئەمە ریزبەندیی دیکە لە چالاکییەکاندا هەیە)، ئەوا هەمیشـــە ئامانجە ڕێبەرەکان بەهایەکی باڵاتریان لەو ئامانجانە هەیە کە لەژێر ئەواندا دانراون، چونکە مرۆڤ بۆ خاتری ئامانجەکانی یەکەم شوێن ئەوانەی دوایی دەکەوێت، لێرەشـــدا ئەوە هیچ گرنگ نییە کە داخۆ چالاکییەکان خۆیان ئامانجی کردارەکان بن یان ئامانجەکە لە دەرەوەیان بێت، وەک چۆن ئەمە لە حاڵەتی هونەرە ناوبراوەکانی سەرەوەدا دەبینرێت.

بەڵام گەر ئامانجێک لە دەرەوەی کردار هەبێت کە ئێمە تەنیا بۆ خاتری خۆی تەقەلای بۆ بدەین، لێرەشدا هەموو شتێکی دیکەمان تەنیا بۆ خاتری ئەم دوائامانجە بوێت و هیچ قەرارێک نەدەین کە پابەند بێت بە ئامانجی دیکەوە (ئاخر گەر ئەمە بکەین، ئەوســـا مەســـەلەکە هەتا بێدوایەکی درێژ دەبێتەوە و تەقەلاکەش بۆش و بێمەغزا دەبێت)، ئەوا ئاشکرایە کە ئەو دوائامانجە بریتییە لە چاک (فەزیلە) و باڵاترین چاک.

ئایا ناشـــێت مەئریفەی ئەم چاکە بەهایەکی گرنگی بۆ بەڕێوەبردنی ژیان هەبێت، ئایا ناتوانین لێرەوە هاوشـــێوەی نیشانەگرەوان کە ئامانجێکی چەسپێنراویان هەیە، چاکتر دروست / راستەقینە (das Rechte) بهەنگێویـــن؟ گەر ئەمە ئاوها بێت، ئەوا پێویســـتە هـــەوڵ بدەین کرۆکی ئەو چاکە لایەنی کەم بەدرشـــتی دابڕێژین و ئینجا ســـاغی بکەینەوە، کە داخۆ چی بێت و ســـەر بە کایەی چ زانستێک یان چ هونەرێکی پراکتیکی بێت.

مرۆڤ دەبێت بە راشـــکاوی ببێژێت، ئەم چاکە ســـەر بە پێورترین و رێبەرترین زانســـتە، ئەم زانستەش وەک ئاشکرایە هونەری دەوڵەتە کە تەنانەت رێنوما بۆ ئەوە دادەنێت، داخۆ کام زانستانە یان کام هونەر و پیشانە لەنێو دەوڵەتەکاندا هەبن، هەروەها تاکەکەس فێری کامیان ببێت و ئەمەش هەتـــا چ رادەیەک. ئێمە هەروەها دەبینین کە تەنانەت پڕبایەخترین هونەرەکان لەژێر ئەودا دانراون، وەک بۆ نموونە هونەرەکانی جەنگ و ئابووری و رەوانبێژی. کەواتە لەبەر ئەوەی ئەم زانستە هەموو زانســـتە پراکتیکییەکانی دی دەخاتە خزمەتی مەبەســـتەکانی خۆیەوە، هەروەها دەســـەڵاتنوێنانە رێنوما ســـەبارەت بەوە دەســـەپێنێت کە داخۆ پێویست بێت مرۆڤ چی بکات و واز لە چی بهێنێت، ئـــەوا دوائامانجەکەی کە باڵاترە، ئامانجەکانی ئەوانی دی دەگرێتە خۆی، بۆیە ئەم دوائامانجەی ئەو باڵاترین چاکە بۆ مرۆڤ.

بەڵام گەر ئەو ئامانجە چ بۆ تاکەکەس و چ بۆ کۆمەڵ لەسەر هەمان شێوە چواندنی هەبێت، ئەوا ئاشـــکرایە ئەو ئامانجە پابەند بە کۆمەڵەوە بەواتاتر و کامیلتر دەردەکەوێت، ئەمەش چ لە ســـاتی گەیشتن پێی و چ لە حاڵەتی مسۆگەرکردنیدا. بێگومان ئەوە کەم نییە گەر یاریدەی تاکەکەس بدرێت بـــە بەختیاری راســـتەقینە بگات، بەڵام جوانتر و مەزنتر دەبێـــت گەر ئەم هەوڵە پابەند بە گەلان و کۆمەڵانی پۆلیسەوە بەگەڕبخرێت.

کەواتە ئەمەیە بابەتی لێکۆلێنەوە زانستییەکەمان. ئێمە لێرەدا خۆمان لەنێو تیۆریی دەوڵەتدا دەبینینەوە.

پابەند بە داڕشـــتنییەوە ئەوەندە بەســـە کە داڕشتنەکە بەو پلەیەی روونی بگات کە کەرەسە دراوەکە خۆی رێی پێدەدات. ئاخر هیچ گەرەک نییە مرۆڤ لە هەموو کێشـــە زانســـتییەکاندا لەسەر هەمان شـــێواز تەقەلا بۆ کامیلێتی بدات. ئەمە بێگومان لە حاڵەتی هونەرەکانی پیشەی دەستیشدا هەر ئاوهایە. لە حاڵەتی فۆرمەکانی رەسەنێتی و بەدادیدا (das Gerechte) کە زانستی دەوڵەت لێیان دەتوێژێتەوە، ئەوەندە جیاوازی و ناجەختی هەن کە ئیتر رەنگە تێڕوانینێکی ئەوتۆ سەرهەڵبدات کە هەروەک رەســـەنێتی و بەدادی پابەند بن بە یاساوە نەک بە زەروورەی سروشتییەوە. ناجەختییەکی هاوشێوە لە حاڵەتی چاکە (فەزیلە) جیاوازەکانی ژیانیشدا دەردەکەوێت، چونکە زۆر کەس بەرێیانەوە زیانمەند بوون: هەندێک کەس بەرێی سامان و هەندێکی دیکە بەرێی دلێرییانەوە لەناوچوون.

کەواتە ئەوەندە بەسە کە مرۆڤ کە لە حاڵەتی بابەتێکی بەم چەشنە و ئەم جۆرە پرێمیسانەدا تەنیا بەزەقی و درشـــتی راڤەی راســـتی بکات، ئەمە بێگومان ئەو بابەت و پرێمیسانەش دەگرێتەوە کە تەنیا بەگشتی دیاریکراون، لەم حاڵەتانەشدا پێویستە هەمان دەرەنجام دەربکێشرێت. هەر لەم

مەغزایەدا دەبێت گوێگر مامەڵە لەتەک بەشـــە وردەکانی دارشتنەکەدا بکات. لێرەدا گوێگری شارەزا لـــە هـــەر یەکەی بوارە جیاوازەکاندا تا ئـــەو رادەیە داوای کامیلێتی دەکات کە سروشـــتی بابەتەکە خۆی بواری پێدەدات. بێگومان ئەوپەڕی نالەبار دەبێت گەر مرۆڤ لە ماتماتیکییەک روونکردنەوەی رەنگەیەتـــی قبـــووڵ بکات و لە رەوانبێژێـــک لەنێو کۆبوونەوەی ئەنجومەندا داوای بەڵگەی حاســـم بکات.

هەموو یەکێک تەنیا بەســـەر ئەو شتەدا بەڕاستی بڕیار (حوکم) دەدات کە ئەو خۆی دەیزانێت و هەر لەو بوارەشـــدا ئەو کەسە دادوەرێکی چاکە. کەواتە کەسێک کە لە بوارێکی تایبەتیدا فێرکراوە، دەتوانێت لەو بوارەدا راســـت حوکم بدات، بەڵام لە هەمان بواردا کەسێک دەتوانێت گشتگیرانە حوکم بدات کە بەهەمەلایەنی پێگەیەنراوە. لەبەر ئەم هۆیە گەنج گوێگرێکی گونجاو نییە بۆ بەشداریکردن لە موحازەرەیەکدا کە لەبارەی زانســـتی دەوڵەت پێشـــکەش دەکرێت، چونکە ئەو گەنجە جارێ هیچ ئەزموونێکی لە ژیانی پراکتیکی، لە بابەتەکە و پێشمەرجی سەرجەم وانە سەرەتاییەکانی رامیاریدا نییە. هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو گەنجە هێشتا ئەودالّی هەست و سۆزەکانە، ئەوا ئەو تەنیا بەناچاری و بەبێ ســـوود گوێ لەم وانەیە دەگرێت، چونکە مەبەســـتی وانەکە مەئریفـــە نییە، بەڵکو کردارە، لێرەشـــدا ئەوە هیچ گرنگ نییە کە ئەو کەســـە بە تەمەن گەنجە یان بەگوێرەی کارەکتەری ناکامڵە. ئاخر کەمایەسی بەند نییە بە ژمارەی ساڵانەوە، بەڵکو بەو رێیەوە سەرهەڵدەدات، کە کەسانی گەنج لەژێر رکێفی سۆزەکاندا دەژین و هەر لەژێر ئەم کاریگەریەشدا شوێن ئامانجەکانیان دەکەون. بۆ ئەم گەنجانە، بەڵام هەروەها بۆ کەسانی بێپێور کە چاکەیان دەوێت و سەرباری ئەمە نایکەن، مەعریفە بێســـوودە. بەڵام پێدەچێت ئەم زانســـتە بۆ ئەو کەسانە ســـوودی گەورەی هەبێت کە ئاوەزمەندانە تەقەلا دەدەن و کرداریان دەنوێنن»[٣].

ئێتیک ئاڕاســـتەیەکی تێلیۆلۆژیانەی هەیە. چۆن تەقەلا بۆ چاکێک هونەر (techne) و زانســـت (methodos) پێکـــەوە دەبەســـتێت، ئەو تەقەلایە بە هەمان شـــێوە بەشـــە تیۆریی-پۆئێتییەکەی فەلســـەفەی ئەریستۆتێلیس بە بەشـــە پراکتیکیەکەیەوە دەلکێنێت. بەها بریتییە لە کاتیگۆرییە رێبەرەکەی ئەم بەشە پراکتیکییە، شێوازی تێڕوانینەکەشی شێوازێکی ئەکسیۆلۆژییانەیە کە لەپاڵ شێوازە تێڕوانینی لۆگیکی و فەلسەفەیی-سروشتی و مێتافیزیکیدا دەردەکەوێت، کەواتە چیدی وەک ئیدێی چاکە لای پلاتۆن لەتەکیاندا نەتواوەتەوە. فەلسەفەی پراکتیکی وەک دیسپلینێکی فەلسەفەیی سەربەخۆ سەرهەڵدەدات. ئامانجەکی و مەبەستەکی لەنێو تێگەی تێلۆسدا (das Ende / کۆتاییدا)، لەنێو تێلیۆلۆژیدا، یەکدەگرنەوە. هزر لە کۆتاییەوە زامنی جیاوازیکردن لە نێوان مەبەســـتی لاوەکی و خۆمەبەســـتدا دەکات، بەڵام هەروەها لەســـەر هەمان شـــێوە، لە کۆتاییەوە، کرداری بەدیهێنەری بەهـــا زامـــن دەکات، خودی کردار هـــەر بەو رێیەوە پڕبەهـــا دەبێت و مەغزا و بـــوون وەردەگرێت. بەڵام باڵاترین ئامانجی ســـەرجەم کردار بەختیارییە (eudaimonia) کە (قنوع) و ســـەربەخۆیی و ئازادی لە خۆ دەگرێت. ریزبەندیی فۆرمەکانی ژیان هاوشـــێوەی ئەم ریزبەندییەی بەهاکانە، ئەمەش بە هێڵێکی هەڵکشـــاو: بیۆس ئاپۆلاوســـتیکۆس (bios apolaustikós = چێژ)، بیۆس پراکتیکۆس

(praktiós = سیاسەت)، بیۆس تیۆرێتیکۆس (theoretikós = زانست، فەلسەفە). بەڵام لە روانگەی ئەرِیستۆتێلیس سامانی دەرەکیش سەر بە بەختیارین. ئەوە مۆرکێکی هزری گریکییە کە ئێتیک لەنێو فەلسەفەی سیاسیدا دادەنێت. پۆڵیس چ بۆ ئەرِیستۆتێلیس و چ بۆ پلاتۆن لە کایەی ئێتیکیشدا هەر پێوری هەڵوێستوەرگرتنە / ئاراستەوەرگرتنە (ئۆریەنتاسیۆنە). ئەرِیستۆتێلیس هەوڵ دەدات لە پرسیاری ئازادیی ویستدا (Willensfreiheit) کە واتای چ بۆ کایەی ئێتیک و چ بۆ کایەی دادوەری (rechtlich) و سیاسی هەیە، پتر جیاوازی بکات:

«لەبەر ئەوەی هەر رووداوێک کە لە ناچارییەوە یان لە نەزانینییەوە هاتووەتە گۆرِێ، رووداوە بەبێ ویستی خۆ (unfreiwillig)، ئەوا گەرەکە ئەوە بە ویستراو (freiwillig) دابنرێت کە پرنسیپەکەی لەنێو کردارنوێندایە، ئەمەش بە چەشنێک کە ئەو کەسە هاوکات تاکە دۆخەکانی کردارەکەش دەبینێت. ئاخر هەڵەیە گەر مرۆڤ ئەوە بە نەویستراو (unfreiwillig) دابنێت کە لە توورِەییەوە یان ئارەزووەوە روو دەدات»[٤].

ویستراو (hekoúsion) واتای فەزلپێدان (prohairesis) ناگەیەنێت. ئەمیان تێگە تەسکترەکەیانە. مەرجەکانی فەزلپێدان بریتین لە ئاوەز (logos) و پلاندانان (dianoia) و بیرلێکردنەوە (boulé). ئیتر پاشان بەدووی ئەم مەرجانەدا فەلزپێدان دەردەکەوێت، وەک ئارەزووی (orexis) بیرلێکراوە بۆ شتێک کە ئێمە دەتوانین بیکەین. سێ فاکتەر لە حاڵەتی قەراردان و کردارنواندندا کاریگەرن: دەرککردن (aisthesis)، هۆش (nous)، داخوازی (orexis / Verlangen). دەرککردن، وەک خودی خۆی، کردار ناخاتەوە. هزر ئەرێنی یان نەرێنی دەکات. ویست گوێرایەڵە یان هەڵدێت. گەر رەوشتی ئێتیکی ببێت بە پاڵهێز بۆ قەراردانێک و ئەمیش بریتی بێت لە ویستی بیرلێکراوە، ئەوسا برِیارەکەی ئاوەز راستە و ویست ئاوەزمەندە، ئەمە بێگومان گەر هاتوو قەراردانەکە جیددی (spoudaia) بێت. دەروون بە یاریدەی پێنج توانست پێی دەکرێت ئەرێنیانە یان نەرێنیانە راستی دەربرِێت: هونەر (techne)، زانست (epistéme)، ئاوەزی پراکتیکی (phronesis)، دانایی (sophía)، هۆش (nous). شارەزایی (Wohlberatenheit) و ناخسەنگینی و توانستی برِیار بریتین لە دیاردە جیاوازەکانی ئاوەزی پراکتیکی. هۆش لە پرنسیپەکان تێدەگات، بەڵام ئاوەز کۆنترۆڵی کایەی پراکتیکی دەکات. ئەم فاکتەرانە پێکەوە لە پرۆسەی قەراردانیدا چالاکن.

ئەرِیستۆتێلیس لە بەشە جیاکانی 'پۆلیتیک'دا لە بواری جیاواز دەتوێژێتەوە. بەشی یەکەم: ئابووریی ماڵ و خێزان و کەسابەت. بەشی دووەم: فۆرمەکانی دەوڵەت. بەشی سێیەم: رەوشتە تایبەتی (پریڤات) و سیاسییەکان، جۆرەکانی دەستوور، هەروەها پەروەردە و یاسادانان. بەشی چوارەم: ستاندەکان (توێژەکان) و فەرمانگەکان و دادوەری. بەشی پێنجەم: ئاڵوگۆرِی دەستوورەکان. بەشی شەشەم: دێمۆکراتی و ئۆلیگارشی و فەرمانگەکان. بەشی حەوتەم: باشترین دەوڵەت. بەشی هەشتەم: پەروەردە.

فەلسەفە سیاسییەکەی ئەرِیستۆتێلیس پێناسەیەکی توخمیی هەیە: «مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە» (zóon politikón)، بەڵام زمان، پاشان هەستی مرۆڤ بۆ چاکە و خراپە، بۆ داد و

بێدادی، ئەو لە ئاژەڵ جیادەكەنەوە . كۆمەڵی هاووڵاتیانی ئازاد كە لە فەرمانگە و دادوەریدا بەشدارن، هەڵگری دەوڵەتە . دەستوور سازاوە بە رێكخراوی دەوڵەت. رەوشتی هاووڵاتیی دەوڵەت، نەک هیتی مرۆڤ، پەیوەندە بە دەستوورەوە . جیاوازییەكانی دەستوور بەندن بە ستاندەكانی (توێژەكانی) نێو دەوڵەت و دابەشینی دەسەڵاتەوە لەنێو ستاندەكاندا. ئەرِیستۆتێلیس جیاوازی لە نێوان هەشت ستاندردا دەكات: كشتیاران، پیشەگەرانی دەستی، بازرگانان، كرێكاران، جەنگاوەران / سەربازان، دادوەران، جەنابانی ئەنجومەن، گەورە موڵكدارانی زەوی و فەرمانبەرانی باڵاتری دەوڵەت. مرۆڤ دەتوانێت بەگوێرەی كاریگەرییەكانی ئەم ستاندانە جیاوازی لە نێوان پێنج جۆری دێمۆكراتی، چوار جۆری ئۆلیگارشی و سێ جۆری ئەریستۆكراتیدا بكات. مەرجەكان بۆ دەوڵەتێكی چاک و دەستوورێكی چاک برتین لە ستاندێكی فراوانی ناونجی و رێگرتن لە جیاوازیی گەورەی سامان. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە كە تەمەنی دێمۆكراتییەكان درێژترە لە تەمەنی ئۆلیگارشییەكان. كەواتە ئەوەی بۆ ئێتیک چواندنی هەیە، بۆ سیاسەتیش هەیەتی: پێور و میانەرەوی. چاكترین دەوڵەت ئەوەیە كە ئاراستەیەک رووەو باڵاترین ئامانج وەردەگرێت، باڵاترین ئامانجیش بریتییە لە چاكترین ژیان، بەڵام چاكترین ژیان بریتییە لە بەدیهێنانی ئەوپەڕی باڵای رەوشت. لە پرنسیپدا گەرەكە ژمارەیەكی هەتا رادەی شیان زۆری هاووڵاتیان بەشدارییەكی چالاک لە ژیانی سیاسیدا بكات. پەروەردە گرنگترین فاكتەرە بۆ مانەوەی دەوڵەت و چواندنی دەستوور. چاكترین یاسا و چاكترین دەستوور هیچ سوودێكیان نابێت گەر مرۆڤان فێرنەبووبن بەگوێرەی هۆشی یاساكان و دەستوور بژین. ئەرِیستۆتێلیس لە سەرەتای ئێتیكدا بەوردی شرۆڤەی رەفتار دەكات، بەڵام لە 'پۆلیتیک'دا پەروەردە دەكات بە ئەركە سەرەكییەكەی دەوڵەت. ئەم دوو نووسینەی ئەرِیستۆتێلیس ئاراستەی یەک ئامانج كراون: بەختیاری (یۆدیمۆنییا). لێرەدا نەسازییەكەی نێوان تیۆری و پراكسیس هەڵگیراوە (نەفیكراوە). تیۆری هاوكات بریتییە لە باڵاترین فۆرمی پراكسیس و بەختیاری پێكەوە . ئایا ئەمە شێوەیەكی نوێی دەربڕینەكەی پلاتۆنە لەمەڕ دەسەڵاتداره فەیلەسوفەكان؟ ئەرِیستۆتێلیس لێرەشدا پلاتۆنی مایەوە .

بەم شێوەیە بازنەی تێمەكانی فەلسەفەی ئەرِیستۆتێلیس دادەخرێت: ئەرِیستۆتێلیس لە شرۆڤەی زمانەوە سەرچاوەی گرت، ئینجا لە فەلسەفەی سروشتدا گەیشت بە بناغەی لۆگیک، پاشان لەنێو تیۆرییەكی باڵاتردا سروشت و زمانی پێكەوەلكاند: لە 'یەكەم فەلسەفە' یان لە تیۆریی پرنسیپەكاندا، ئینجا لە كۆتاییدا، پابەند بە ئاوەڵابوونی لۆگیكیانەی مێتۆدیكەكەی خۆیەوە، سەرجەمی كۆئیشەكەی بە دیسپلینەكانی فەلسەفەی پراكتیكی داخست.

## فەرهەنگۆک

تێبینی: واتای زۆرینەی واژەکان بەزۆریی پەیوەست بەم نووسینەوە دیاری کراوە، بەڵام هەندێکیان یان زۆریان دەشێت لە واتای دیکەشدا بەکاربهێندرێن.

ئاکسیۆلۆژی: تیۆریی بەها

بڕیار: (Das Urteil / بە عەرەبی «القضية») تێگەیەکی بناغەیی لۆگیکە کە لە دادوەرییەوە وەرگیراوە. بڕیار دەربڕینێکە لەسەر شتەکانی جیهانی دەرەوەی بێژەر. بۆ نموونە: 'سۆکرات کەچەڵە' یان 'بازنە خولگەییە'.

بەئاگابوون: الوعی.

پرۆترێپت: ورەبەرزکردنەوە یان گەڤکردن بۆ دیراسەی فەلسەفە. پرۆترێپت لە ئەنتیکەدا بەشێک بوو لە نووسینە دیالێکتیکییەکان.

پرۆلۆگ: پێشنواندن

پرێمیس: پێشدانراو (فەرەزیات) لە لۆگیکدا، بۆ نموونە «سۆکرات مرۆڤە» (بڕوانە خوارەوە: سیلۆگیزم).

پێریپاتۆس: ناوی ئەو فێرگە فەلسەفییەیە کە درێژەی بە شێوازی فەلسەفاندنی ئەرپستۆتێلیانە دا.

پیتیا: خانمە کاهینی دەلفی

تڕادیسیۆن: (بە عەرەبی «تقليد»)، ئەوەیە کە لە ڕابوردووەوە گەیەنراوە و سەروەریی هەیە.

تیۆلۆژی: زانستی خودایەتی

تێلیۆلۆژی: زانستی هۆئەنجامی

جۆر / رەگەز: لە لۆگیکی ئەرپستۆتێلیسدا یەکەم توخمی هۆش بریتییە لە «تێگە»، بۆ نموونە «ئەسپ». لە تێگەکانەوە جۆر و رەگەز دەکەونەوە. ئەسپ جۆرێکە کە سەر بە رەگەزی ئاژەڵە.

چاپێندراو: نابێت لەتەک چەپێندراو (کەبتکراو)دا تێکەڵ بکرێت. چاپاندن تۆمارکردنی یان چاپکردنی وێنەی دەرککراوە لەنێو کایەی هۆشەکیدا.

دێمۆکراتی: دەسەڵاتداریی جەماوەر

دەمیورگ: کردگار، خودا

دیداکتیک: زانستی فێرکاری

دیشۆتۆمی: دووبەشکردنی تێگەیەک، لێرەدا دوو تێگە لە تێگەیەکەوە دەبڕێنەوە و لەژێریدا یەکدەخرێن.

دیئەیرێزە: ئەو مێتۆدەیە کە پلاتۆن بەگەڕی دەخست تاکو بە شێوەیەکی دیشۆتۆمی باڵاترین تێگەیەک بچەسپێنێت.

ریالێتی: (واقیع)

ژانر: تەرز یان جۆر (بۆ نموونە لە ئەدەبدا)

سەبژێکت: بکەر، هەڵگر

سەنتێز (کۆتێز): لە هزرینی دیالێکتیکیدا تێز و ئەنتیتێز دادەنرێن کە هەڵگرتنیان (نەفیکردنیان) سەنتێز دەخاتەوە

سێنس: بریتییە لە تۆمارگریی فیزیۆلۆژیانە لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵە پێشکەوتووەکاندا. سێنسەکان بریتین لە سێنسی بینین، بیستن، چێژتن، بۆنکردن، گرتن.

سیلۆگیزم: (زانستی پێور). لە سیلۆگیزمدا دوو بڕیار وەک پێشدانراو (پرێمیس) هەن کە نێوانە تێگەیەکیان هەیە و لێوەیان بڕیارێکی سـێیەم (کۆنکلوزیۆن) دەرئەنجامێنرێت. بۆ نموونە: سـۆکرات مرۆڤە، مرۆڤ بمرە، دەرئەنجام: سۆکرات بمرە.

فاکت: دراوی هەقیقی.

فراگمێنت: نووسینێکی کەرتمەند، تەواونەراو.

کاتارزیس: پاکژبوونەوە، خاڵیبوونەوەی لێڕوانەری تراژیدیا لە موئاناتەکانی.

کاتیگۆری: تێگەی بناغەیی.

کاریەر: (تەرقیە، بۆ نموونە هینی زانستی لە زانکۆدا).

کۆمێنتار: راڤە (شەرح)

کۆنڤەنسیۆنالیسـت: لایەنگری کۆنڤەنسـیۆنالیزم لە زماندا، واتا زمان دەگەڕێنێتەوە بۆ رێککەوتن لەنێوان مرۆڤاندا.

کۆنسەپسیۆن: پلانی تیۆرییانە، بناغەی پرۆژەی هزری یان هونەری.

کۆنسەرڤاتیڤ: پارێزەری بەها کۆنەکان کە وەک سروشتی نەشیاوی گۆڕان دیان دەنێت.

گەمـەی دەلفـی: (یان گەمەی پیتیایی یـان پیتییاکان) بریتی بوو لە گەمەی زۆرانـی هێلێنەکان کە بۆ ئابرووی ئەپۆلۆن ئەنجام دەدرا.

لۆگیکی سەبژێکت-پرێدیکات (بکەر-هەڵگیراو): ئەم لۆگیکە لە بونیادی ناخەکیی گۆزارەڕستە دەتوێژێتەوە، بـە پێچەوانەی لۆگیکی گۆزارە کە تەنیا لە گۆزارەکان و شـیمانەی پێکەوەلکاندنیـان دەتوێژێتەوە. لۆگیکی سـەبژێکت-پرێدیکات پیشـانی دەدات کە هەموو گۆزارەیەکی توخمی لە سەبژێکتێک و پرێدیکاتێک پێکدێت. بۆ نموونە: «بازنە خولگەییە». «بازنە» سـەبژێکتە، بەڵام «خولگەیی» هەڵگیراوە، هەردووکیان بە ئەڵقەی «ـە» پێکەوەبەستراون.

مێلانکۆلی: خەماوی، مات

نارڕاتیڤ: گێڕەرەوە

نۆرم: پێور (معیار)

نەسازی: (تناقچ)

ئۆراکل: ئەو شوێنەیە کە تێیدا خوداکان راگەیاندنی نهێنیئامێز ئەنجام دەدەن

ئۆلیگارشی: دەسەڵاتداریی گرووپێکی بچووک

ئۆنتۆلۆژی: بووناسی.

ئەبستراکتکردن: (تەجریدکردن)

ئەستوو: مادە، ماتەری

ئەریستۆکراتی: دەسەڵاتداریی دەوڵەمەندە بەگزادەییەکان

هەڵگیراو: (مەحمول / پرێدیکات). بۆ نموونە: 'سـۆکرات مرۆڤە'. لەم بڕیارەدا 'سـۆکرات' سەبژێکتە، بەڵام 'مرۆڤ' هەڵگیراوی سەبژێکتە.

یونیڤێرسال: گشتی، گشتگیر، جیهانی، گەردوونی

ئیدێ: بوونەوەری هەمیشە هەبوو

ئیزۆتێریـک: تیۆرییەک یان جیهانبینییەک کە تایبەت بێـت بە گرنگیپێدەرانی نێوخۆیی، هەروەک بڵێین

فێرخوازە شارەزاکان.

ئیکزۆتێریک: تیۆرییەک یان جیهانبینییەک کە کرابێتەوە بۆ گرنگیپێدەران بەگشـــتی، نەک تەنیا تایبەت بێت فێرخوازە شارەزاکان لەنێو فێرگە فەلسەفییەکەدا.

ئیندوکتیڤ: (ئیســـتیقرائی) مرۆڤ بەم مێتۆدەی ئیندوکسیۆن لە تاکە دەرککردنە سێنسییەکانەوە رووەو گشتێتی سەردەکەوێت.

ئێپایزۆدۆن: (ئێپیزۆد) کورتە رووداو لەنێو سەرجەمە رووداونێکدا، بۆ نموونە رووداوێکی کورتخایەن لەنێو سەرجەمی تراژیدیایەکدا.

ئێلێنکتیک: هونەری ســـەلماندن، هونەری بەرپەرچدانەوە. ئەمە ئەو شێوازەی فەلسەفاندن بوو کە سۆکرات لەسەری دەرۆیشت.

ئێنتەلەشـــی: (هۆئەنجامی). فەلسەفەی ئەرپستۆتێلیس فەلســـەفەیەکی ئێنتەلەشییە، کە لە پەیوەندیی نێویەکییانـــەی هـــۆ و ئەنجامەوە دەردەچێت، بۆ نموونە فۆرم و کەرەســـە لە سروشـــتدا، لە چیرۆکێک یان لە تراژیدیایەکدا. یان لە زیندەوەرزانیدا لەش کەرەسەیە و دەروون فۆرمی لەشە.

ئینتوئیتیڤ (ل): (روئیایی) زانینی ئینتوئیتیڤ بریتییە لە لێڕوانینی «روون و ئاشکرا»ی شتەکان یان حاڵەتەکان و هیچ بڕیارێکی لۆگیکیی تێدا نییە.

یۆگین: نوێنەری یۆگا، شێوازێکی فەلسەفیی هیندییە کە خود بەڕێی سەروەربوون بەسەر لەش و ئازادکردنی هۆشیەوە لە شوێنەوار سەربەست دەبێت، خۆی دادەبڕێت.

## پەراوێزەکان:

1) Bengtson, Griechische Geschichte, S. 288

2) A. Stahr, Aristoteles Poetik, Berlin, 5. Auflage. o.J., S. 86f.

3) E. Rolfes, Aristoteles, Nikomachische Ethik. Hg. V. G. Bien. Hamburg 1972, S. 1ff.

بۆ وەرگێڕانی ئەم سیتاتەی ئەرپستۆتێلیس هاوکات سوودمان لەم وەرگێڕانەی "ئێتیکی نێکۆناخی" وەرگرتووە:

Aristoteles, Nikomachische Ethik. Übersetzt von Franz Dirlmeier, Buch 1, 1092 a 1-21 - 1094 a 8-32. Stuttgart 1985

4) ebd., S. 48

## سەرچاوە:

Ernst R. Sandvoss, Geschichte der Philosophie, Bd. 1. Wiesbaden 2004

# چاکسازی دین بە هۆی عەقڵەوە

روی پۆرتەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

فەیلەسوفانی رۆشنگەری هێواش هێواش تێگەیشتن کە دەریای سیاسەت بۆ ئەوان دەریایەکی پڕ شـــەپۆلو بەرزو نزمیەو جێگەی باوەڕ نییە، ئەوان لەم ڕووەوە بیرێکی رونو دیاریکراویان نەبوو کە ئایا خۆیان خوازیاری دەســـەڵاتی سیاسین یان پێیان باشە وەک راوێژکارانێک کە چەند ئیمتیازێکی تایبەتیان هەیە، دەست بە ڕەخنەگرتن لە دەسەڵاتی حوکمڕان بکەن, بەڵام فەیلەسوفانی رۆشنگەری کاتێک پێیان دەخستە ناو هەرێمی دینەوە، هەستیان دەکرد دڵنیاترن، چونکە هەموو مەزهەبێکیان رەت ئەکردەوە کە لە دەرەوەی کۆنتڕۆڵی شەخسی مرۆڤ بوو، لەراستیدا مەزهەب لە هەموو شکڵەکانیدا بە قاڵبە دێرینەکانیەوە، لای زوربەی بیریارانی ئەم قۆناغە، قەبوڵ نەدەکرا.

زۆرێک لە بیریارانی بەرجەســـتەی رۆشـــنگەری بە توندی بێزاربوون لە ئامادەبوونی دیاردەکانی بیرکردنەوە و بونیادە مەزهەبیەکان لە فەزای ژیانی کۆمەڵایەتیدا. زوربەی بیریارانی مەزنی ئەم قۆناغە (بەتایبەتی لە فەرەنســـا و ئینگلتەرا) بە توندی رەخنەو تانەو تەشـــەریان ئاراستەی گاڵتەجاڕیو پوچی ئیلاهیاتی مەســـیحی، گەندەڵـــی و داڕمانی ئەخلاقی پیاوە رۆحانیەکانی دەسەڵاتپەرســـتی کەنیسە (بەر لە هەمویان کەنیسەی کاسۆلیکی رۆم) و دەسەڵاتی ترسناکی باوەڕی (ئیمان) کوێرانە کە هێشـــتا لە ژیانی خەڵکیدا هەیبوو، دەکرد. هەندێکیان کە لەناویاندا ڤۆڵتێرو دیدرۆ ناوبانگێکی زۆرتریـــان هەبوو، بڕوایان وابـــوو یەکەم هەنگاو لەپێناوی ئازادی گشـــتی مرۆڤدا بە رزگاربوون لە کۆتوبەندی دەســـەڵاتی دیکتاتۆرانەی مەزهەب، دەست پێدەکات. چونکە بە بڕوای ئەوان کەسێک کە دیلی مەزهەبێکی درۆزنانەیە، ناتوانێت ببێتە سەروەری خۆی.

ڤۆڵتێر ســـەرەتای خەباتی خۆی دژی مەزهەب، بە دژایەتی پاپا، یەسوعیەکانو قەشەکان دەست پێکرد. پاشان لە لوتکەی بەناوبانگیدا خودی خودای مەسیحیەتی خستە ژێر رەخنەوە. دێڤید هیوم بە بەکارهێنانی فەلسەفەی ئەزمونگەری گومانکارانەی خۆی، ئەرگۆمێنتی کلاسیکی سەلماندنی خودای لە رێگەی مەخلوقەکانی خوداوەندەوە، بەبێ بایەخ دانا. (بەپێی بڕوای هیوم تێگەیشـــتنی ئێمە بۆ پەیوەندی نێوان هۆو هۆکار بەســـتراوە بە ئەزمونکردنی نمونەگەلێکی جیاواز، بەڵام لەبەرئەوەی یەک جیهان یان (هۆکار) هەیە، لەبەرئەوە ئێمە خاوەنی ئەو مەرجە پێویســـتانە نین بۆ هەڵســـەنگاندنی (هۆ) یان دروستکەرەکەی) جگە لەمەش هیوم بڕوای وابوو کە لەو وێنایەدا (تەسەور) کە کەسێکی عەقڵانی (rational) دەتوانێت باوەڕی بـــە مۆجیزەکان هەبێت، ناکۆکیەکی دەروونی هەیە. ئیدوارد گیبـــون لە کتێبی «مێژووی داڕمانو روخانی ئیمپراتۆری رۆم» (١٧٧٦) رایدەگەیەنێت کە گوناهی مەســـیحیەت لە هێنانە خوارەوەی شارســـتانیەتی مەزنو درەوشـــاوەی رۆم و راکێشانی ئەوروپا بۆ سەردەمی هەزار ساڵ تاریکیو جەهالەت، کەمتر نیە لە (گوناهی) کۆمەڵگا دڕندەکان.

فۆنتنل، بۆلانژ و زۆرێکی تر بڕوایان وابووە کە بڕوابون بە خوداوەندە تورەکانی ئاسمان، بەر لەهەر شـــتێک کاردانەوەی ناچاریانەی زیهنی مرۆڤی دڕندە پیشـــان دەدات کە لە دیاردە نەناسراوەکانو لە نەتوانینی بۆ کۆنترۆڵکردنی هێزەکانی سروشت، توشی ترس بووە. لەراستیدا خەڵکی سەرەتایی ئەو شتەیان دەپەرســـت کە دەبووە هۆی ترساندنیان. بەپێی ئەرگۆمێنتەکانی فەیلەسوفانی رۆشنگەری مرۆڤە ســـەرەتاییەکان مۆجیزەو قوربانیکردن بۆ خواکانیان داهێنـــا، تاکو تورەیی ئەم خوادەوەندە ئەفســـانەیانە بنیشـــێنەوە. بێگومان بۆ خوێنەرانیان رونبوو کـــە ئەرگۆمێنتەکانی ئەوان تەنها بۆ خێڵە ســـەرەتایەکانی ئەفەریقاو ئەمەریکای باشـــور کورت نابێتەوە، چونکە ئامانجی راستەقینەی رەخنەکانیان، رەخنەکردنی دینی مەسیحیەت بوو کە بڕوای بە نەریتی جیاوازی پێرۆزکردنو قوربانی بوونی دووبارەی مەسیح لە مەراسیمی عەشای رەبانیدا هەیە.

مۆنتیســـیکۆ لە کتێبی «نامە ئێرانیەکان» (١٧٢١) پاپا لـــە زمانی جیهانگەرۆکێکی ئیرانیەوە بە ســـیحرباز ناوئەبات. بارون دهلباخ لەهەمان ئاراســـتەدا مەزهەب بە پێشـــەکی سادەی (خامی) زانست ناودەنێت. بەپێی بڕوای دهلباخ زیهنی سەرەتایی مرۆڤی سەرەتایی بڕوای بە رۆح، فریشتە، ئەهریمەنو ســـیحر و ئەفســـون هەبوو، بەڵام کاتێک فکری مرۆڤ پێگەیشـــت، سەلماندی کە هیچ یەک لەوانە لە دەرەوەی زیهندیدا بوونی نیە , تەنها سروشـــت هەیەو سروشـــتیش هیچ نیە جگە لە سیســـتەمێکی ماددی، کە لە تەنە فیزیاییەکان پێکهاتووە و یاســـای نەگۆڕی زانستی حوکمڕانیان دەکات.

ڤۆڵتێر زیاتر لە بیریارەکانی تری ئەم ســـەردەمە دژایەتی مەســـیحیەتی ئەکرد و لە ســـەرجەم ســـەردەمی چالاکییە فکریو فەلسەفیەکانی خۆیدا دژی «دیوەکانی مەزهەبی درۆزنانە» راوەستا.... هێواش هێواش بێزاری ڤۆڵتێر لە مەســـیحیەت شـــێوازێکی توندتری بەخۆیـــەوە دەگرتو تورەییو هەڵچونی ئەخلاقیو ئاگراوی خۆی ئاراستەی ئەو ناشرینیو توندوتیژیانە کرد کە مەسیحیەت لەرێگەی بەرپاکردنی جەنگە مەزهەبیەکان، سوتاندن کافران، لەسێدارەدانی بەناو «ژنانی سیحرباز»ەوە پێی

هەڵسابوو.

ڤۆڵتێر ماوەیەكی درێژ هیواداربوو مرۆڤ ئەوەی كە گی بە «كافری خەسڵەت مۆدێرن» (modern paganism) ناونا، بخاتە جێی بنەمای باوەڕی مەسیحیەتو كەنیسە. مەزهەبێكی وا ئەتوانێت لە قاڵبی «مەزهەبێكی سروشتی»دا شكڵ وەربگرێت، باوەڕبوونێكی نادۆگمایی بە بوونی خودایەكی خێرخوازو عەقڵانی كە دەكرێت بە بونیادنەری جیهانی نیوتنی بزانرێتو وەك زامنی دادپەروەریو ئەخلاق لەناو خەڵكدا پیرۆز بكرێت. ڤۆڵتێر بیری لەو پرسیارە ئەكردەوە كە ئەگەر خودایەكی لەمچەشنە لە مرۆڤ بگیرێتەوە، ئەبێت مرۆڤەكان بە چ هۆیەك لە خراپەو بەدی دوربكەونەوە، كاتێك لەبەر گوناهەكانیان سزا نادرێن؟ (هۆی ئەو وتە تەنز ئامێزەی كە ئەیگوت «ئەگەر خودا نیە، ئەبێت دایبهێنین» ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵە).

ڤۆڵتێر تەنانەت باوەڕبوون بەمچەشنە «مەزهەبە سروشتیە»شی لەدەستدا. روداوی بومەلەرزە توندەكەی لیسبۆن لە ساڵی ١٧٥٥ كە ژمارەیەكی زۆری كردە قوربانی، باوەڕی ڤۆڵتێر بە بونێكی پیرۆزو خێرخواز لەناوبرد كە هیوادار بوو لە پشت سروشتەوە هەبێت. ڤۆڵتێر لە دوا دەیەكانی ژیانی خۆیدا بە تورەییەكی بەردەوامو بێ دەربەستەوە، هێرشی ئەكردە سەر هەموو شێوەیەكی مەزهەب، وەك ئەوەی خودا (كە بە بڕوای ئەو دواجار دەركەوت كە نیە) زیانێكی بەخودی خۆی گەیاندبێت. ڤۆڵتێر بە هاواری خەباتگێڕانەی «ئەم مایەی بەدناویە لەناو بەرن» تەنها نیشانەی لە پاپو رێكخستنەكانی كەنیسە نەدەگرتەوە، بەڵكو هێرشی ئەكردە سەر هەموو دەركەوتەكانی مەزهەب. رەنگە دواجار ڤۆڵتێر وەك كەسێكی بێ باوەڕ بە خودا كۆچی دوایی كردبێت.

هەنوكە ئەو پرسیارە دێتە پێشێ كە بۆچی زوربەی فەیلەسوفانی بەرجەستەی رۆشنگەری هەڵوێستێكی توندو سوكایەتپێكەریان بەرامبەر بە مرۆڤە رۆحانیەكان و بنەماكانی باوەڕیان هەبوو یان دەستیان بە گاڵتەپێكردنو لەكەداركردنیان ئەكرد؟ مەگەر ئەم فەیلەسوفانە بە لێكبوردنو مودارای عەقڵانیانەی خۆیانەوە نەئەنازینو بانگەشەی ئەوەیان نەئەكرد كە وەك پیاوانێكی دنیادیدە، لە لاوازیەكانی مرۆڤ تێئەگەن؟ مەگەر نە ئەوەی سەردەمی ئەشكەنجەو سوتاندنی ئەوانەی جۆرێكی تر بیر ئەكەنەوە بەناوی باوەڕی راستەقینەو تەفتیشی بیروڕاو جەنگە سەلیبیەكانەوە زۆری بەسەردا چووە؟ جەنگە پیرۆزە مەزهەبیەكانیش سەر بە رابردوو بونو كەنیسە هەم لە ئەوروپای سەدەی هەژدەدا كەمتازۆر پەیڕەوی بنەماكانی لێكبوردنو موداراكردن بوو (بەشێك لە فەیلەسوفانی رۆشنگەری وەك راینلو مابلێ، خۆیان قەشە بوون). ئەسقەفی مەزنی كانتربۆری لەگەڵ گیبۆنی كافری بەناوبانگدا، هاتوچۆی خێزانی هەبوو.

بەڵام بەرلەوەی دەست بە تاوتوێكردنی وردی ئەم بابەتە بكەین، ئەبێت دامێنو ئاڵۆزی تێڕوانینەكانی رۆشنگەری لەبارەی بنەماكانی باوەڕەوە رونبكەینەوە. تەنها ژمارەیەكی كەمی رۆشنگەرانی ئەم سەردەمە هەبوون كە ئەیانویست تێڕوانینی نادینی پەتی بكەنە جێگری باوەڕی مەزهەبی. بەڵام لە بەرامبەردا زۆرێكی تر لەگەڵ ئەوەشدا كە قەبوڵیان ئەكرد زانستو فەلسەفەی مۆدێرن پایەكانی «خوای مۆجیزەكەری» مرۆڤئاسایانەی مەسیحیەتیان لەرزاندووە، بەڵام خۆیان

بڕوایان بە جۆرێک بوونی پیرۆزی، دروســـتکەری میتا سروشـــت، عەقڵ و نیگارکێشـــێکی مەزنتر هەبوو. تەنانەت هیومی گومانکەر بڕوای وابوو کە ئەوە زۆر نەشـــیاوە ئەو ڕێکخســـتنەی لە جیهاندا هەیە بە بەرهەمی ڕێکەوت یان جوڵەی پێشهاتی ئەتۆمەکانی مادە بزانین. بەپێی تێگەیشتنی هیوم ئەگەری ڕودانی شـــتێکی لەمچەشنە، هەرئەوەندەیە کە شامپانزەیەک بە فشاری پەنجەکانی لەسەر پیتەکانی چاپ، بەرهەمەکانی شکسپیر دابهێنێت.

ســـەرەڕای ئەمە گەرچی زۆرێک لە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری هەڵوێستی دوژمنکارانەیان بەرامبەر بە «مرۆڤە ڕۆحانیە مەســـیحیەکان» و نەریتە پڕ ڕەونەقو هەراکانی کەنیســـە هەبوو، بەڵام خۆیان کەســـانی باوەڕدارو بـــڕوادار بوون. (لەم ئاراســـتەیدا) بناغەکانی بڕوای لۆژیکی فەیلەســـوفانی ڕۆشنگەری سویسری کە پەیڕەوی پرۆتستانیزم بوون، شایەنی ڕاوەستانە. هەندێک لە لێکۆڵەرەوان بڕوایان وابوو کە تەنانەت گیبون بەشـــێوەیەکی تەواو فـــەردیو تایبەتی مەزهەبی بووە. عاقڵترین ڕۆشنگەرانی ئەم سەردەمە بڕوایان وابوو کە خەسڵەتی مەزنانە، وا ئەخوازێت مرۆڤ ڕەچاوی ڕادەیەک لە هاودەنگی لەگەڵ نەریتە گشـــتیەکانی کەنیسەی فەرمیدا بکات، بەدەر لەوەی بڕوای پێ بێت یان نەبێت. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان ڕەفتارێکی وا شایستە، هاوکاری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و ئارامی کۆمەڵگا ئەکات. گیبون کە ڕەنگە کەســـێکی نامەزهەبی بوو بێت بەپێی نەریت ئەچوو بۆ کەنیســـا (ئەو دەیگوت بەشـــداریکردن لە نەریتەکانی»عەشائی ڕەبانی» و خوێندنەوەی تەوراتو ئەنجیل بە زمانی یۆنانی، زمانی دەوڵەمەند کردووە).

زۆرێک لە تیورەزانانی ڕۆشـــنگەری بڕوایان وابوو کە سیســـتەمێکی کۆمەڵایەتی ڕێکخراو ئەبێت خاوەنی جۆرێک دینی «مەدەنی» (civic religion) بێت — کەمتازۆر وەک مەزهەبی ڕۆمی دێرین- کە نیشـــتیمانپەروەری، گیانی دەستەجەمعیو فەزیڵەتە ئەخلاقیەکانی بڵاو ئەکردەوە. گیبون لەبارەی مەزهەبـــی ڕۆمی دێرینەوە ئەڵێت: خەڵکی بڕوای بە ڕاســـتی ئەم مەزهەبەوە هەبوو، فەیلەســـوفان ئەیانزانی ناڕاســـتەو فەرمانڕەوایانیش بە قابیلی سودوەرگرتنیان ئەزانی. بەپێی تێگەیشتنی گیبۆن ئیســـلام بە بەراورد لەگەڵ مەســـیحیەتدا دینێکی «مەدەنی» باشـــتری هێناوەتـــە ئاراوە، چونکە وەک مەســـیحیەت لـــە دنیا ڕانـــاکاتو دەزگای ڕۆحانیەتەکەی خاوەن زنجیـــرە پلەیەکی ئاڵۆز نیە. تێڕوانینی ڤۆڵتێر لەمبارەیەشـــەوە زۆر بەناوبانگە، بەپێی تێڕوانینی ڤۆڵتێر کارەکەرانی کەسیش- هاوسەرەکەشـــی- ئەبێت باوەڕدارو بە تەقوا بن، چونکە ئەگەر کەســـانی وا لە خوا نەترســـن، دارایی کەســـەکە ئەدزن یان خیانەتی لێئەکەن. لەبەرئەوە مەســـەلەیەکی وا هێندە سەرسوڕهێنەر نیە کە زۆرێک لە فەیلەســـوفانی ڕۆشـــنگەری بەرگریکاری سیســـتەمێکی مەزهەبی دوو لایەنە بوون، کە پێکهاتبێت لە مەزهەبێکی سادە، لۆژیکیو بێ خەوش بۆ دەستەبژێرەکان، و باوەڕێکی میلۆدراماتیک کە بتوانێت فیکرو هەســـتی چینە کۆمەڵایەتیەکانی خـــوارەوە فۆرمەلەو کۆنترۆڵ بکات. دواجار ئەم تێڕوانینانە لە سەردەمی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسادا وەک ڕێبازێکی لێهات کە زاتێکی باری تەعالای (Supreme Being) مۆدێرن، لۆژیکیو نامەســـیحی دروســـتبکات، وەک خوایەک کە قابیلی پەرستن بێت لەلایەن خەڵکەوە.

دواجار ئەبێت ئەوەمان لەبیر بێت کەمبون ژمارەی ئەو فەیلەسوفانەی رۆشنگەری کە بە قوڵی مەزهەبی بوون. ژان ژاک رۆسۆ بە تایبەتی لە دوا ساتەکانی ژیانیدا، چەندان شیعری لە ستایشی خەسڵەتی پاکژیدا نوسی کە زۆرتر ئیحساسیو رۆحی بوو تا رۆشنبیرانە. زانای گەورە ئینگلیزی، جۆزیف پرایستلی دۆزەرەوەی ئۆکسیجینو بیریارێک کە دارمانی ئەخلاقی مەسیحیەتی ئاشکرا کرد، یەکەم فەیلەسوف بوو کە پڕ لە سۆزی رۆشنگەری رایگەیاند پەروەردە، زانست، پیشەسازیو تەکنەلۆژیا، پێشکەوتنی بێ سنوری مرۆڤ بەدوای خۆیدا دێنێت. بەڵام هەر ئەم فەیلەسوفە باوەڕیبون بە کامڵبونی مرۆڤی لەژێر تیشکی بڕوابونی بە ئیمپراتۆری هەزار ساڵەی مەسیحیدا فۆرمەلەکرد.

پرایستلی زۆرترین تەمەنی خۆی وەک ئامۆژگارکارێکی ناتەقلیدی (nonconformist) بردەسەر کە مەیلی بە لای یەکتاباوەڕی (Unitarianism) دا هەبوو، (یەکتا باوەڕی نەک هەر تەسلیسی رەد ئەکردەوە، بەڵکو نکوڵی لە خوداوەندنێتی عیسا مەسیحیش ئەکرد، ئەراسمۆس داروین بە ئاوازێکی تەنزئامێز گوتوێتی «یەکتاباوەڕی وەک چارەسەرێک وایە کە ئەو مەسیحەتەی لە دارماندایە رزگار ئەکات». بیریارانی بەرجەستە بە تایبەتی لەو شوێنانەدا کە پرۆتستانیزم باو بوو- باکوری ئەڵمانیا، سکاندیناڤیا، ئینگلتەرا، سکۆتلەنداو کانتۆنە کالڤینیستەکانی سویسرا- مەیلێکی زۆریان بۆ دژایەتی مەسیحیەت خۆی لە خۆیدا (per se) یان مەزهەب بەشێوەیەکی گشتی نەبوو. وەسوەسەی سەرەکی ئەوان زۆرتر دەستگەیشتن بوو بە دەربڕینێکی پاکژ کراوو عەقڵانی باوەڕێک کە تەبا بێت لەگەڵ عەقڵ، زانستو ویژدانداو جگە لەمەش خاوەن بونیادێکی لۆژیکی بێت. خوێندکارانێکی زۆر هەبوون کە هۆیەکیان نەئەدۆزیەوە کە باوەڕێکی لەمچەشنە (مەزهەبی راستەقینە) بە رێگر لەبەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا دابنێن. ئەوان بڕوایان وابوو کە بە هەمان ئەو شێوەیەی لایەنگرانی لۆسەر لە بزوتنەوەی ریفۆرمی دینیدا، کەنیسەی سەدەکانی ناوەڕاستیان لە گەندەڵی ئەخلاقی پاک کردەوە، ئەوا ئەکرێت رەوتی پەرەسەندنی سەردەمی عەقڵیش لەرێگەی پاک کردنەوەی باوەڕەو رێبازی تازە لە خورافە پوچەکانی سەدەکانی ناوەڕاست (وەک بڕوابون بە ئاگری نەمری دۆزەخ) کە چیتر بیریارە پێشکەوتوخوازەکان بایەخێکیان بۆ دانەئەنا، بە ئەنجام بگەیەنرێت. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان ئەو بنەما دینیانەی لەسەردەمی نەزانیو تاریکیدا بناغەیەکی بایەخدار بوو بۆ دینداری مرۆڤ، بەهۆی پێشکەوتنی فکری مرۆڤەوە بەشێوەیەکی سروشتی لەناو ئەچێت.

لەم ئاراستەیەدا نوسینی «عەقڵانیەتی مەسیحیەت» (١٦٩) (The Reasonableness of Christinity) کە بەرهەمی جۆن لۆکە رێخۆشکەر بوو. لۆک بڕوای وابوو مرۆڤی بیرکەرەوە ئەبێت باوەڕدار بێت، رێک لەبەرئەوەی بنەماکانی دینی مەسیحی واتە بڕوابون بە دروستکەری دانا، بە توانا و میهرەبان، ئەرکی گوێ رایەڵیو پەرستنیو شتی دی.. هەمویان لەگەڵ عەقڵو ئەزموندا بە تەواوی ئەگونجێن. بە پێی روانینی لۆک مەسیحی بوون، پەیماننامەیەکی لۆژیکیە، بەڵام مەسیحی عەقڵانی لەسەر شانی نیە باوەڕی بەو رەگەزە دێرینانەی ئەم دینە هەبێت کە لەگەڵ عەقڵیدا ناکۆکە. بە بڕوای لۆک باوەڕی لۆژیکی پێویستی بە بازدانی نالۆژیکی نیە. بەمشێوەیە مەسیحیەت لەژێر ئاڵای

«دینــی لۆژیكی»دا كورتبۆتەوە بۆ كۆمەڵێك بنەمای كارا كــە قەبوڵكردنی بۆ خەڵكی خوێندەوار سادە بوو.

ســەرەڕای ئەمە پەیڕەوانی ئاڤانگاردی ئەمجۆرە شێوانەی «مەســیحیەتی لۆژیكی»، بەڵگەیان ئەهێنایەوە كە تاكەكەسە لۆژیكیەكان بۆ تێگەیشتن لە راستیە بنەڕەتیەكانی مەزهەب، پێویستیەكی ســەرەكیان بە بەرجەســتەبونی مرۆیی مەســیحو پەیامە ئنجیلیەكەی و ئەوانی دی نیە، بەڵام لە «دینی وەحیانی»دا بەو شــێوەیەی لــە تەوراتدا هاتووە، بۆ نفوزكردن لەناو خەڵكی رەشــوروتدا پێویستە (ئەمجۆرە روانینانە لەلایەن ئانتۆنی كۆلینز و «ئازاد بیرانی» ترەوە هێنرانە ئاراوە كە لە سەرەتاكانی سەدەی هەژدەوە لە ئینگلتەرا دەركەوتن).

بێگومان بۆ ئەوەی بیرئازادە رادیكالەكان لە دیدی ســەرەوە ســەروتر بــڕۆنو بەو دەرئەنجامە بگەن كە ئەو مەســیحیەتەی لەســەر ئینجیــل بونیاد نراوە، كاتێك لەگــەڵ عەقڵ و مێژوودا گرێ بدرێت، بەسادەیی بێ بناغەی خۆی ئاشكرا ئەكات، تەنها ئەبوو هەنگاوێكی بچوك بنێن. ئەوان ئەو پرســیارەیان ئەهێنایە ئاراوە كە ئەم بەناو «مۆجیزانەی» لە تەوراتو ئنجیلدا هاتووە، لەراســتیدا ئەفسانەو داستانگەلێك نین كە رۆحانیە زیرەكەكان بۆ ترساندنی جەماوەری نەخوێندەوار دروستیان كردووە؟ ئەوان بڕوایانوابوو زانســتی مۆدێرن فرتوفێڵی مرۆڤە رۆحانیەكانی ئاشــكرا كردووەو ئەم «رازو نیازانــە» روندئەكاتەوە. لێرەوە بیرئازادە رادیكالەكان ئەو ئەنجامگیریە ئەكەن كە هەوڵدان بۆ گونجانی مەســیحیەت لەگەڵ عەقڵدا، هەوڵێكی بێهودەیە. بەپێی تێگەیشــتنی ئەوان خوێندەواران ئەبێــت بەراشــكاوی ناعەقڵانیەتی خودی مەســیحیەت قەبوڵبكەن و جێگــرە لۆژیكیەكەی كە بە گشــتی بە دییزم (deism) ناو ئەبرێت، بخەنە جێگەی. دییزم باوەڕانی وەک جان تۆلندی ئیرلەندی كــە هاوچەرخی كۆلێنز بووە، و ڤۆلتێر (كە زۆرتر وەک فەیلەســوف بەناوبانگ بوو) بڕوایان وابوو بیركردنەوە لەبارەی رێكخســتنی بونەوە، بیركردنەوە لە «سروشــتەوە بۆ خوای سروشت» رێنمایی ئەكات. لێرەوە بڕوایان وابوو كە مەزهەبەكەیان «مەزهەبێكی تەواو سروشتی» بێت».

دیارە لای هەندێک لە بیریارانی ئەم ســەردەمە ســەرتر رۆیشتن لە مەســیحیەت بۆ «مەزهەبی سروشتی (natural religion) " بەمانای گەیشتن بوو بە «مەزهەبی سروشت» (religion of natural) . بناغــەی ئەرگۆمێنتەكانی ئەمجۆرە روانینە ئەوەیە كــە هیچ بەڵگەیەكی ماقوڵ بۆ باوەڕهێنان بە بونێكی هوشمەندو هوشیار یان زاتی باری تەعالا یان نیگاركێشی بەتواناو موتەعالی لە پشتو دوای سروشتەوە بونی نیە. بە پێی ئەم روانیە سروشت هەموو ئەو شتانەیە كە هەیە و ئەگەر شتێكیش هەبێت پیرۆز بێتو قابیلی پەرەســتن بێت خودی سروشــتە. بیركردنەوەی سپینۆزای فەیلەسوفی مەزنی ســەدەی حەڤدە، كە بڕوای وابوو «خودا»و «سروشت» یەک شتە، زۆر نفوزو رەواجی پەیدا كــرد. پاش ئەوە بارون دهلباخ لە «سیســتەمی سروشــت»دا (Systeme de la nature) (١٧٧١) بەشــێوەیەكی سەرەڕۆیانە جۆرێک فەلسەفەی خوا ناباوەڕی (atheism) یان گشت خواباوەڕی مادی (materialistis pantheism) دارشت كە هاوشێوەی بیركردنەوەی سپینۆزا بوو.

بەكورتی رۆشنبیرانی سەدەی هەژدا بە نیازی دۆزینەوە یان دروستكردنی مەزهەبێكی گونجاو بۆ

ســـەردەمی خۆیان بوون. مەسیحیەتی دێرین لانیکەم لە دیدی خوێندەوارانـدا، زۆر کەموکوڕ ئەهاتە بەرچـــاو. هەندێکیان هەوڵیانئەدا ئـــەم مەزهەبە پاک بکەنەوەو لەگەڵ عەقڵدا بیگونجێنن، هەندێکی تریش بەدوای ئەوەوە بوون جێگرێکی قابیلی قەبوڵکردنی بۆ بدۆزنەوە.

لەهەمانکاتدا ئەو پرســـیارە هەروا ئەمێنێتەوە کە بۆچی هەموو فەیلەســـوفانی رۆشـــنگەری بە تایبەتی فەیلەســـوفە فەرەنســـیەکان، هێندە بە ســـوکایەتیەکی بریندارکەرەوە تەماشای مەزهەبی مەســـیحیو کەنیســـایان ئەکرد. ئەوان بە گشتی قەشـــەکانیان بە تەماعکار، پیاوانی پیرۆزیان بە چڵێس و نەوسن، راهیبەکانو خاتونە راهیبەکانیان بە ناوبانگپەرست، زانایانی دینیان بە تەسکبینی توندڕەو، لێکۆڵیارەکانی کەنیســـەیان بە ئەشـــکەنجەدەرانی سادیســـتو پاپاکانیان بە شێتگەلێک خۆبەشتزان ئەزانی و گاڵتەیان پێئەکردن.

ئەمجۆرە هەڵوێســـتە تـــا ئەندازەیەک لەبەر ئەوە بـــوو کە ئەوان مەســـیحیەتی رێکخراویان بە ســـاختەکاریەکی بێ هەستو ساختچیانە دائەنا. ئەوان زۆرجار ئاماژەیان بۆ ئەوە ئەکرد کە تەنانەت پیاوانی پیرۆز خۆشیان بڕوایان بەو قسە پڕوپوچانە نیە کە ئەیڵێن، بەڵام وەک سیحربازە زیرەکەکان بە باشی ئەزانن کە وتاری درێژ (زۆرجار بە لاتینی)، جوڵەی زیرەکانەی دەستو نەریتەکان و بۆنە پڕ رەونەقەکان، جۆرێک دەســـەڵاتیان بۆ خەڵک نمایش ئەکرد. گیبۆن لە رونکردنەوەی گەشەکردنی رێکخستنە مەسیحیەکاندا لە ئیمپراتۆری رۆمدا ئەڵێت کە مەسیحیەکانی سەرەتا گروپێک خەڵکی دەمارگیر و سەرســـەخت بوون کە مەبەستیان بەدەســـتهێنانی دەسەڵات بوو بەهەر نرخێک بووە، و هیچ بەلاشیانەوە گرنگ نەبوو کە کارەکانیان چ دەرئەنجامێکی بۆ ئارامی کۆمەڵایەتی ئەبێت.

بۆ ئەم مەبەستە دەستڕۆیشتوەکانی کەنیسە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە دیدێکی کەلبی ئاسایانە بۆچونێکیان لەبارەی بەرزەخو شـــەفاعەتو بەخشینەوە دارشـــت و خەڵکی ئاساییان هەڵخەڵەتاند، لەبەرامبەر دوژمنانی کەنیسەدا جەنگیان راگەیاندو بوون بە دەوڵەمەندترین دەزگای ئەوروپا.

لەبەرئەوە فەیلەســـوفانی رۆشنگەری کە هەڵوێستێکی ناحەزانەیان بەرامبەر بە کەنیسە هەبوو، بڕوایان وابوو کە رۆحانیە مەسیحیەکان هەر نەزان یان بێویژدان نەبوون، بەڵکو بەراستی خەڵکانی بەد سروشـــت بوون. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان کەنیسا بەشێوەیەکی ریاکارانە ئامۆژگاری ئاشتیان ئەکرد، بەڵام لەکرداردا تۆوی جیاوازیو ناکۆکیان ئەناشـــت. دەریـــای خوێنی قوربانیەکانی جەنگە مەزهەبیەکانی ســـەدەی شـــانزەو حەڤدە، لە کەنارەوە تا کەنار بڵاوبوبۆوە. ڤۆڵتێر هەموو ســـاڵێک لە جەژنی برتهۆڵمی پیرۆزدا[1] بەجەســـتە لەخەو هەڵئەســـایەوە. فەیلەسوفانی رۆشنگەری بڕوایان بوو کە کەنیســـە تەنانەت لەم قۆناغانەدا (ســـەدەی هەژدە) بە تێزە ناماقوڵەکانی مەســـیحیەت، سروشتی مرۆڤیان توشی شڵەژان ئەکرد. بۆ نمونە پیاوانو ژنانی گەنج هەڵئەخەڵەتێنێت و رەوانەی پەرســـتگاکانیان ئەکاتو منداڵانیش بێهودە لە سزای ئیلاهی ئەترسێنێت. روداوەکەی کالاس Calase (١٧٦٢) بابەتێکی گونجاوی بۆ پڕوپاگەندەی فەیلەسوفانی رۆشنگەری رەخساند. کالاس خێزانێکی پرۆتســـتانتی خەڵکی تۆلۆز بوو. کوڕە گەورەکەی بە کوژراوی دۆزرایەوە. وا بڵاوبوبوە کە ئەم کوڕە ویستوێتی بچێتە سەر مەزهەبی کاسۆلیک و باوکی بۆ رێگرتن لەم ریسواییە، کوشتوێتی. دادگا کە

هیچ گومانێک لە سەلاحیەتی یاسایی نەبوو، باوکی بە گوناهبار دانا و حوکمی لە سێدارانی بەسەرا سەپاند.

ڤۆڵتێر دەســتیکرد بــە لێکۆڵینەوە لەم بابەتە. لە دیــدی ڤۆڵتێردا ئــەم روداوە بەدەر لەوەی راســتیەکەی چۆن بووە، خراپی ترسناکی دۆگمای مەزهەبی ئاشکرا ئەکات. ئەگەر باوکی خێزانەکە بەناوی پاراســتنی بڕوای پرۆتستانتەوە کوڕەکەی خۆی کوشتبێت، ئەوە ئەسەلمێت کە گروپکاری مەزهەبی بە چ شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئەتوانێت بەسەر سۆزی باوکایەتیدا سەرکەوێت. ئەگەر باوکی خێزانەکە بەڕاســتی بێگوناه بێت کە ڤۆڵتیر بڕوای بە بێگوناهی هەبوو، ئەوا لەم دۆخەدا بەدنیازی دروســتکەرانی ناکۆکیە دینیەکان ئەسەلمێنرێت کە وەک پەیامهێنەری ئاشتی بەخۆیانەوە ئەنازن. روداوی لەمجۆرە فەیلەســوفانی رۆشــنگەری وا لێئەکرد، کە ئەو وتەیەی لۆکرتیوس شاعیری رۆمی بهێنێتەوە کە ئەیگوت «چەند شتی دزێو هەیە کە مەزهەب وا لە خەڵک نەکات ئەنجامیبدەن».

ئەوەی فەیلەســوفانی رۆشــنگەری بەر لەهەر شــتێک تورە ئەکرد ئەوەبوو کەنیســە — کە بە ســامانەکەی خۆیەوە بوو بوو بە بار بەسەر ئابوری وڵاتەوە- هێشتا بیری خەڵکی کۆنترۆڵ ئەکردو خاوەن دەســەڵاتی سیاســی بوو. کەنیسەی کاسۆلیک بەشــێوەیەکی تایبەت رێبازە مەزهەبیەکانی تری هەروا بە نایاســایی ئەزانی. کەنیســە سیســتەمی پەروەردەی لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە تا دوا ناوەنــدی و زانکــۆی بۆ خۆی پاوان کردبوو (ڤۆڵتێرو دیــدرۆ هەردوکیان خاوەن خوێندنی باڵای یەســوعی بون و هەرگیز ئەو شــتانەیان بیر نەچۆوە کە لە کاتی خوێندندا بەســەریاندا هاتبوو). کەنیسە کتێبەکانیشی سانسۆر ئەکرد، بە شێوەیەک کە زوربەی بەرهەمەکانی بیریارانی رۆشنگەری لە لیســتی کتێبە قەدەغەکراوەکاندا بوو. کەنیســە لەو دادگایانەدا کــە بەناوبانگ بوو بە Causes celebres وەک دادگای گالیلۆ، رێگری پێشــکەوتنی زانســت بوو. نزیک سەدوپێنج ساڵ پاش ئەمە بافری زانای مێژووی زانســتە سروشــتیەکان، ناچاربوو لە زانکۆی سۆربۆن وەڵامی پیاوانی پیرۆز بداتەوە کە بۆچی لەوە کۆڵیوەتەوە کە زەوی کۆنترە لەوەی کە لە ئەنجیلدا هاتووە. لە جێگای وەک ئیسپانیا کە تەختو تاج و شمشێریان بە میحراب سپاردبوو، راوەستانێکی زانستیو فکری ترسناک باڵادەســت بوو. پێشــکەوتنی کۆمەڵایەتی تەنها لە وڵاتانی وەک هۆڵەنداو ئینگلتەرادا کە کەنیســە بەهۆی پیاوانی دەوڵەتەوە پەرو باڵیان کرابوو، بەشێوەیەکی دڵنیا بەرەو پێش ئەرۆیشت.

دواجار ئەوەی کە هێرشــی بێ پەروای فەیلەسوفانی رۆشــنگەری بۆ کەنیسە، لەژێر کاریگەری ئەزمــونو هەلومەرجی تایبەتی خۆیاندا بوو. ئەوان بەڵگەیان ئەهێنایەوە کە لە ســەردەمی رەشــی ســەدەکانی ناوەڕاســت بەدواوە، کەســە رۆحانیەکان بەســەر روداوە فکریەکاندا باڵادەســتبوونو کۆنترۆڵیان کردبوو، و دەوری پۆلیســی بیرکردنەوەیان ئەبینی. بەڵام هەلومەرجەکە لە گۆڕاندا بوو، لەگەڵ بەرزبونەوەی ئاستی خوێندەواری، گەشەکردنی پەروەردەو بڵاوبونەوەی زیاتری کتێب، توێژی نوێی رۆشــنبیرانی نادینی توانی پێگەی خۆی بەهێزتر بکات و لەســەر ســەرنج راکێشانی زیهنی خەڵک، لەگەڵ روحانیەکاندا کێبەرکێ بکاتو تەحەدایان بکات. فەیلەســوفانی رۆشــنگەری خۆیان لەریزی پێشــەوەی ئەم گروپە لە نوســەرانو بیریاران دائەنا. لەمڕووەوە خوازیاری ئازادی رادەربڕین

بوونو ئەیانویست وەک قسەکەرانی مۆدێرنیزم ببنە جێگری مرۆڤە رۆحانیەکان.

بیریارانی رۆشـــنگەری لە خەباتدا دژی «مایەی بەدناوی» (مەســـیحیەتی کلاسیکی) رەوتێکی تازەیان خســـتە بـــەردەم بیرکردنەوەی ئەوروپـــی. داواکاری دیاریکراوی ئـــەوان کۆتایهێنان بوو بە سانســـۆر و جیاکاری. ئەوان پێشـــکەوتنی پیشەســـازی چاپیان وەک تەکنەلۆژیایەکی بەراســـتی ئازادیخـــواز رێـــز ئەگرت. گاڵتەجاڕی ئەوەیە کە ئەوان بە نۆبەتی خۆیان پێیان ئەخســـتە جێی پێی هەمان ئەو رۆحانیەتەی کە نیازیان بوو لەبریان دانیشن. ئەوانیش داروەدەستەو «ناوەندی پیرۆزی» خۆیان پیشـــاندا و هەندێکیشیان شەیدای نەریتی نهێنیانەو غەیبی بوون. زۆرێک لە فەیلەسوفانی رۆشـــنگەری، بەشـــێک بوون لە یەکەمینو پڕ حەماســـەتترین ئەندامانی ژوری فەراماسیۆن بوون کە لەو ســـەردەمەدا تازە دروســـت بوو بوو. ئـــەم ژورانە ئەنجومەنگەلێکی نهێنـــی گەورەزادەکان و ناوەندگەلێک بوون بۆ هاودڵیو پەیوەســـتبوونی برایانە کە بە تەشـــریفاتی سەیروسەمەرە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی پتەوتر ئەکرد. تەشـــریفاتێک کە زۆرتر لاســـایکردنەوەی گاڵتەئامێزی تەشـــریفاتی کەنیسە بوو. هەندێک لە بیریارانی رۆشـــنگەری بڕوایان وابوو کە بوونی مەزهەب وەک «تریاکی جەماوەر» پێویســـتە. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا دروشـــمی «ئەم مایەی نەنگیە لەناوبەرن» کە دەنگدانەوەی هاواری تۆڵەئامێزی جیهادیە ســـەلیبیەکان بوو، ئەمجارە لەرێگەی فەیلەســـوفانی تەحەداکەری ئەم سەردەمەوە دوبارە ئەکرایەوە.

لێرەوە دەکرێت بەکورتی بگوترێت گروپی بچوکی فەیلەسوفانی رۆشنگەری لە هەوڵی دروستکردنی مەزهەبێکی تازەدا بوون، مەزهەبی هیومانیزم (Religion of humanity). لەگەڵ هەموو ئەمانەشـــدا ئەبێت ئەو راســـتیە بڵێین کە ئەبێت سەدەی هەژدە وەک قۆناغێکی سەرەکی سەردەمی عەلمانیەت (Secularisation)ی ئەوروپا دیاری بکرێت، گۆڕانێک کە لانیکەم ســـەرەکیترین باسەکانی بەهۆی فەیلەسوفانی رۆشنگەریەوە داڕێژرا، کە لە فەسڵی کۆتاییدا زۆرتر باسی ئەکەین

## پەراوێز:

١- St Bertholommew جەژنـــی برتهۆڵـــم: ئەو جەژنەی کە مەســـیحیە کاســـۆلیکەکان لە ٢٤ ئوتی هەر ســـاڵێکدا بە بۆنەی یادی برتهۆڵمی حەواریەوە بەرپایان ئەکرد. لە کلتوری جوتیاریدا ئەم جەژنە کە بە جەژنی کوشـــتار ناوئەبرێت، گرنگیەکـــی تایبەتی هەیە چونکە خەڵکی لەم رۆژەدا خۆیان بـــۆ کارە پایزیەکان ئامادە ئەکرد، بەپێی نەریت خەڵکی لەم جەژنەدا کارەکەراکانی خۆیان دارکاری ئەکرد.

## سەرچاوە:

وەرگێرانی فەسڵی چوارهەمی ئەم کتێبەی خوارەوە
روی پورتەر: مقدمەای بر روشن نگری. ترجمە: سعید مقدم. تهران– اختران ١٣٨٧

# ئۆردووگا چییە؟

جۆرجیۆ ئاگامبێن
لە فارسییەوە: مەنسوور تەیفووری

ئـــەوەی لە ئـــوردووگا یان کەمپەکاندا روویدا لە چەمکی مافناســـانەی تاوان تێدەپەڕێ، ئەویش تا ئەو رادەی کە ئەو بونیادە سیاســـی — مافناســـانە تایبەتەی ئەو رووداوانە لە[ناوکۆیی] ئەواندا روویانـــدا بەزۆری بەبێ هیـــچ لێکدانەوەیەک وەلانرا. کەمپ ئەو جێگەیەکـــە تێیدا رەهاترین دۆخی نامرۆیی(condition inhumana) کە تا ئێســـتا لەســـەر گۆی زەوی دەرکەوتـــووە، روویدا: ئەمە لە دواییـــدا هەموو ئەو شـــتەیە کـــە قوربانیان و کەســـانی دوای ئەوانیش گرنگی پێـــدەدەن. من لەم نووسینەدا بە ئەنقەست رێگەیەکی پێچەوانە دەگرمە بەر. واتە لەباتی هەڵهێنجانی پێناسەی کەمپ لەو رووداوانەی کە تێیدا روویانداوە، دەپرســـم: کەمپ چییە؟ بونیادە سیاســـی — مافناســـانەکەی کامەیە؟ چۆن هەلی قەومانی ئەو جۆرە رووداوانە لەوێدا رەخســـا؟ ئەم جۆرە پرسیارکردنە رێگەمان پێـــدەدات کەمپ نەک وەک فاکت و راســـتییەکی مێژوویی و جۆرێک شـــێوان کـــە بە هەرجۆر هی رابردووی ئێمەیە- ئەگەرچی بێگومان هێشـــتا لەگەڵمانە- بەڵکوو، بە جۆرێک، وەک چوارچێوە و یاسای شاراوەی ئەو فەزا سیاسیە سەیر بکەین، کە هێشتا تێیدا دەژین.

مێژوونووســـان لەســـەر ئەوە کۆک نین کە ئاخۆ یەکـــەم دەرکەوتنی کەمپـــەکان ئوردووگاکانی نیشتەجێکردنی زۆرەملێن (campos de concentration) کە ساڵی ١٨٩٦ پۆلیسی ئیسپانیا لە کووبا بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینی خەڵکی ئەو کۆلۆنیەی کردیەوە، یان یەکەم دەرکەوتنی کەمپ بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم و ئەو کەمپی نیشتەجێکردنە زۆرەملێیانە (concentration camp)دەگەڕێتەوە کە ئینگلســـتان بۆئێرەکانی(Boers) تێدا کۆکردەوە. لێرەدا کێشەی ســـەرەکی ئەمەیە کە لە هەر دوو

نموونەکە[ی سەرەوە]دا ئاگامان لە کشانی سنووری کێشەکەیە بۆ کۆی حەشیمەتی مەدەنی دۆخێکی نائاسایی کە بە جەنگێکی کۆلۆنیالییەوە پەیوەستە. کەمپەکان، بە وتەیەکی دیکە، لە ناخی یاسای ئاساییەوە نەهاتنە دەرەوە — وەک لەوانەیە هەندێک تێبگەن — بەرهەمی وەرچەرخان و گەشەی یاسای زیندانیش نەبوون؛ بەڵکوو، ئەم کەمپانە لە دۆخی نائاسایی و راگەیاندنی دۆخی سەربازیی نائاساییەوە (martial low) لەدایکبوون. لە نموونەی کەمپی نازییەکاندا (Nazi Lager) کە ریشە و رژێمە مافناسانەکەی تۆمارکراوە، ئەم لەدایکبوونە روون و راشکاوتریشە. هەمووان دەزانین کە بنەڕەتی مافناسانەی دەستبەسەرکردن نەک یاسای ئاسایی بەڵکوو زیاتر schutzhaft (بە مانای سەرزارەکیی: گرتن بۆ پاراستن) بووە، کە دامەزراوەیەکی مافناسانە بوو کە رەچەڵەکی بۆ خولی پاشایەتی پرووس دەگەڕایەوە و دادوەرانی نازی جارجار وەک پێوەرێک بۆ بەکارهێنانی چاودێریی پێشگرانە سەیریان دەکرد، چونکوو رێگەی پێدەدان بەبێ هیچ کردەوەیەکی تاوانکارانەی دیاریکراو و تەنیا بە مەبەستی پاراستنی دۆخی ئاسایشی هەر کەسێک "دەستبەسەر بکەن". بەڵام بنەڕەتی schutzhaft لە یاسای پرووسدا بۆ ئەو دۆخە سەربازییە دەگەڕێتەوە کە ٤ ی مانگی جوونی ١٨٥١ راگەیەندرا و ساڵی ١٨٧١ بۆ هەموو ئاڵمانیا (جگە ویلایەتی باڤاریا) تەشەنەی کرد، بنەڕەتێکی دیکەش یاسای پێشووتری پرووس بوو سەبارەت بە "پاراستنی ئازادیی فەردی" کە ١٢ ی فێڤریەی ساڵی ١٨٥٠ دەرکرا. ئەم دوو یاسایەش، بە درێژایی جەنگی یەکەمی جیهانی بە فراوانی کاریان پێکرا.

بۆ تێگەشتنی دروست لە چییەتی کەمپ، چەندە باسی پێوەندیی دامەزرێنەرانەی نێوان دۆخی نائاسایی و کەمپی کار و نیشتەجێکردنی زۆرەملێ بکەین، کەممان گوتووە. سەیریش ئەوەیە بە رێکەوت "پاراستن"ی ئازادی، کە لە schutzhaft دا باسیدەکرێت، مانای پاراستنە بەرامبەر هەڵواسرانی یاسا کە دیاریکەری دۆخی نائاساییە. خاڵی نوێی ئەم باسەش ئەوەیە دامەزراوەی schutzhaft هەر لە رێگەی ئەو دۆخە نائاساییەوە کە خۆی لە سەری دامەزراوە، هەڵدەوەشێتەوە و هەلی بۆ دەڕەخسێت لە دۆخی ئاساییشدا بەردەوام و لەکاردا بێت. کەمپ فەزایەکە کاتی کرانەوەی ئەو کاتەیە کە دۆخی نائاسایی بەرەبەرە دەگۆڕێت بۆ رێسا (rule). لە ئوردووگادا، دۆخی نائاسایی کە لە بنەڕەتدا مانای هەڵواسرانی کاتیی دۆخی یاسایی بوو، جۆرێک رێکخستنی شوێنداری هەمیشەیی وەردەگرێت کە، بەم جۆرە، بەردەوام لە دەرەوەی دۆخی ئاسایی یاسادا دەمێنێتەوە. کاتێ لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٣٣ دا هیملێر بۆ پیرۆزکردنی بۆنەی هەڵبژێراردنی هیتلەر بۆ جێگرایەتی رایش، بڕیاری دا "کەمپێکی کاری زۆرەملی بۆ زیندانیانی سیاسی" لە داخائۆ بکاتەوە، کەمپەکە خێرا سپێردرایە ئێس. ئێس و بە بوونی schutzhaft یش چووە دەرەوەی سنووری یاسای تاوان و یاسای زیندان و، نە ئەوکات و نە دواتریش نەچووەوە سنووری ئەم یاسایانە. کەمپی داخائۆ و، ئەو کەمپانەش کە دواتر هاتنە پاڵی (زاکس هاوزن، بووخن والّد، لیشتنبێرگ) بە کردەوە هەمیشە کراوە مانەوە: بڕی زیندانیەکان دەگۆڕا و لە هەندێ خولی تایبەتدا (بەتایبەت لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥ بۆ ١٩٣٧ و پێش دەستپێکردنی دەرکردنی جووەکان) ژمارەیان بۆ ٧٥٠٠ کەس دابەزی؛ بەڵام کەمپ خۆی

گۆڕابوو بۆ ڕاستییەکی هەمیشەیی لە ئاڵمان.

پێویســـتە لە پێگەی دۆخی پارادۆکسیکاڵی کەمپ وەک شوێنی دۆخی نائاسایی ڕامێنین: کەمپ پارچەیەکە لە هەرێم (territory) کە لە دەرەوەی دەستووری مافناسانەی(juridical order) ئاسایی هەڵکەوتووە، کەچی بەمانەشـــەوە، کەمپ تەنیا شـــوێنێکی دەرەکی[ یان لە دەرەوە] نییە. بەپێی واتای ڕیشەناســـانە یان ئێتیمۆلۆژیکـــی زاراوەی نائاســـایی(ex- capere)[ دەرەوە- گرتن یان دەر — نـــان] ئـــەوەی لە کەمپدا لادەبرێ یان دەردەکرێ، لە دەرەوە بەدیل دەگیرێت، واتە ڕێک لە ڕێگەی لابردنیەوە لەخۆدەگیرێت. بەم شـــێوەیە، ئەو شـــتەی لە ژێر حوکمی یاسادا داگیر یان دیل دەکرێت پێش هەموو شـــتێک ڕێک دۆخی نائاســـاییە. بە وتەیەکی دیکە، ئەگەر هێزی حاکم لە سەر توانا بۆ بڕیاردان لە سەر [ڕاگەیاندنی] دۆخی نائاسایی وەستابێت، کەمپ ئەو بونیادەیە کە تێیدا دۆخی نائاســـایی بۆ کاتێکی هەمیشـــەیی بەدیهاتووە. هانا ئارێنت جارێکیـــان وتی ئەوەی لە کەمپەکاندا ئاشـــکرا بوو ئەو بنەمایەیە کە پشـــتی دەســـەڵاتی توتالیتەرە و ئەقڵی ئاســـاییش لاسارانە مل لە داننـــان پێیدا بادەدات، واتە ئەم بنەمای کە بەپێی ئەو هەموو شـــتێک ئەگەری هەیە. تەنیا لەبەر ئەوەی کەمپەکان بونیادنەری فەزای نائاســـایین — فەزایەک کە تێیدا یاســـا بەتەواوی هەڵدەواسرێ - تێیاندا ئەگەری ڕوودانی هەموو شـــتێک هەیە. ئەگەر لەم بونیادە سیاسی —مافناسانەیەی کەمپ تێنەگەین، کە ڕاســـپاردەکەی ڕێک بەدیهێنانی هەمیشەیی[دۆخی] نائاساییە، ناتوانین لەو ڕووداوە لەئەقڵبەدەرانە تێبگەین کە لە کەمپەکاندا ڕوویداوە. ئەو خەڵکەی چوونە کەمپ، لە جۆرێک ناوچەی نەناســـرانەوە (zone of indistinction) دا لە نێوان دەرەوە و ناوەوە، ڕیزپەڕ و ڕێســـا، ڕەوا و ناڕەوادا ســـەرگەردان بوون، ناوچەیەک کە تێیدا هیچ پشتگیرییەکی مافناسانە لەئارادا نەبوو؛ وەکیتر، ئەم خەڵکە ئەگەر جوو بوونایە، پێشـــتر و بەپێی یاســـاکانی نۆرمبێرگ لە مافـــی هاوڵاتیەتی بێبەش کرابوون و، دواتر لە کاتی "دواچارە" دا [پرۆژەی چارەی کێشەی جوو لە ئاڵمانیا کە مەبەست لێی لە هاوڵاتیەتی و دواتر لە نەتەوایەتیخستن و دواتر قڕکردنیان بوو] بە تەواوی لە نەتەوایەتی داماڵران. ئەوەندەی کە دانیشـــتوانی کەمپ لە هەر چەشـــنە پێگەیەکی سیاســـی بێبەش کراون و بە تەواوی بۆ ژیانی ڕووت دابەزێنراون، کەمپ هێشـــتا ڕەهاترین شـــوێنی بیۆلۆژیکە کە تا ئێستا بەدیهاتبێت — شوێنێک کە تێیدا دەسەڵات بێ هیچ ناوکۆییکەرێک جگە ژیانی بیۆلۆژیکی ڕووتی ڕەبەق لەگەڵ هیچ شتێکی دیکە ڕووبەڕوونابێتەوە. کەمپ خۆی پارادایمی زاڵی سەر فەزای سیاسیە، ئەویش ڕێک لەو خاڵەدا کە سیاسەت دەگۆڕێت بۆ ژیان- سیاسەت(biopolitics) و هۆمۆساکێر چیدی لە هاوڵاتی ناناســـرێتەوە. بەم پێیەش، پرسیاری ڕاســـت سەبارەت بەو شـــتانەی لە کەمپەکاندا ڕوویاندا ئەم پرسیارە درۆزنانەیە نییە کە چۆن کرا تاوانی هێند گەورە بەرامبەر مرۆڤی دیکە بکرێت؛ ڕاستگۆیانە و زیـــاد لـــەوەش بەکەڵکتر ئەوەیە بە وردی لەوە بکۆڵرێتەوە کە چۆن — واتە بە پشـــتی کام ڕەوتی مافناسانە و ڕێگەی سیاسی — کرا مرۆڤەکان بەم شێوە لە هەموو ماف و پێگەیەک بێبەش بکرێن، ئەویش تا ئەو ڕادەیەی کە چیدی کردنی هەموو کارێک بەرامبەریان بە تاوان دانەنرێت( لە ڕاستیدا، لەم خاڵەدا، ئەگەری هەموو شتێک هەبووە).

ئەگەر باســەکە بەم شێوەیەیە، ئەگەر چییەتی کەمپ بریتیە لە جەستاندنی دۆخی نائاسایی و لە ئەنجامیشدا خولقاندنی شوێنێک بۆ ژیانی رووت بە گشتی، کەواتە کەی بونیادێکی لەم چەشنە درووست دەکرێت، دەکرێ دان بەوەدا بنێین کە لەگەڵ کەمپێک رووبەڕووین، جودا لە چییەتی ئەو تاوانانەی لە نێو کەمپەکاندا روویدابێ و لە دەرەوەی هەرچەشنە ناو و تۆپۆگرافی یان نەخشەهەڵگرت نەوەیەکی تایبەت کە هەیبێت. ئەو یاریگەی فوتباڵەی شاری باری (Bari)کە پۆلیسی ئیتالیا ساڵی ١٩٩١ پەنابەرانی نایاســایی ئالبانیایی بۆ ماوەیەک پێش گێڕانەوەیان تێدا کۆکردەوە، ئەو گۆڕەپانی دووچەرخەیەی کاربەدەســتانی حکوومەتی ویشــی لە فەرەنســا جووەکانیان پێش رادەستکردنیان بە ئاڵمانیەکان تێدا کۆکردەوە، کەمپی پەنابەرانی نزیک ســنووری ئیســپانیا کە ئانتۆنیۆ ماچادۆ ســاڵی ١٩٣٩ تێیدا مرد، وەکی‌تر شوێنی چاوەڕێکردن لە فڕۆکەخانە نێونەتەوەییەکانی فەرەنسا کە بیانیانــی داواکاری پەنابەریی تێدا رادەگیرێت، هەموویــان دەبێ بە کەمپ دابنرێن. لە هەموو ئەم نموونانەدا، شــوێنێکی ســوکنادەر (وەک ئوتێل ئاکاردی نزیک فڕۆکەخانەی پاریس) لە راســتیدا ســنوورەکانی ئەو شــوێنە دیاریدەکات کە تێیدا، جا بە هەر مەبەســتێک بێت، دەسەڵاتی ئاسایی یاســا هەڵدەواسرێت، شــوێنێک کە تێیدا لەوانەیە روودان یان روونەدانی کارەسات نەک گرێدراوی یاســا، بەڵکوو گرێدراوی مەدەنیبوون و ژیریی ئەخلاقی پۆلیسە، ئەو پۆلیسەی بۆ ماوەیەکی کاتی لە جێگەی حاکم دانیشــتووە. بۆ نموونە، لەو چوار رۆژەشــدا کە بڕیــارە بیانیەکان، پێش هاتنە کایەی دەسەڵاتە دادوەریەکانی فەرەنسا، لە شوێنی چاوەڕێکردن دابنرێن، باسەکە هەر بەم شێوەیە. بەم مانا، تەنانەت هەندێ ناوچەی پەراوێزی شــارە گەورە پاش‌پیشەســازیەکان و هەروەها کۆمەڵە دەروازەدارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی هەنووکەش بەرەبەرە رەنگی کەمپ وەردەگرن، واتە شــوێنێک تێیــدا ژیانی رووت و ژیانی سیاســی، لانیکەم لە هەندێ چرکەی دیاریکــراودا، دەچنە ناوچەیەکی دیارینەکراوییەوە.

لــەم ئاســۆگەوە، لەدایکبوونــی کەمپ لە خولی ئێمــەدا، وەک دیارە رووداوێکە کە بێ ســێ و دوو تەعبیر لە شــوێنی سیاســیی مۆدێرنێتــی دەکات. ئەم لەدایکبوونە ئەو کاتــە روودەدات کە سیســتمی دەوڵەت، نەتەوەی مۆدێرن — واتە ئەو سیســتمەی لە سەر پێوەندیی کارکردیانەی نێوان جۆرێک شــوێندارکردنێکی دیاریکراو(هەرێم یان قەڵەمڕەو) و دەســتوورێکی دیاریکراو دامەزراوە و رێکخســتنێکی خۆبەخۆ بۆ تۆمارکردنــی ژیان(لەدایکبوون یان نەتــەوە) یارمەتیدەدات- دەچێتە خولێکی نەپســاوەی قەیرانەوە و دەوڵەت بڕیاردەدات راســتەوخۆ و وەک ئەرکی خۆی بەڕێوەبردنی ژیانــی بیۆلۆژیکی نەتەوە بەدەســتەوە بگرێت. بە وتەیەکی دیکە، ئەگــەر بونیادی دەوڵەت نەتەوە بە ســێ توخمی هەرێم، دەســتوور و لەدایکبوون پێناسە دەکرێت، ئەوســا چیدی هەڵوەشانەوەی نۆمووس یان یاســای کۆن لەو دوو لایەنەدا روونادات کە لای کارل ئیشــمیت ئەم یاسایەیان بونیاد دەنا(واتە شــوێنداریی یان دەســتگرتن بە سەر شــوێنێکدا Ortung و، دروستکردنی دەستوور Ordnung) بەڵکوو چیدی لەو شــوێنەدا روودەدات کە تێیدا ژیانی رووت لە ســەر ئەم دوو لایەنە تۆماردەکرێت( واتە ئەو جێگەی تۆمارکردن لەدایکبوون دەگۆڕێت بۆ نەتەوە). لێرەدا شــتێک هەیە

کە چیدی لەو میکانیزمە نەریتیانەدا کار ناکات کە بۆ ڕێکخستنی ئەم تۆمارکردنە بەکاردەهێنران و، کەمپ ڕێکخەری نهێنیی نوێی تۆمار و هەڵکۆڵینی ژیانە لە سەر دەستوور یان، زیاتر لەوەش، کەمپ نیشانەی ناتوانایی سیستەمە لە کارکردندا بە بێ گۆڕان بۆ ماشینێکی مەرگاوی. گرنگە بیرمان بێت کەمپەکان هەر ئەو کاتە دەرکەوتن کە یاسا تازەکانی هاوڵاتیەتی و داماڵینی لە نەتەوایەتی هاوڵاتیان دەرکران (نەک هەر یاساکانی نۆرمبێرگ سەبارەت بە هاوڵاتیەتی لە رایش، بەڵکوو هەروەها ئەو یاسایانەی لەنەتەوایەتیخستنی هاوڵاتیان کە لە لایەن زۆربەی دەوڵەتانی ئەورووپییەوە درکرا، بە فەرەنساشەوە لە نێوان سالانی ١٩١٥ بۆ ١٩٣٣دا). دۆخی نائاسایی، کە لە بنەڕەتدا بۆ هەڵواسرانی کاتیی دەستوور بەکاردەهێنرا، ئێستە دەبێتە ریزبەندیی و ڕێکێتییەکی شوێنیی نوێی بەردەوام کە هەر ئەو ژیانە رووتەی تێدا نیشتەجێیە کە بەرەبەرە چیدی ناتوانێ لە ناوکۆیی دەستوور [ قانوون] دا تۆمار بکرێت. درزی روو لە قووڵبوونەوەی نێوان لەدایکبوون (ژیانی رووت) و دەوڵەت — نەتەوە هەمان واقیعی نوێی سیاسەتی خولی ئێمەیە و ئەو شتەی پێی دەڵێن کەمپ هەر ئەم دابڕان و لەتبوونەیە. هاوشانی دەستوورێکی بێ شوێنداریی (واتە دۆخی نائاسایی کە تێیدا یاسا هەڵدەواسرێت)، ئێستە ئاگامان لە شوێندارکردنێکی بێ دەستوورە (واتە کەمپ وەک شوێنی هەمیشەیی ریزپەڕ یان نائاسایی). سیستەمی سیاسی، چیدی شێوەکانی ژیان و نۆرمە مافناسانەکان لە شوێنێکی دیاریکراودا دانامەزرێنێت، بەڵکوو سیستەمی سیاسی لە ناخی خۆیدا هەڵگری جۆرێک شوێنبەندیی تێکدەری شوێنە کە لەم سیستەمە پێشدەکەوێ و تێیدا هەر شێوەیەکی ژیان و هەر نۆرمێک قابیلی بەدیلگرتنە. کەمپ کە مەبەست لێی بەدیهێنانی جۆرێک شوێنبەندیی تێکدەری شوێنە، هەمان چوارچێوەی نهێنیی ئەو سیاسەتەیە کە ئێمە هێشتا تێیدا دەژین و، دەبێ فێر بین چۆن لە هەموو کەوڵگۆڕینەکانیدا بیناسینەوە. کەمپ توخمی چوارەمی دانەبڕاوە کە بە سیانەی کۆنی نەتەوە (لەدایکبوون)، دەوڵەت و هەرێم زیاد بووە و هەڵیوەشاندووەتەوە.

دەرکەوتنەوەی کەمپەکان لە خاکی یۆگۆسلاڤیای کۆندا و ئەویش لە شێوەیەکدا کە، بە مانایەکی تایبەت، ئێجگار توندترە، دەبێ هەر لەم روانگەوە سەیر بکرێن. ئەوەی لەوێ خەریکە روودەدات، بەپێچەوانەی ئەو شتەی هەندێ داوەری پشکدار رایانگەیاند، بە هیچ شێوەو جۆرێک پێناسەکردنەوەی سیستەمی سیاسیی کۆن بە پێی ڕێکخستن و ریزبەندیی ئەتنی و سەرزەمینی نییە، واتە دووپاتکردنەوەی کوت و متی ئەو پرۆسانەی کە لە یاساکانی وڵاتانی ئەورووپیدا بە لووتکەی خۆی گەشت. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، ئێمە لەوێ ئاگامان لە جۆرێک لێکترازانی نەگەڕاوەی یاسا (nomos) ی کۆن و، هەر بەم رادەیەش، لە- شوێن- دەرکردن و هەڵتەکاندنی (dislocation) ی دانیشتوان و مرۆڤە بە ئاراستەیەکی بە تەواوی نوێ و نەناسراودا. لەبەر ئەمەشە کە کەمپەکانی دەستدرێژیی و پاکتاوی رەگەزی هێند چارەنووسساز، گرنگن. ئەگەر نازیەکان هیچ کات بیریان لەوە نەکردبێتەوە کە "دواچارە" لە ڕێگەی ئاوسکردنی ژنانی جووەوە بەڕێوەببەن، لەبەر ئەوەیە کە بنەمای لەدایکبوون، واتە ئەو بنەمای زامنی تۆمارکردنی ژیان بوو لە ناوکۆیی سیستەمی دەوڵەت نەتەوەدا، هێشتا لە هەندێ لایەنەوە کاری دەکرد، ئەگەرچی بە قووڵی وەرچەرخابوو. ئەم بنەمای

ئێستە مۆلەقە: ئەم بنەما ئێستە چۆتە نێو جۆرێک پرۆسەی لە-شوێن — دەرکردنەوە کە تێیدا بە ئاشکرا بەرەبەرە کارکردنی نەکردە دەبێتەوە، ئەو پرۆسەی دەتوانین تێیدا نەک هەر چاوەڕێی کەمپی نوێ، بەڵکوو چاوەڕێی پێناســەی نۆرماتیڤی هەردەم نوێ و شــێتانەتر لە تۆمارکردنی ژیان لە نێو دەوڵەتشاردا بکەین. کەمپ، کە ئێستا بە پڕی و پتەوی لە نێو دەوڵەتشاردا نیشتەجێبووە، قانوون یان نامووسی ژین سیاسیی نوێی گۆی زەوییە.

## یادداشتی وەرگێڕ:

ئەم وتارە بەشــێکە لە کۆمەڵە وتارێکی کورتی ئاگامبێن بە ناوی " کەرەستە بێ مەبەستەکان: هەندێ یادداشــت ســەبارەت بە سیاسەت" کە دواتر لە پرۆژەیەکی ٣ بەشیدا لە سەرەتاکانی ئەم دەیەی دواییدا بە پوختی راڤەی کردوون. ناوەرۆکێکی گشــتی کارەکانی ئاگامبێن ناوکۆیی کارەســاتی جووەکان و داماڵرانی مرۆڤەکانە لە مافە سیاســیەکان و گۆڕانی ژیانی بەهاداری مرۆیی بۆ ژیانی رووتە کە تێیدا هیچ یاسایەک قوربانی ناگرێتەوە و مرۆڤ تێیدا دەگۆڕێت بۆ هۆمۆســاکێر، واتە ئەوەی بە پێی یاســاکانی رۆمی کەونارا پیرۆزە بەڵام کوشتنی ناچێتە چوارچێوەی یاساوە و سزای نییە، چونکوو ژیانێکە لە دەرەوەی پۆلیس یان هەمان دەوڵەتشارەوە. گەڕانێکی دیکەی ئاگامبێن گەڕانە بۆ پارادایم یان سەرچەشنەکانی ژیان و سیاسەتی هەنووکەیی و ئاگامبێن لە سیمای پەنابەراندا ئەم پارادایمە نوێیە دەدۆزێتەوە کە بەرای ئەو بەرەبەرە شوێنی ژیانــی سیاســیی مرۆڤ خەریکە دەگۆڕێت بۆ ئەو شــوێنە، ئەم پارادایمــە لای ئاگامبێن و بە پێچەوانەی میشێل فۆکۆ کە زیندانی بە پارادایمی زاڵ دەزانی، کەمپ یان ئۆردووگایە، ئۆردووگا وەک شوێنێک کە تێیدا ژیانی سیاسی و بەهادار لەکار دەکەوێ و دەگۆڕێت بۆ ژیانی رووت و هاوڵاتی دەگۆڕێت بۆ هۆمۆساکێر. لە ئاگامبێن، پێشــتر وتاری "ئێمەی پەنابەر" هەر لەم کتێبە و ٣ دەقی دیکە لە کۆمەڵە وتارێکدا بە ناوی" نەرێکار" بە وەرگێرانی وەرگێڕی ئەم دەقە و برایم شــەوقی بڵاوبۆتەوە و، بۆ شــرۆڤەیەکی دیکەی راکانی ئاگامبێــن خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ وتاری "گوتاری مانەوە" ی بەختیار عەلی لە گۆڤاری "رەخنەی سەردەم" دا. لەوانەیە کۆی ئەم کتێبە بە زوویی بە کتێب بۆ چاپ ئامادە ببێت. دوا وتەش ئەوەیە کە ئەو روانگەی ئاگامبێن بۆ دوان لە ســەر سیاســەت و مافناسیی هاوچەرخ و رەخنەی سیستمی دەوڵەت نەتەوە هەنووکەییــەکان هەڵبژێــراردووە، دەتوانێت ئاســۆی زۆر فراوان بۆ تیۆریزەی کێشــەی نەتەوەیی کورد لە روانگەی سیاسی و مافناسانەوە بکاتەوە و زۆر ناکۆکی و لێکدژیی ناوخۆیی گوتاری ناسیۆنالیزمی کوردی ئاشکرا و چارەسەر بکات، یان وەک کاری هەمیشەیی بیرکردنەوە، زمانی خۆدەربڕینمان بۆ بخولقێنێت. ئەم دەقە بە پێی وەرگێڕانێکی فارسی و وەرگێڕانێکی ئینگلیزی وتارەکەی ئاگامبێن وەرگێڕدراوە، ئەگەرچی ئەم وەرگێڕانە نەیتوانیوە بە تەواوی لە دۆزینەوەی هاوتا بۆ زاراوەکاندا سەرکەوتوو بێت.

## سەرچاوە:


-جورجو آگامبن، وسایل بی هدف، امید مهرگان و صالح نجفی، چشمه، ١٣٨٧.

-Giorgio Agamben,Means without End,tr by Vincenzo Binetti and Cesare Casarino, University of Minnesota Press, 2000.

# فەلسەفەی پوچگەرایی

# NIHILISMS

د. مەلیك یەحیا سەڵاحی
لە فارسییەوە: كارزان محەمەد

نیهێل (Nihil) لەزاراوەو زمانی یۆنانیدا بەمانای (پوچ) و (ڕەتكردنەوەی كار) ە. بەشــێوەیەكی گشتی مەبەست لە پوچگەرایی قوتابخانەو شێوازێكی فكرییە كە نكۆڵی لە هەرجۆرە مەعریفە، بەها یاخود بوون دەكات. لایەنگرانی ئەم قوتابخانە هزرییە، هەرجۆرە بیروباوەڕو بڕوایەك بەپوچ دەزانن‌و بەسـوكییەوە دەنۆڕنە گشــت بڕیارو دابونەریتەكان، هەربۆیەشە بە پوچگەرایی یاخود سستگەرایی ناسراون.

ئەم بیروباوەڕە لەسەدەی نۆزدەهەم لەڕووسیای تزاریدا بایەخی بەدەستهێنا. ئامانجە سەرەكییەكەی لەناوبردن‌و سڕینەوەی گشــت ڕێكخراوە كۆمەڵایەتی‌و دەوڵەتییەكان بوو، ئەگەرچی پشتگیرییان لە خودپەرستی‌و دروستكردنی ترس‌وتۆقاندنیش دەكرد، بەڵام ئەلتەرناتیڤیشیان لەبەرامبەر نكۆڵیكردنی هەموو شتەكان لەجیهاندا نەدەخستەڕوو.

هەروەها چەمكی پوچگەرایی لە دەیەی شەستەكانی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕووسیا هاوكات دەربارەی ئانارشیســتەكان و تیرۆریســتەكانیش بەكاردەهات، بۆ نمونە لە ناسراوترین ئانارشیستەكانی ئەو سەردەمەی ڕووسیا كە بە پوچگەرا ناسرابوون، دەكرێ ناوی (میخائیل باكۆنین) بهێنرێت. باكۆنین لە ئەنارشیســتە پراگماتیســتەكان بوو، چەندینجار بەسزای لەسێدارەدان‌و ســەرەنجام بە زیندانی هەمیشەیی سزا درا، بەڵام لەكۆتاییدا ئازاد كرا. گرنگترین كار لە تێڕوانینی ئەوەوە بڵاوكردنەوەی بێ دینی، لەناوبردنی دەوڵەت‌و شۆڕش‌و یاخیبوون بوو لەبری هەر كارێكی سیاسی تر.

زاراوەی پوچگەرایـــی یەکەمیـــن جـــار بەمانـــای میتۆدێکی ڕەخنەیـــی- نێگەتیڤـــی دەربارەی ڕیککەوتنامەکانو دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان لە کتێبی (باوکان و کوڕان)ی بەرهەمی نووســـەری ڕووســـی (ئیڤان تۆرگینیڤ)[1]دا بەشێوەیەکی هەســـت پێکراو بەکارهێنرا. تۆرگینجیۆ لەم کتێبەدا کە بەشـــێوەی ڕۆمان نووســـیویەتی، دەیەوێ مـــرۆڤ و دونیابینیەکانی وێنا بکات کە مشـــتومڕی نێـــوان دوو نەوە واتا باوکو کوڕ لەخۆدەگرێت. باوک کە ســـاڵانێکی لە تەمەنی خۆی بەڕێکردووە و ئەزموونەکانی لە چوارچێوەی دابونەریتەکانی کۆمەڵگادا فێربووە، سەرزەنشتی کوڕەکەی دەکات کە بۆچی لە ڕێگای ڕاست لادەدات و ژیانی باش لە تێڕوانینی خۆی دووردەخاتەوە، لەکاتێکدا کوڕەکەی بیروباوەڕەکانی باوکی بەکۆن و وابەستەی نەوەی ڕابردووی دەزانێت.

بەهەرحاڵ تۆرگینێڤ دەگاتە ئەم دەرەنجامەی کە تەواوی ڕێســـاکان، دابو نەریتەکان، دەوڵەتو حکومـــەتو هەر کام لەو شـــتانەی هەن بەئامرازی ناچارکـــردنو بەدبەختکردنی مرۆڤ کۆتایی دێت. دابونەریتـــە کۆنەکان مرۆڤـــی کۆتوبەند کردووە، لەکاتێکدا ژیانی مـــرۆڤ کورتەو بەخێرایی ڕووەو تەواوبوون دەچێت. یاخود دەتوانین بڵێین: «مرۆڤەکان وەک گیانلەبەرێکی بێئیرادە تەنها پەیڕەوییان لە دابو نەریتەکان کردوەو دەستیان لە چارەنووسی خۆیاندا نییە».

بەهەمانشـــێوەی باســـمان کرد، نیهێلیزم بە پوچگەرایی ناســـراوە کەواتە ســـەیر نییە کە هیچ نووسەرێک یاخود بیرمەندو فەیلەسوفێک ڕاستەوخۆ ئامادە نەبێ خۆی بە پوچگەرا ناوزەد بکات، لەم ڕووەوە بنیاتنەرانو پەیڕەوانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە خۆیان وەک تیۆریزانانی نیهیلیزم ناناسێنن، بەڵکو بەبڕوای شـــرۆڤەکاران لەناواخنی بیروباوەڕەکانیاندا، وەک پاســـاوهێنەر یاخود بەپشتیوانی نیهێلیزم ناوزەدیان دەکەن. تائێرە ئەم بیروباوەڕە واتا ڕەتکردنەوەو نکۆڵی کردنی هەموو شـــتێک، لە ســـەدەی پێنجەمی بەرلە زایینیدا لە بیروباوەڕەکانی (کلبیۆن)یشدا دەبینرێت، کەواتە نهێلیزم تێگەیشتنێکی تائەندازەیەک دێرینە .

وێڕای ئەمانەش، دەبێ ســـەرنج لەوە بدرێ کە قوتابخانەکانو هزرە سیاسییەکان بەگشتی هەندێ بیروبۆچوون بەرهەم دێنن کە لەمەڕ کێشـــەکانی تاکو کۆمەڵگاو تەنانەت لەکاتو شـــوێنی خۆیاندا بەشێوەی تایبەت بەخۆیان هاتوونەتە ئاراوە، هەربۆیەشە زۆربەی ئەم قوتابخانانە کە لەڕیزبەندییەکی نزیـــک بەیەکتردان، لەڕوانگەی ناوەڕۆکو ئامانجەوە، خاڵگەلێکی هاوبەشـــی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەیە، هەروەکچۆن خزمایەتیو نزیکایەتییەکی زۆر لە نێوان ئەنارشـــیزم، مارکســـیزم و نیهێلیزمدا دەبینرێت. لـــەم ڕووەوە هەندێکجار فەیلەســـوفێکی دیاریکراو ڕەنگە بچێتە ســـنوری قوتابخانەی جۆربەجـــۆرەوە . بـــۆ نمونە نیچە هەم لە چوارچێـــوەی بیرمەندانی چەرخـــی ڕۆمانتیک و هەم وەک نیهێلیستێک دەخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە .

بەهەرحاڵ یەکێک لە ناسراوترین ئەو فەیلەسوفانەی کە بیروباوەڕەکانی لە چوارچێوەی نیهێلیزمدا ئەنالیزە دەکرێت، نیچەیە[2]. نیچە لە ساڵی (١٨٤٤) لە گوندێکی بچوک بەناوی (ڕۆکین) لە ناوچەی (لۆتزن) کە خۆی شـــارێکی بچوک بوو لە نزیک (لایپزیـــک)ەوە، لە خێزانێکی ئایینی و پەیڕەوانی

لۆتەر لەدایک بوو. بەمندالّی باوکی لەدەســـت داوەو زۆربەی تەمەنی لە ئازاری مێشکو سەرئێشەی بەردەوامدا بەســـەربردوە، دوای مردنی باوکی، لەگەڵ دایکیدا کە سەرپەرشتی نێچەی لەئەستۆدابوو، گواستێوە بۆ شاری نۆرنبێرگ لە باشوری ئەڵمانیا.

نیچە خوێندنی ســـەرەتایی و ناوەندی لەهەمان شاردا تەواو کرد، بۆ خوێندنی زانکۆ چووە شاری بۆنو لە کۆلیژی زماندناســـی و ئەدەبیاتدا دەستی بەخوێندن کرد. بەرلەبەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا لە زانکۆی (بازل) لە سویســـرا، وانەوتنەوەی زماندناســـیان پێسپاردو ماوەیەک دوای بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا، بوو بە وانەبێژی سەربەخۆ.

لە لایپزیک بە بەرهەمەکانی شـــۆپنهاوەر ئاشنابوو و بووە شەیدای بیروباوەڕەکانی. ئاشنابوونی بە شۆپنهاوەر[٣] و ڤاگنەر[٤]ی موزیکزانی بەناوبانگو ناسیۆنالیستی ئەڵمانی، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر نیچە دانا.

کاریگەری شـــۆپنهاوەر لەســـەر نێچە، بووەمایەی ئەوەی کە بیرۆکەو هزر بخاتەپێش ئیرادەوە. نیچە لە ناســـراوترین ڕەخنەگرانی ئەخلاقی باوەو خوازیاری ئاشکراکردنی هەرجۆرە هەڵەیەکی خودە لەلایەن تاکەوە، لەم ڕووەشەوە لە چوارچێوەی پەیڕەوانی نیهێلیزمدا دادەنرێت.

بیروباوەڕەکانی نیچە لەهەمانکاتدا کە زانستییە، پڕە لە جۆش و خرۆش و هەست و ئامانجگەرایی، ئەمەش هەر لە فەیلەسوفێکی رۆمانتیک چاوەڕێ دەکرێت. ئەگەرچی نیچە ڕەخنە لە ڕۆمانتیکەکان دەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە دەرەوەی ئەو سنورە هزرییەدا نییە. لە خودی ئەفلاتون زیاتر ئینتیمای بۆ بیروباوەڕ و فەلســـەفەکانی یۆنانی بەر لە ئەفلاتوون نیشـــان داوە. ستایشـــی یەکێتی دژەکانی هیراکلیتۆسو ئەو جەنگو دادپەروەریانە دەکات کە لەوێوە ســـەرچاوە دەگرێت. ئەگەرچی هیگڵیش دەخاتە ژێر ڕەخنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا شەیدای بیروباوەڕەکانی شۆپنهاوەر و سیستەمو ناسیۆنالیزمی ڤاگنەرە، بەڵام دوای ماوەیەک ڕوو لەوانیش وەردەگێڕێت.

لە تەواوی نووسینەکانی نێچەدا دوو بواری پڕ لەبەهای ناکۆک لە هرزو بیرکردنەوەکانی ئەودا شوێنی خۆی کردۆتەوەو پێکەوەگرێدراون، ئەگەرچی لەگەڵ یەکتریشـــدا ناتەبان. بەمانایەکی تر، لەکاتێکدا کە فەلســـەفە، هونەرو ئەدەبیاتی خۆش دەوێت، بەڵام ستایشـــی هێز و جەنگو ئەرســـتۆکراتییەت دەکاتو گەورە پیاوان بەمەزن دەژمێرێت. نێچە کەسانی لاواز بە ملکەچو تەسلیمبووی دەسەڵاتداران دادەنێت کە لە مۆدێلی (پارەتوو) و (رۆبەرت میشیلز)دا بە چینی عەوام ناودەبرێن.

نیچە لە ڕۆمادا ئاشـــنای کچێکی بە ڕەچەڵەک رووســـی دەبێت کە خوازیاری هاوســـەرێتی بوو لەگەڵیـــدا، بەڵام کاتێک کـــە وەڵامی (نا)ی وەرگرتەوە، کاریگەرییەکی زۆر نیگەتیڤ لەســـەر نێچە دادەنێت. سەرجەم ئەم ڕووداوانە، بیروباوەڕەکانی نێچە دەکاتە دژبەیەکو نیگەتیڤ.

نیچە بەپێچەوانەی لێکۆڵیارانی تری نیهێلیستییەوە، فەیلەسوفێکی زماندناسو ئەنترۆپۆلۆژیست و لە هەمووی گرنگتر مامۆستایەکی زانکۆی خاوەن توانستی بەرفراوانی توێژینەوە بوو، هەربۆیەشە نووســـینەکانی ناوبراو کە سەرتاسەری ژیانە زانستییەکەشی لەخۆدەگرێت، چەند ڕەهەندێکی زۆری هەیـــە. نێچە، ئازادیی بیرکردنەوەو کارکردنی لە ســـەنتەری بیرکردنەوە و مۆدیلەکەی خۆیدادەنێت.

نێچە هەردوو چەمکی (چاکە)و (خراپە) وەک دوو هێزی بزوێنەر لە مێژوودا دادەنێت کە سەرەنجام خراپـــە دەخاتەپێش چاکەوە. لە کتێبـــی (لەدایکبوونی تراژیدی لەرۆحی موزیک)دا کە لەســاڵی (١٨٧٢) بڵاوی کردەوە، تیۆری بۆچوونی رەشبینیانەی خۆی بۆ تراژیدیای مەسیحییەتی کلاسیک و رەخنەکانی خۆی لەو بارەیەوە خستەڕوو کە لە ژینگەی ئەکادیمیدا بە ساردی پێشوازی لێکرا.

لەکتێبی (وای گوت زەردەشـــت) بەشـــێوەی نیمچە (خوازە)و (شـــیعر)دا، کۆیلایەتی ئەخلاقیی مەســـیح بەرانبەر ئەخلاقسەروەری و مەزنێتیدا دادەنێتو رەخنە لەمەسیحییەتی کلاسیک دەگرێت، وێنای ئەرکی مەزنە پیاو دەکات کە لە سەردەمی ئەودا نیە.

لـــە تێڕوانینی نێچەوە نیهێلیزم ئامرازێکی دابەش دابەشـــکەرە، ڕووداوێکـــی مێژووییە کە بێ نرخبوونی سەرجەم بەهاکانی بەدواداادێت. بەهەرحاڵ فەلسەفەو ئەدەبیاتی نێچە لەسەدەی بیستەمدا کاریگەرییەکی زۆری لەدوای خۆی جێهێشـــت. بەجۆرێک کە ناســـیۆنال سۆشیالیســـتەکان سودی نیگەتیڤانەیان لە شـــیعرو نووسینەکانی نێچە وەرگرت، چەمکی مەزنە پیاوی ئەویان لەبەرگی ڕابەر (پێشەوا)دا بەرجەستەکرد.

ئەمـــڕۆ نیچـــە وەک یەکێک لـــە گرنگترین شـــایەتحاڵانو لێکۆڵیارانی مرۆڤی مۆدێرن بەشـــێوە نوێیەکەی خۆی ناودەبرێت. هایدگەر(٥)یش نیهێلیزمی خۆرئاوا کە بۆتەهۆی بەرفراوانبوونو گەشەی خودفەرامۆشی لە فەلسەفەدا، بۆ سەردەمی سوکرات دەگێڕێتەوەو ترۆپکی گەشەکردنی نهێلیزمیش لە فەلسەفەی نێچەدا بەرجەستەیە. هەروەها دەبێ ژان پۆڵ سارتەری بیرمەندو بوونگەرای فەرەنسیش، بە بانگەشەکەری جۆرێک لە نیهێلیزمی قارەمانێتی دابنرێت.

## پەراوێزەکان:

1-Ivan Turgenjew (1818-1883)

2-Friedrich Wilhelm Nietzsche (1844-1900)

3-Arthur Schopenhauer (1788-1860)

ســـەرنج: شۆپنهاوەر لە نێوان ســـاڵانی (١٨٢٠-١٨٣١) لەگەڵ هیگڵدا لە زانکۆی بەرلین سەرقاڵی وانەوتنەوە بوو.

4- Richard Wagner (1813-1883)

5-Martin Heidegger (1889-1976)

## سەرچاوە:

دکتر ملک یحیی صلاحی، اندیشەهای سیاسی غرب در قرن بیستم. چاپ اول، ١٣٨١، ص (١٦٩-١٧٣)

# بیرمەندێك بەوپەڕی جوامێرییەوە لە هەموو بەرەكانەوە دەجەنگا



سۆسەن ئەلئەبتەح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

هیچ دوور نەبوو «نەســـر حامد ئەبو زێد» بژیو كۆچی دوایی بكات، بەبێ ئەوەی ئەو ناوبانگە بەدەستبێنێت كە بەدەستیهێناوە، چونكە نوسینەكانی ئاسان نییە، بگرە نوسینەكانی تایبەتمەندەو خوێنەری ئاسایی بە دەگمەن چێژی لێوەردەگرێت. بەڵام تەكفیكردنیو هێرشكردنەسەریو تەڵاقدانی لە ژنەكەیو پاشـــان بەجێهێشتنی میســـر، هەمو ئەوانە كۆمەڵێ فاكتەربوون وایانكرد «ئەبو زێد» ببێتە كەســـێتییەكی نمونەیی بۆ ئەو ناخۆشیو ئاســـتەنگانەی بیرمەندێكی عەرەبی بەدەستییەوە

دەناڵێنێت، بیرمەندێک ئازایانە دەوێرێ جیاوازبێت لەگەڵ باوودا، بەبێ ئەوەی پاشەکشــەبکات یان داوای لێبوردن بکات. «نەســر حامد ئەبو زێد» ئەو پیاوەبوو تاکو دوا ســاتەکانی ژیانی، لەســەر هەڵوێســتەکانی بە خۆڕاگری مایەوە، توندڕەوەکان پڕوپاگەندەیان خستەشوێنو ڕاویاننا، تا بەهۆی (ڤایرۆســێکی ئاڵۆزەوە) کۆچی دوایی کرد. ژیانی وەک چیرۆکێــک دەمێنێتەوەو دەگێڕدرێتەوە کە تێیدا باجی ئازادییەکەی دا.

«نەســر حامد ئەبو زێد» بە ناڕەوا مردو لەلایەن دانیشــتوانی وڵاتەکەیو زمانەکەیەوە فڕوفێڵی لێکــرا. ڕەنگە تەنها ڕۆژگار زامنی ئەوە بکات شــکۆی ئەم پیــاوە قارەمانە بگەڕێنێتەوە کە هەموو تاوانەکەی ئەوە بوو بڕیاریدا لەبری ئەوەی لاســایبکاتەوە، بیربکاتەوە. تۆمەتبارکردنی بە کافر کەم نەبوو، بۆ یەکێک هەموو تەمەنی بۆ تێگەشــتن لە قورئان تەرخانکردبێتو دەڵێ: (وشــەی تەئویل ١٧ جار لە قورئاندا هاتووە، کەچی تەنها یەک جار وشــەی تەفســیر هاتووە)، لەبەر ئەوە تەئویلی کردە خەمی ســەرەکیو ســەرقاڵی تێگەیشتنبوو لەو ســیاقە مێژووییەی ئایەتەکانی تێدا هاتونەتە خوارو ئاســتی گونجاندنی هەموو ئەوانە لەگەڵ ئــەوەی هەنووکە تێدا دەژین. حەزی دەربازبوون لە دواکەوتویی، فیکری زیاترو زیاتری پێدەبەخشــی. لێرەوە هەستیکرد دەزگا زانکۆییە مەدەنییەکان کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دروستکران، لەپاڵ پەیمانگا فێرکارییە ئاینییەکاندا، لەباتی ئەوەی گەشە بەو پەیمانگایانە بدەنو تازەیان بکەنەوە، کەچی هۆکاری ئەو لەتلەتبوونەن کە پێیەوە دەناڵێنین. لەبەر ئەوە «نەســر حامد ئەبو زێد» پێیوایە ڕیفۆرم پێویستە لەناو ئاینەوە بێت نەک لە دەرەوەی. هەر لەبەر ئەمەشە بواری کارکردنی لەسەر قووڵبونەوە لە کەلتوور چڕکردەوەو پێیوابوو کەلتور یەکەیەکی موتەکامیلەو هەوڵیدا لەژێر ڕۆشنایی تیۆرە تازەکاندا لە کەلتوور بگات.

کاتێ کچێکی گەنجی ســوری، لە دیمەشــقو لەیەکێــک لە لێکچەرەکانیدا پێــی دەڵێ: (هیچ جیاوازییەک لەنێوان تۆو ئیســلامییەکاندا نابینم، ئەوان دەیانەوێ لە ڕێگەی قورئانەوە بەربەســت بخەنەبــەردەم مافەکانی ئافــرەت، تۆش دەتەوێ لە ڕێگەی قورئانەوە ئــەو مافانە بگەڕێنیتەوە بۆ ئافرەت)، «نەسر حامد ئەبو زێد» بەو قسەیە دڵخۆشبوو، وەڵامی کچەکە دەداتەوەو پێی دەڵێ: (تۆ ڕاســت دەکەیت، چونکە ئێمە تائێستاش لەناو ڕۆشــنبیرییەکداین مەرجەعی هەیەو دەبێت مامەڵە لەگــەڵ ئەو مەرجەعەدا بکەین). تەنها هەر ئەوە نییە، بگرە «نەســر حامد ئەبو زێد» عەلمانییەو ئەوەندە زیرەکیو هۆشــیاری هەیە، وایلێبکات داوای بە عەلمانیکرنی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت بــکات، بە مەرجێک بەشــێوەیەکی بەهێز پارێزگاری لە ڕووە ســادەکەی ئاین لەگــەڵ کۆمەڵگادا بکرێت.

هەموو ئەو هیواو ئاواتەی ئەم بیرمەندە دڵسۆزە، بۆ کێشەکانی میللەتەکەیو نەتەوەکەی هەیبوو، ئەوەبــوو لە کرانەوەو زیرەکیدا، لــە باوباپیرانی کەمتر نەبێت، لە نمونەی «غەزالی»، «عەبدولقاهر جەرجانی»، «ئیبن حەزم». کەچی لەگەڵ ئەوەشــدا میســر، بەم هیواوئاواتــەو بە بیروڕا تازەکانی ناڕازیبــوو، پێیوابوو ئەو لــە ئاین لایداوەو نێوان خۆیو هاوســەرەکەیان لێکجیاکردەوە. بۆیە کاتێ لە دەســت تۆمەتی هەڵگەڕاوە ڕایکردو گەشــتە هۆڵەندەو یەکەم لێکچەری لەوێ پێشکەش کرد، بە

دەســـتی ئەنقەست لێکچەرەکەی بە وشەی (بسم الله) دەســـتپێکرد، ئەمەش بۆ ئەوەی لە وڵاتێکی ڕۆژئاوادا وا تەماشـــای نەکەن کە لەدەرەوەی ئیســـلام هاتووە یان وا تەماشای نەکەن وەک ئەوەی لە ئیسلام یاخیبووە.

بگرە ئەو بەشـــانازییەوە وا خۆی پێشـــکەش کرد کە لەناو ئەو کەلتوورەوە هاتووەو سەربەرزە بە ئاینەکەی. بەم مانایە «ئەبو زێد» ڕازینەبوو ناوبانگێکی ڕۆژئاوایی، لەســـەر شـــێوەی «تەسلیمە نەســـرین»ی بەنگلادیشی، بەدەســـتبێنێت. «تەســـلیمە نەســـرین» وەک ئافرەتێکی موسڵمانی چەوســـاوەو قوربانی دەستی دواکەوتویی ئیسلام، پەنای بردە بەر ئەوروپا. هەروەها ڕازینەبوو وەک «ســـەلمان ڕوشدی» خۆی بکاتە ئەستێرەیەکو بە پاسەوان دەورەبدرێتو هەواڵەکانی لە میدیاکانی ڕۆژئاوادا بگوێزرێتەوە. بە پێچەوانەوە، «ئەبو زێد» هەوڵیدا، بە هەموو ڕێگایەک تەنهاییەکەی خۆی بشکێنێتو بیسەلمێنێت ئەو دوورخراوە نییە، بەڵکو ئەو بە ئیرادەی خۆی هاتووەتە خۆرئاواو هەر کاتێکیـــش بیەوێت دەتوانێ بگەڕێتەوە وڵاتەکەی. ئەوانەی لـــە وڵاتەکەیدا ڕەتیدەکەنەوە کەمینەن، ئەمە لەکاتێکدایە لەم ئومەتەدا، هێشتا خەڵکانێک هەیە دەیانەوێ لەگەڵیدا بیربکەنەوەو ئیجتیهادو گفتوگۆ بکەن.

ئێمـــە دەتوانیـــن لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێبەکەی (تێگەیشـــتن لـــە دەق) کە چاپی یەکەمی لە ســـاڵی ١٩٩٠ بڵاوکرایەوە، زیاتر «ئەبو زێد» بناســـین، ئەو لەوێدا دەڵێ: (هاوپەیمانی لەنێوان دوژمنـــی دەرەکی کە لە ئیمپریالیزمی جیهانیو زایۆنزمی ئیســـرائیلیدا خۆیدەنوێنێت، لەگەڵ هێزە کۆنەپارێزەکان کە لەناوەوە باڵادەســـتن، دیـــارو بەرچاوە. بەوپێیە لەمڕۆدا هەڵوێســـتمان بریتییە لـــە بەرگریکردن لە خودی بوونمـــان، کە دوژمن توانیویەتی یان خەریکـــە دەتوانێت درزە بکاتە ناو ڕیزەکانمانەوە، درزەکردنی لەپێناو ســـەرلەنوێ بنیادنانەوەی هۆشـــیاریمانە، یاخود ڕاستتر لەپێناو دەســـتگرتن بەسەر هۆشیاری ڕاستەقینەماندا و بەخشـــینی هۆشیارییەکی ساختەیە پێمان، ئەویش لەڕێگەی دەزگا ڕاگەیاندنەکانییەوە، بەمەش تەسلیمبوونی یەکجارەکیمان بۆ پلانەکانیو پاشکۆبونی ڕەهامان بۆ ئەوان، لەسەر هەموو ئاستەکان، مسۆگەر دەکات).

لێـــرەوە دەکرێ لەوە تێبگەیـــن کە «ئەبو زێد» پێیوایە داخرانی ئاینـــی، هاوتەریبە بە غەزوی دەرەکی، بگرە ئەو دووانە شـــەریکن لە دروستکردنی شکستدا. بەم مانایە نوسینەکانیو هەوڵەکانی بۆ سەرلەنوێ خوێندنەوەی دەقەکانی قورئانو تەئویلکردنیانو بەکارهێنانی عەقڵ بۆ تێگەشتنیان، کارێکی تابڵێی نیشـــتیمانییە بە پلەی نایابو شـــایەنی قوربانیدانی گەورەیـــە. وەلێ ئەوەی ئەم پیاوەی جیادەکردەوە، ئەوەبوو کەسێکی بوغزاوی یان پەرگیر نەبوو، بگرە کەسێکی کراوەبوو بەسەر گفتوگۆو مشتومڕدا.

کاتێ لە ســـاڵی ٢٠٠٦ ســـەبارەت بە ئیخوان موســـلمینەکانی میســـر پرســـیاریان لێکرد، وتی: (ئیسلامییەکان لە سەرەتای سەدەی ڕێنیسانسەوە، هێزێکی سیاسی گەورەن، هەروەها ئیخوانەکان لەمڕۆداو لە میســـر، یەکەم هێزی ئۆپۆزســـیۆنن، ئەگەرچی من لەگەڵ هەندێ تێزی فیکریاندا نیمو جیـــاوازم لەگەڵیـــان، لەوانە: هیچ ئیجتیهادێک نییە بۆ ئەوەی لە دەقەکاندا هاتووە، ئیســـلام دینو

دەوڵەتە. بەڵام من هاوڕام لەگەڵیان لەسەر هەموو ڕێکەوتنێکی سیاسی)، ئەوی ڕۆژێ کە ئیخوانەکان گەشتنە پەرلەمانی میسر، «ئەبو زێد» پێشوازی لێکردن، جەختی لەوە کردەوە ئەوان بە پاکی گەشتونەتە پەرلەمانو ئەو پێشوازی لە هەر هەڵبژاردنێکی پاک دەکات کە ئیسلامییەکان دەهێنێتە سەر حوکم. بەڵام داوای لە ئیخوانەکان کرد مانای ئەم دروشمەیان ڕونبکەنەوە: (ئیسلام چارەسەرە)، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە هەندێ کێشەی سیاسی گرنگەوە.

«ئەبو زێد» لەم زەمەنە عەرەبییە توندڕەوەماندا، کەسێتییەکی بیرکەرەوەی دەگمەنە، تەنانەت ئەگەرچی لەگەڵیدا تەبانەبیت. «ئەبو زێد» ئەوەندە سنگفراوانو کراوەیە، وایلێکردووە دووربێت لە عەلمانییە دەمارگیرەکانو بەلای ئیسلامییە نەریتخوازەکانیشەوە نامۆبێت. بونی لە ناوچەیەکی فیکری عەقڵانیو هاوسەنگدا، ناوچەیەک هیچ بیرمەندێکی تێدانەماوە جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت، وایلێکرد بۆ ماوەیەکی درێژ تاراوەیەک نەفرەتلێکراو بێت، ئەگەرچی لە ژیانیدا هەوڵیدا لە بایەخی ئەو تەنهاکەوتنەی کەمکاتەوە. هەستکردنی بەوەی غەدرلێکراوە، لەو کاتەوە زیادیکرد کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە هۆڵەندە مایەوە، بەبێ ئەوەی یەک دەعوەتنامەی بۆ بنێرن، ئەو وەک ئەوەی لەسەر پشکۆ بێت چاوەڕوانی ئەو دەعوەتنامەیەی دەکرد، تاکو بیکات بە بیانویەکو لەمیانەیەوە بگەڕێتەوە بۆ خاکەکەی، کە تابڵێی تامەزرۆو شەیدای بینینی بوو. بەڵام ئەو دەعوەتنامەیە هەر نەهات، وەلێ ئەو خۆی گەڕایەوە، وەک ئەو ماسییەی لە دەرەوەی ئاوەکەی خۆی، نەتوانێت هەناسە بدات.

ساڵی ٢٠٠٤ لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) دەڵێ: (بە هاوسەرەکەی وتووە، ئەگەر لە هۆڵەندە مرد، ئەوا هەر لەوێ بینێژێتو نەیباتەوە بۆ میسر). پاشان زۆر بە توندی وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە سوکایەتییان بەو داواکارییەی کردووەو دەڵێ: (ئێوە وەک ئەوەی میسر گۆڕستان بێت مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، من وەک نیشتیمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەم. چ مانایەکی هەیە من بە مردویی بۆی بگەڕێمەوەو بە زیندویی لێیدەرکراوم).

«ئەبو زێد» لەو چاوپێکەوتنەیدا توڕەیەو دەڵێ: (هەندێ لە میسرییەکان بە هۆی بوونی ئەهرامەکانەوە، پێیانوایە میسر گۆڕستانە، یاخود میسر موڵکی یەکێکیانە یان موڵکی هەندێکیانە).

وەلێ «ئەبو زێد» بە دڵنیاییەوە کۆچی دوایی کرد، چونکە وەسیەتەکەی کە لە چرکەیەکی توڕەبوندا بە «ئیبتهال»ی هاوسەری وتبوو، نەهاتەدی. خاکی وڵاتەکەی کە بە زیندویی نەفرەتی لێکرد، کاتێ بووە لاشەیەکی ساردوسڕ ئامێزی گەرمی بۆ کردەوە. «ئەبو زێد» دوای ئەوەی لەو چرکە توڕەیەی پەشیماندەبێتەوە، لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ «ڕەوف مسعد»ی ئەدیبدا، دان بەوەدا دەنێت تاکە هیوای کە لە دڵییەوە نزیکە ئەمەیە: (لە زانکۆی میسر بە خوێندکارە میسریو عەرەبەکان شادببمەوەو لە میسر بنێژرێم).

«نەسر حامد ئەبو زێد» لەکاتی ئیشکردنو نوسینیدا، جیاوازی نەدەکرد لەوەی توێژەرە یان هاوڵاتییە، چونکە لە هەردوو حاڵەتەدا هەمو خەمی ئەوەبوو تێبگات تا چ ئاستێک دەکرێ

دەستكاری مانای ئاینی بكرێتو ئەو لەكوێی هەموو ئەمانەدایە. «ئەبو زێد» باسی هۆكاری پاڵنەرە فیكریەكانی خۆی دەكاتو بەو دڵســـۆزییەی لەسەری ڕاهاتبوو دەڵێ: (من ئینتیمام بۆ ئەم ئاینە، بۆ ئەم ڕۆشنبیرییە هەیەو دەمەوێ ژیانم مانایەكی هەبێت). پێش ئەوەی میسر بەجێبێڵێتو بڕوات بۆ هۆڵەندە، لە ڕۆژنامەكاندا بەیاننامەیەكی بڵاوكردەوەو تێیدا دەڵێ: (من توێژەرێكی موســـڵمانم، شـــانازی بە ئیمانمو بە بەشداریكردنم لە فیكری ئیســـلامیدا دەكەم)، ئەو ڕازینەبوو بە هەڵگەڕاوە وەســـفیبكەن، ڕازینەبوو دوو شـــەهادەت بێنێتو تۆبە بكات، وەک ئـــەوەی داوای لێكرابوو. ئەو بە هەمـــان ئازایەتیو بە هەمان توانـــاوە بەرگری لە بیروڕاكانی دەكرد، بەبێ ئەوەی ســـاردبێتەوە یان توشـــی هەڵەشـــەییو زیادەڕۆیی پەرگیری عەلمانییەكان ببێت. پێش مردنەكەی بە دوو مانگ، لە چاوپێكەوتنێكی تەلەفزیۆنیدا، دانبەوەدادەنێت چاوی لەوەبووە پۆســـتی موفتی میســـر وەربگرێت، بەڵام ئاساییە ئەو هیوایەی، ئەمجارەیان زۆر دوور بووە لە واقیعەوە.

«نەسر حامد ئەبو زێد» لە نیشتیمانەكەیدا، لەبری ئەوەی زوڵمی لێبكرێتو بدرێتە بەر ڕێژنەی تۆمەتی خێرا، شایەنی ئەوەبوو ڕێزێكی گەورەی لێبگیرێت. ئەم عوصامییە كە بە هەتیوی گەورەبوو، ناچاربوو بڕواتە بەر خوێندنی پیشـــەییو لە فەرمانگەی دەستەی پەیوەندی سلكیو لاسلكی ببێتە فەرمانبەر، خوێندنی زانكۆی بە تەنســـیب تەواوكرد، چاوەڕوانی ئەوە بوو لە ئاسمانەوە زەمالەیەكی خوێندنی بۆ بێتەخوارەوە، تاكو خوێندنەكەی تەواو بكات. «ئەبو زێد» تەنها كەســـێكی ئەكادیمی نەبوو، بگرە مرۆڤێک بوو لە مانای هەژاریو نەبونی دەگەیشـــتو بەرپەرچی زوڵمو زۆرداری هەموو ستەمگەرێكی دەدایەوە. ئەو دەیگوت بەیانیان تەماشای چاوی هەموو خوێندكارەكانی دەكات، تاكو بزانـــێ كامیان توانیویەتـــی نانی بەیانی بخواتو كامی دیكەیان لەبـــەر نەبونی نەیتوانیوە بیخوات. «ئەبو زێد» ئا بەم ڕۆحەوە مامەڵەی لەگەڵ دەوروبەرەكەی كردووە.

پەروەردەكردنـــە ئاینیەكـــەیو نزیكبونـــەوەی لە ئیخوان موســـلمینەكان لـــە تەمەنێكی زوودا، هەروەها دڵنەرمیو میهرەبانی كەسوكاری، هەموو ئەوانە ڕۆڵیان بینی لەوەی هەستكردن بە خەڵكو كێشـــەكانیان، لـــەلای «ئەبو زێد» گەشـــەبكات. هەرگیز لەخۆی باییەنەبـــوو، تەنانەت لە لێكچەرە قورســـەكانیدا، دەســـبەرداری ڕۆحی گاڵتەكردن نەبوو. «ئەبو زێد» ئاگاداری ئەوە بوو كتێبەكانی جۆرێـــک لە قورســـییان تێدایە كـــە وادەكات خەڵكی بە زەحمەت لێیتێبگەن، بۆیـــە هەوڵیدەدا لە گفتوگۆكانیو نوســـینە ڕۆژنامەوانیەكانیدا، قســـەكردنەكانی ئاســـانترو ســـوكتربن، تاكو هەموان لێیتێبگـــەن. ئەو بە دڵســـۆزییەوە بڕوای وابـــوو بیرمەند هیچ نرخێكی نییە، ئەگـــەر نەتوانێت بە زمانەكەی، لەگەڵ میللەتەكەیدا بەردەوامبێت. بایەخپێدانە هەمەلایەنەكەی، یارمەتیدا دیدێكی ئاسۆ فراوانی هەبێت. ئەو لە ســـەرەتادا لە بواری تەقەنیاتی ئەلەكترۆنیدا كاریكرد، پاشـــان بایەخی بە گۆرانی میللی داو شیعری میللی دەنوسی، بەو هیوایەی ڕێچكەی گۆرانی میسری بگۆڕێت. هەروەها ســـەبارەت بە (ئەدەبی كرێكارو جوتیار) و ســـەبارەت بە (چیرۆكو گاڵتەوگەپ) و (تیۆری كورتە چیرۆک)و (ســـتاتیكو دینامیک لە تیڕوانینی ئەدۆنیســـدا) دەینوسی. ئەمە پێش ئەوەی بە تەواوی ڕوو لە كەلتورو فیكری ئاینی بكات.

«ئەبــو زێد» توانی نێوان تموحو زیرەکی، ئەکادیمیەتو ڕۆحی میللی پێکەوە کۆبکاتەوە. توانی هــەم میوانو هەم وانەبێژبێت لە ناوچەی عەرەبی، ناوچەیەک خەمەکانی لەکۆڵگرتبوو، ئەگەرچی لە مەنفا هۆڵەندییەکەیدا دەژیا. پێویســتە ســبەی، ئەوانەی ناحەقییان بەرامبەر کردو لێنەگەڕان لێرە قســەبکات یاخود لەوێ لێکچەرێک بڵێتەوە، پەشــیمانببنەوە. وەک ئەوەی بــەم دوایانە لە کوێت توشــیهات، لەوێ ئەگەرچی ڕەزامەندی چونەژورەوەی وەرگرتبــوو، کەچی کاتێ دەگاتە فرۆکەخانە، لێناگەڕێن بچێتە ژورەوە. یان وەک ئەوەی لە قاهیرە بەسەریهات، لە قاهیرە ویستی یەکەم لێکچەری دوای گەڕانەوەی لە تاراوگە پێشکەش بکات، کەچی هیچ هۆڵێک ڕازینەبوو پێشوازی لێبکات، تەنها زانکــۆی ئەمریکــی نەبێت. ئیدی «ئەبو زێد» گازی لە برینەکە دەگــرتو پێیوابوو بیروڕاکان هەر دەبێت ســەرکەوتن بەدەســتبێننو هەردەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم ئومەتــە لەخەو خەبەریببێتەوە. لەوانەیە لەســەرحەقبێت، ئێمــە بەو هیوایەی «ئەبو زێد»ەوە دەژین، ئــەوی دڵنەوایمان دەداتەوە ئــەو کتێبانەیە کە لەدوای خۆییەوە بەجێیهێشــتونو وادەکەن بیروڕاکانــی بەزیندوویی بمێننەوە، بیروڕاکانــی لە چاوەڕوانی ئەوەدان کەســێک بێتو ڕێز لە ناوەرۆکەکەی بگرێــتو ئازایەتی ئەوەی هەبێت گفتوگۆی لەگەڵدا بکاتو لەسەری بنیادبنێت.

## سەرچاوە:

ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)، لاپەڕەی مونتەدای ڕۆشنبیری، یەکشەممە ١١ تەموز ٢٠١٠/٧/١٧.

# کرانەوەو داخران لە کولتووری عەرەبی- ئیسلامیدا

جۆرج تەرابیشی
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

ئیشکالییەتی سەرەکیی ئەم چەرخەی ئێمە، لانیکەم لە گۆشەنیگای ئێمەی کەنارو پەراوێزکراو کە تیایدا شوێنگەیەکی نێگەتیڤمان داگیر کردووە، بریتییە لە ئیشکالییەتی پێشکەوتنو دواکەوتن.

لە نموونە هێنانەوەی مەترسیی ئەم ئیشکالییەتەدا، پەنا بۆ فرۆید دەبەم، وەک دەزانرێ فرۆید لە وتارێکدا بەناوی «ئاستەنگێک لەبەردەم شیکردنەوەی دەروونیدا» کە لەساڵی ١٩١٧ بڵاوی کردۆتەوە، قسەی لەسەر برینێکی دەروونیی زۆر دەگمەن کردووە کە دەشێت ناوی بنێین «برینی نێرگسیی گەردوونی»، ئەم برینە نێرگسییە گەردوونییە لەوێوە سەریهەڵداوە کە شکۆی گەردوونیو کبریائی مرۆڤایەتی سێ جار دووچاری زەلیلی بووە، ئەمەش بەهۆی پێشکەوتنی زانستو دۆزینەوە بەردەوامو یەک لەدوای یەکەکانی زانست.

یەکەمین برین کە لە جەستەی نێرگسیزمی گەردوونیدا دروست بووە، بریتییە لە (برینی کۆسمۆلۆجی)، ئەو برینەی کە تیۆری (کۆپەرنیکۆس) دروستی کرد کاتێک هاوکێشەی موگناتیسی گەردوونیی هەڵگێڕایەوەو جەمسەری مەرکەزییەتی لە سیستەمی فەلەکیدا گۆڕیو ئەو راستییەی ئاشکراکرد کە: خۆر بەدەوری زەویدا ناسوڕێتەوە، بەڵکو زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، ئەمەش حەقیقەتێکی ئازار بەخش بوو بۆ شکۆی بەشەرییەت.

برینی دووەم بریتییە لە (برینی بایۆلۆجی)، ئەم برینەش دووەم تیۆری کودەتائامێز دروستی کرد، ئەویش تیۆری (داروین)ە کە حەقیقەتێکی ئازارهێنی دیکەی بۆ نێرگسیزمی گەردوونی بەشەرییەت ئاشکراکرد: مرۆڤ کە بۆ چەندین سەدە شانازیی بە ڕەسەنێتی ئاسمانیی خۆی دەکردو پێی وابوو ئینسان مەخلوقێکە لە رۆحی خودا و لەسەر شێوەو وێنەی خودا ئەفرێنراوە، کەچی

لەژێر فشـــاری بەڵگەو ســـەلماندنەکانی زانستدا، ئەو شانازیو شکۆیەی بریندار کراو دانی بەوەدا نا کە ڕەگەزی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگەزی ئاژەڵ، واتە ســـولالەی مرۆڤ لە ســـولالەیەکی ئاژەڵییەوە پەرەی سەندووەو ئەم هەیکەلەی ئێستای بەخۆوە گرتووە.

سێیەمین برینی نێرگسی سروشتێکی سایکۆلۆجی هەیەو دەشێت ناوی بنێین: «برینی نێرگسیی دۆزینەوەکانـــی ســـایکۆلۆجیا». دامەزرێنەری ســـایکۆلۆجیای دەروون (فرۆید) بـــوو. واتە تیۆری شـــیکردنەوەی دەروونیش تیۆرێکی کودەتا ئامێزی دیکەبوو: وەک چۆن زەوی لەگەڵ کۆپەرنیکۆسدا سێنتەری گەردوون نییە، وەک چۆن ڕەگەزی مرۆڤ لەگەڵ داروینیدا ناچێتەوە سەر ڕەگەزی خودایی، بەمجۆرە لەگەڵ فرۆیدیشدا دەروونی مرۆڤ نابێت بە سێنتەری خودی خۆی: چونکە لەژێر رووکاری ئاگاییـــدا ئۆقیانووســـی نائاگایی هەیە. بڕیارەکانی مرۆڤیش، کە ئینســـان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ شـــانازیی بە هۆشـــیاریی خۆیەوە دەکرد، زۆرجار لە نائاگاییەوە دەردەچن، واتە رەفتارو بڕیارەکانی مـــرۆڤ ئەوەنـــدەی لەقووڵایی نائاگاییەوە دیـــاری دەکرێن، کەمتر لـــە رووکاری ئاگاییەوە رێنوێنی دەکرێن، بەکورتی: ئەوە نائاگاییە زۆرجار رەفتارەکانی ئینسان هەڵدەسوڕێنێ.

لەتەک ئەم سێ برینەدا، ئێمە برینێکی نێرگسیی دیکەی بۆزیاد دەکەینو دوودڵ نین لەوەی بەوە وەسفی بکەین کە ئەم برینە_ برینی نێرگسیی چوارەم_ سروشتێکی ئەنترۆپۆلۆژیی هەیە.

بـــۆ ئەوەی ئەم وەســـفە تەواوی دەلالەتی خۆی وەربگرێ، دەبێ ئـــەوە بیربهێنینەوە کە خاوەنی تیۆری برینی نێرگســـیی گەردوونی، واتە فرۆید، رۆڵەیەکی نموونەیی ژیاری خۆرئاوایی بوو، لێرەوە بەشـــێوەیەکی خۆبەخۆ یان بەشـــێوەی «نائاگایی» گریمانەی ئەوە دەکەم ئەو مرۆڤەی کە شۆڕشی زانستی نوێ سێ برینی لە جەستەیدا دروست کرد، مرۆڤێکە لە رەهایی خۆیدا، واتە مرۆڤ بەتەواوی یـــان مروڤ لە تەواوی خۆیداو وەک ئەوەی هەیە، ئەم مرۆڤە بەبیریدا نەدەهات ببێت بە کەســـێکی روونو ئاشکراو مێژوویی‌و ئەو شتە دیاری بکات کە ئەو مرۆڤەی سێ برینی نێرگسیی لە جەستەدا دروســـت بووە، بەپێویست مرۆڤی خۆرئاواییە کە لەتەک کۆمەڵێک شتی تردا خۆی بۆ کێوماڵکردنی دنیا ســـازدەداتو خۆی دەکات بەمرۆڤێکی گەردوونی. لەئاگایی فرۆیدیشدا ئەو بیرۆکەیە ئامادەبوو کـــە ئـــەو مرۆڤە خۆرئاواییە ئاشـــکرایکرد کە زەوی ســـێنتەری گەردوون نییە، خێـــرا ئەو زەلیلیە نێرگســـییەی قەرەبوو کردەوە بەوەی کە خودی خۆی کرد بە ســـێنتەری زەوی. بەڵام مرۆڤی غەیرە خۆرئاوایی درەنگتر خۆی لە ئاوێنەی خۆرئاوای پێشکەوتوودا کەشفکرد.

لـــە بارودۆخی عەرەبیشـــدا ئەو (برینـــە ئەنترۆپۆلۆژییـــە) گەورەتر بـــوو. لای میللەتانی ترو کولتوورەکانی تردا تا ئاستێک ئاسایی بوو کە بۆیان دەرکەوت خۆرئاوا پێشکەوتووەو پێشدەکەوێ‌و کەچـــی ئەوان لە شـــوێنی خۆیاندا دەجووڵێنـــەوە.. کەچی لە حاڵەتی عەرەبیدا پرســـیاری: بۆچی خۆرئاوا پێشـــکەوت؟ پەیوەســـت بوو بە پرسیارێکی تری هاوشێوەی پرســـیارەکەی پێشوو: بۆچی ئێمەی عەرەبو موسڵمانان پاشکەوتین؟

ئەم پرســـیارە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا وەکو پرســـیارێکی دراماتیکی مایـــەوە. بەڵام لە حاڵەتی عەرەبیدا هەر لە سەرەتاوە ئەم پرسیارە پرسیارێکی تراژیدی بوو.

لەکاتێکدا نەتەوەو کولتوورەکانی دیکە پاشکەوتوویی خۆیان بە (کەمی لە پەرەسەندنو پێشکەوتن) تەفسـیر دەکرد، عەرەب دەیانگەڕاندەوە بۆ دواکەوتوویی‌و بەجێمانو داکەوتن (الانحطاط). هەرلەبەر ئەمەش پێیان وابوو پێشکەوتنیان بریتییە لە بوژاندنەوەو زیندووبوونەوەو لەدایکبوونی دووەم (واتە رێنیسـانس). ئەم زاراوەیە یەکسەر رێنیسانسـی ئەورووپیمان دێنێتەوە بەرزەین. بەڵام دەبێ لێرەدا دەرک بە فەرقێکی بنەڕەتی بکەین: ئەو رێنیسانسەی کە خۆرئاوا لە سەدەی پانزەهەمو شانزەهەمدا بەخۆیەوە بینی، لەسـەر پایەی لاسـاییکردنەوەی سـەدە دێرینەکانی یۆنانی_رۆمانیدا وەستابوو. بەڵام رێنیسانسـی عەرەبی -کەپێی وابوو سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە- لەڕاستیدا جۆرێک بوو لە گەڕانەوەو تەماهی. ئەو لۆجیکەی حوکمی سـەردەمی رێنیسانسی عەرەبی دەکرد بریتی بوو لەوەی دەبـێ عەرەب بێ زیادوکـەم خۆیان بن، واتە خۆیانو هەرخۆیان بن، بۆئەوەی ببوژێنەوەو گەشـەی شارسـتانێتی سەردەمی زێڕینی خۆیان بگەڕێننەوە. ئەم لۆجیکە دواجار شکستو داکەوتنی خستە ئەستۆی «خۆرئاوازەدەی نامۆگەرا» یان شعوبیەتو پۆپۆلیزم. ئەم لۆجیکە ناسیونالیستییە عەرەبیە کـە خەریک بوو ببێت بە لۆجیکی ئیتنیکی، هەمان ئەو شـتەیە کە ئەمـڕۆ لە فێندەمینتالیزمی ئیسـلامەویدا خۆی تازە دەکاتەوە: ئەم لۆجیکە پێی وایە وەک چۆن عەرەب بەهۆی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ غەریبانو ئەغیاراندا داکەوتن، هەر بەو چەشـنە ئیسـلامیش ئـەو کاتە داکەوت کە وازی لە ئیسـلامبوونی خۆی هێنا. لێرەوە بانگەشـەی گەڕانەوە بۆ سـەرەتاکانی ئیسلامێکی پاکژو بێگەرد سەریهەڵدا بەو مانایەی ئیسلام لە هەموو ئەو «میکرۆبانە» پاک بکرێتەوە کە لەپاش تێکەڵبوونی لەگەڵ شارستانیەتێکی دژدا-واتە شارستانیەتی خۆرئاوا- دووچاری بووە. لەم تێگەیشتنەدا ئیسلامی ئەمڕۆ لە جاهیلییەتێکی تازەدا دەژیتو دەبێ کەمترین شـت هەوڵبدرێ ئیسلام ئیسلامیەتی خۆی بەدەست بهێنێتەوە، واتە ئیسلامیزەکردن یان ئیسلامیزەیشن.

ئـەم گریمانەیـەی ئێمە لەبـارەی برینـی ئەنترۆپۆلۆجی، بەشـێوەیەکی سروشـتی قابیلی بەکارهێنانێکی سۆسیۆلۆجیشـە. ئایا هەڵکشـانی رەوتی فەندەمینتالیزمی ئیسلامی، لە یەکێ لە هۆکارە سەرەکیەکانیدا، ناگەڕێتەوە بۆ بێتوانایی لە سارێژکردنی ئەو برینە بەهۆی شکستی پرۆژەی نوێکاریی عەرەبی؟

بەڵام ترسناکترین دەرەنجامی گریمانەی برینی ئەنترۆپۆلۆجی لە ئاستی رۆشنبیریدا دەردەکەوێ. مادامەکی «ئەویدی»، یان بەدەربڕینێکی تر: بەرەو پێشـچوونی ئەویدی، سەرچاوەی ئەم برینەیە، ئەوا بەردەوامبوونی نەزیفی نێرگسـی (واتە بەشێوەیەکی پراکتیکی: بەردەوامبوونی پاشکەوتوویی عەرەبـی) پێداویسـتی بەرگریکردن دێنێتـە ئاراوە بـۆ قەبەکردنەوەی «مـن»و بچووککردنەوەی «ئەویدی».

پێشتر هیوایەکی زۆر هەبوو بە سەرکەوتنی پرۆژەی رێنیسانسی عەرەبی و نوێکردنەوە، بەڵام ئەم پێداویسـتییە داکۆکیکارییە لەوە تێنەدەپەڕی کە زیادەڕەوییەک بێت لە رۆڵی «من» و دەرکەوتنی «ئەویدی» و پێشـکەوتنیدا. لەبەر ئەوە بەشـێکی فراوانی ئەدەبیاتی مێـژوو و ئەنترۆپۆلۆژیای ژیاری لە کولتووری نوێی عەرەبیدا تەرخان کرابوو بۆ پیشـاندانی ئەو قەرزەی جیهانی ئیسـلامی

بە ڕێنیسانســـی ئەوروپیی بەخشـــیوە، چەندین لاپەڕەی دووروودرێژ لەسەر ئەو بەخششە گەورەیە نووســـراوە کە زانستی عەرەبی و فەلســـەفەی ئیسلامی، هەر لەســـەدەی دوانزەهەمەوەو لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە، پێشـــکەش بە کولتووری مەســـیحی لاتینی کردووە. ئێمە گومانمان لەو قەرزە نییە، لەڕاستیدا مێژوونوسانی کولتوری ئەوروپی یەکەم کەس بوون دانیان بەو راستییەدا نا.

ســـەرچاوەی بریندی نێرگسیی عەرەبی بریتی نییە لە ســـەدەکانی ناوەڕاست کە لە ئەوروپادا بە ســـەدە تاریکەکان و ســـەدەی پاشـــکەوتن ناودەبرێت و لە بەرامبەریدا کولتوری عەرەبی ئیسلامی لەوپەڕی گەشـــانەوەو پێشـــکەوتندا بوو، بۆ نموونە کاریگەریی ئیبن روشـــد لە کولتووری لاتینی ئەوروپی، بەڵکو ســـەرچاوەی ئەو برینە بریتییە لە ئەوروپای ســـەردەمی ڕێنیســـانس و ئەوروپای ســـەدەی حەڤدەهەم کە بوونە مایەی ســـەرهەڵدانی مۆدێرنەی خۆرئاوایی کە لە سێ سەدەی دواتردا پێشـــکەوتنێکی بێوێنەی بەخۆوە بینی. لەڕاســـتیدا ئەوەی کە ئەوروپای ڕێنیســـانس و ئەوروپای ســـەدەی حەڤدە کردیان بریتی بوو لە «دابڕان» لە ئەوروپای سەدەی سیانزەو چواردە، واتە دابڕان لـــەو چەرخانەی کە ئەوروپا تا رادەیەکی زۆر لەســـەر خوانی کولتوری عەرەبی ئیســـلامیدا دەژیا، بەڕادەیەکی کەمتریش لەسەر خوانی کولتووری عەرەبی یەهودیدا دەیخوارد، ئەمە وادەکات ئەو دابڕانە مەســـەلەی قەرزدانی کولتوری عەرەبی ئیســـلامی بە کولتووری خۆرئاوایـــی بیر بچێتەوە، ئەمەش برینی ئەنترۆپۆلۆژیی عەرەبی سارێژ ناکات.

لەڕاســـتیدا دیاردەی ســـەرهەڵدانی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی پێویســـتیی بە لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆسیاسی هەیەو لەپشتی ئەم دیاردەیەشدا قەیرانی (کار) و قەیرانی (شوێنی نیشتەجێبوون)و قەیرانی (سێکســـی) هەیە کە ئێمە لێرەدا بەدوای شیکردنەوەی ئەو قەیرانانەدا ناچین، بەڵام لەتەک ئەم فاکتەرە ماددییە گرنگانەدا کە لەسەر ئاستی جەماوەردا کاریگەرییەکی روونیان هەیە، فاکتەرێکی دیکە هەیە کە بریتییە لە (قەیرانی مانا)، قەیرانی مانا لەلای توێژی رۆشنبیرانی فێندەمێنتالیستی بریتییە لە قەیرانی نەرزیفێک نایەوێ بوەســـتێتو برینێک نایەوێ ســـارێژ بێت. داخران لە کۆمەڵگە عەرەبیو ئیســـلامیەکاندا ســـەرچاوەی داکەوتن (الانحطاط)و دواکەوتنە (التخلف)و لەڕاســـتیدا ئەم داخرانە دەروازەی چوونە ناو چەرخی شکســـتە یەک لەدوای یەکەکانە، کەچی کرانەوە لە ســـەردەمە کلاسیکییە زێڕینەکانی کولتوری ئیسلامیدا دەروازەی چوونە ناو چەرخی شارستانی بوو.

ئـــەوەی فێندەمینتالیزمی ئیســـلامی دەیەوێت، بریتییە لە بەئیســـلامکردنەوەی ئیســـلام، واتە ئیســـلامێکی پەتی و دوور لەهەر تێکەڵبوونێک، ئیسلامی سەرەتاو ئیسلامی سەردەمی پێغەمبەرو خولەفـــاکان، لێـــرەدا فێندەمێنتالیزم هەموو ئەو ژیارو کولتورانـــە رەت دەکاتەوە کە زەمینەیان بۆ ســـەرهەڵدانی ئیسلام خۆشـــکردو ئەوانەی رۆڵی کاریگەریان هەبوو لە پێشـــکەوتنی شارستانیەتی ئیســـلامیدا، تەنانەت ئـــەو کولتورانەیش کە بەعەرەبکـــراون یان بوون بە موســـڵمان، بەڵام دواتر کاریگەرییان لەســـەر پێشخســـتنی ئیسلامدا هەبوو. فەلســـەفەی مێژوو لای فەندەمێنتالیستەکان بریتییە لە جیابوونەوەو دابڕانێکی ڕەها، هەموو پەیوەستێکیش بە کولتوورەکانی ترەوە بریتییە لە شەراکەت و جاهیلییەت. لە کاتێکدا ئەم وێناکردنە داخراوەیی و دابڕانە پێچەوانەی واقیعی مێژوویی

ئیسلام و شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامییە لەڕووی بونیاد و پێکهاتەوە. بگرە ئەمە لەگەڵ ڕاستیی خودی قورئانیشـــدا پێچەوانەیە، چونکە قورئان جگە لەوەی بریتییە لە کتێبی ســـروش و ئایین، هاوکات کتێبێکیشە لە مێژوو.

ئەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەر نەدەکرد، دەیانوت ئەمە هیچ نییە جگە لە ئەفسانەکانی پێشوو «اســـاطیر الاولین»، (ئەمە لە نۆ شـــوێنی قورئان خۆیدا هاتووە)، هەروەها قورئان خۆیشـــی دەڵێ ئەم قسەوباسانە پێشتر وتراون «انباء ما قد سبق» (ئایەتی ٩٩ سورەتی تەها)، هەروەها قورئان ســـەدان موفرەداتی ئارامی و ســـریانی و فارســـیی تیادایەو بگرە چەندین وشەی یۆنانیشی تێدایە، هەندێ لە توێژەران پێیان وایە خودی وشـــەی «قورئان» لە وشـــەی «قرانو»ی سریانییەوە هاتووە کە بە مانای کیتاب دێت. سێ روکن لە پێنج روکنەکانی ئیسلام: نوێژ و ڕۆژوو و زەکات، هاوبەشە لەگەڵ هەردوو ئایینە تاکخوداییەکانی تری پێش ئیســـلام، واتە یەهودی و مەسیحی. حەجیش (کە روکنـــی پێنجەمەو تەنها لە ئایینی ئیســـلامدا هەیە)، ناکرێت بەبـــێ بەردەوامێتی لەگەڵ کەعبەو پێش ئیســـلامدا، تێی بگەین، پێغەمبەر خۆیشـــی پێی لەسەر ئەو بەردەوامێتییە دادەگرت تەنانەت ئـــەو کاتەش کە بتەکانی جاهلیەتی دەشـــکاند: کاتێک پێغەمبەر بەســـەرکەوتوویی داخڵی مەککە بوو (لەپاش هیجرەتێکی دوورو درێژ بۆ مەدینە لە بیســـتی رەمەزانی ســـاڵی هەشتەمی کۆچیدا)، یەکسەر چووە کەعبەو حەوت جار بەدەوریدا سوڕایەوە، دارەکەی دەستی خستە سەر بەردە رەشەکە، فەرمانـــی دا هەرچی بت لەدەوری کەعبەدا دروســـت کراوە بڕووخێنرێن، هەروەها وێنەی پێغەمبەرە تەوراتییەکان نەهێڵن، بەڵام ســـێ وێنەی جیا کردەوەو فەرمانی دا کە لە شـــوێنی خۆیاندا بمێنن، ئەوانیش بریتی بووون لە وێنەی: ئیبراهیم و عیسا و مریەم.

ئەگەر بارودۆخ و هەلومەرجی بەر لە ئیســـلام بەو ئاســـتە لە لانکەی ئیسلام لە حیجازدا ئامادە بووبێت، ئەوا لەوڵاتانی تری دەوروبەردا ئامادەییەکی زیاتری هەبووە، بۆ نموونە لە شـــام و میسرو عێراق، بەتایبەتی لە شـــامدا چەندین شـــار بەبێ شەڕ تەســـلیم بوون یان بوون بە ئیسلام، ئەمە وەک لە قودســـدا رووی دا، چونکە نوســـرانییە یەعقوبییەکان کە خەڵکی ئەم شارە بوون، بەتەواوی بێزار ببوون لە ڕۆم و لە پاشـــای ڕۆمەکان هەرقل، هەروەها ناکۆکیی لاهوتیشـــیان لەگەڵیدا هەبوو، ئەمـــە جگە لەوەی باجێکـــی زۆری لێوەردەگرتن و مامەڵەیەکی خراپی لەگەڵـــدا دەکردن. ئەوەبوو دواتر دەرگای شارەکانیان لەبەردەم سەرکردە موسڵمانەکاندا کردەوە بەو پێیەی ئەمان لە مەسەلەی تەوحیددا هاوبەش بوون، هەروەها ئیســـلام دانی بە مافەکانیان نابوو وەک ئەهلی کیتاب لەســـەر ئایینی خۆیان بمێننەوە. ئەمەش لەڕاستیدا ڕووداوێکە بایەخێکی مەزنی لە مێژوودا هەیەو دووبارە نەبووەوە تەنها ئەو کاتە نەبێ کە لە ئەندەلوسی ئیسپانیدا، لەبەر هەمان هۆ، هەندێ لە دەرگاکانی شارەکانیان بۆ سەرکردە موسڵمانەکان کردەوە.

بە پێچەوانەی ئەوەی کە دەوترێت گوایە ئیسلام ئایینەکانی بەر لەخۆی ڕەتدەکاتەوە، ئەوەی لە شـــامدا رووی دا، واتە لە ســـوریای گەورەدا کە لەچیاکانی تۆرۆسەوە درێژدەبێتەوە تا بیابانەکانی ســـینا، سەلماندنێکی جوانی بەردەوامێتیی ژیارییە. کەرەستەکانی بەرێوەبردنی بیزەنتی هەر لەژێر

دەستی بەڕێوەبەرە لۆکاڵییەکانیدا مایەوەو دەواوینەکانیش (واتە ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێین وەزارەتەکان) بۆ ماوەیەکی کاتی هەر بە زمانی یۆنانی کاروبارەکانی خۆیان رایی دەکرد، لە زۆر حاڵەتیشدا کەنیسەو پەرستگاکان دەستیان بۆ نەبرا، تەنانەت کەنیسەی یۆحەننای مەعمەدان گەورە کەنیسەی دیمەشق، لەو ئانوساتەدا نەکرا بە مزگەوت، رۆشنبیرە سریانییەکانیش لە دەوڵەتی نوێی عەرەبیدا کران بە نووسەر. بێگومان ژمارەیەکی زۆر لەو سریانانە (واتە دانیشتوانی رەسەنی سوریا کە ئەم ناوەش هەر لەوانەوە وەرگیراوە) بەرەو تەعریبکردن رۆیشتن کە یەکێتیی ریشەی سامیزمی هەردوو زمانەکە -زمانی سریانی و زمانی عەرەبی- یارمەتیدەریان بوو بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام، بەڵام ژێرخانی رۆشنبیریی سوریای بەر لە ئیسلام هەر بەردەوام دەبێت، نەک تەنها لە سوریادا، بەڵکو لە سەرانسەری ئیمپراتۆریەتی عەرەبیدا.

لە چەرخی عەباسیشدا ئەم بونیادە رۆشنبیرییە لەگەڵ بونیادی رۆشنبیریی عێراقی-فارسیدا یەک دەگرن و ئیدی لەم ئاوێزانبوون و تێکەڵبوونە مێژووییەدا، شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی دەچێتە قۆناغی زێڕینی خۆیەوە. سەرکردە موسڵمانە عەرەبەکان (یان فاتیحە عەرەبەکان- الفاتحون العرب) ئاسایش و یەکێتیی سیاسی و کەرەستەیەکی زمانەوانیی سەرسوڕهێنەریان پێشکەش بە ناوچەکە کرد، کە ئەویش زمانی عەرەبی بوو، جگە لە پێشکەشکردنی ئاینێکی نوێ کە دینامیەتی متمانەبەخۆبوونی لەلادا تەقاندنەوە، ئەو متمانە بەخۆبوونەی، وەک ئالان بێرفیت لە کتێبی «کۆمەڵگەی متمانە»دا دەڵێت، جوڵێنەری هەموو شارستانیەتێکە.

بەڵام «ئینتلجنسیا»ی سوری-عێراقی-فارسی کە هەڵگری کەلەپووری یۆنانین، لەو کەشوهەوا دەگمەنەی ئەو ساتەوەختەی ئازادییەدا، دەستیان کرد بە پرۆسەکردنی چالاکییە رۆشنبیرییەکانیان لە زانستە جیاجیاکاندا (زانستی عەقڵی و زانستی نەقڵی). ئیدی هەر لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیدا چەند زانستێکی وەک زانستی زمان و عەروز و فیقهو کەلام و لۆجیک و فەلسەفەو زانستە سروشتییەکان بایەخێکی بەرچاویان پێدراو رووناکییان بینی، جگە لە زانستەکانی تری وەک بیرکاری و فەلەک و ئاژەڵناسی و رووەکناسی و نوژداری. هاوکات سەدان کتێب و بگرە هەزاران کتێب لە چەندین زمانەوە، بەتایبەتی لە یۆنانییەوە، وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها لە زمانەکانی فارسی و هیندی و قیبتی و بابلی.

یەکێک لە دیارترین مێژوونوسانی «ئەقڵی عەرەبی» لەگۆڕەپانی فیکری عەرەبیی هاوچەرخدا، واتە (محەمەد عابد جابری) لە کتێبی «پێکهاتەی ئەقڵی عەرەبی»دا سەرسوڕمان و نکوڵیبوونی خۆی پیشان دا لەوەی کە زانستی عەقڵی و نەقڵی لە شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامیدا بە کامڵی لەدایک بووبێت، بەبێ ئەوەی ئەو پەرەسەندنە بەخۆوە ببینێت کە زانستەکانی شارستانیەتی ئەوروپی بەخۆوەی بینیوە، ئەمە واتە شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی لە دیدی جابریدا شارستانیەتێکی داخراو بووە بەسەر خۆیدا، بەڵام ئەگەر جابری دەرکی بەو یاسایە بکردایە کە گەورە مێژوونوسی فەرەنسی (فیرنان برۆدێل) دایڕشتووە، ئەوە دوچاری ئەو سەرسوڕمان و نکوڵیلێکردنە نەدەبوو، پوختەی بۆچوونەکەی برۆدێل دەڵێت: شارستانیەتەکانی دەریای سپی ناوەڕاست، بەتایبەتی حەوزی

خۆرهەڵات، بە کامڵی و بە پێگەیشـــتوویی لەدایک دەبن، واتە بە قۆناغی منداڵیدا تێناپەڕن، ئەمە لەبەرئەوەی ئەو شارســـتانیەتانە تەواوکەری یەکدین و کەڵەکەکراوی ســـەر یەکدین، هیچ یەکێکیان ئەویدیکەیان ناسڕێتەوە.

دەشـــێت زمـــان بگۆردرێت و دەشـــێت شوناســـی ســـەرکردە فاتیحەکە بگۆردرێـــت، بەڵام ئەو «ئینتلجنســـیا»یە ناگۆردرێت کە لە پشتی شۆڕشـــی داهێنانی ئەبجەدیەتی فینیقی و فەلسەفەی یۆنانی بوون، هەروەها ئەو «ئینتلجنســـیا»یەی لەپشتی پرۆســـەی بەکەلەپوورکردنەوە بووهن لە چەرخی هیلینســـتی لە ئەســـکەندەرییەو ئەنتاکیە و پێرگامێس (لە ئاســـیای بچووک = تورکیای ئەمڕۆ)، ئەمانە هەر ئەو کەســـانە بوون کە مەســـیحیەتی یەکەمیان لەخۆ گرت و پاپا گەورەکانی کەنیســـەی گەورەی رۆژهەڵاتیان بەرهەم هێنا، لە رۆمادا و لە چەرخی رۆمانیشـــدا هەمان چالاکیی رۆشنبیرییان نواند.

ئەم ئینتلجنســـیایە (کە من هەمیشە ئەم وشـــەیە دەخەمە نێوان دوو جووت کەوانەوە) هەمان ئەو ئینتلجنســـیایەیە کـــە لە چەندین کەســـایەتیی خۆرهەڵاتیدا (وەکـــو: ئەفلۆتینی فەیبومی و فەرفۆریۆســـی صووەری و نۆمانیۆســـی ئەفامی و نیمیسیۆســـی حمصی و یامبلیخۆسی عەنجەری و دمسقیۆســـی دیمەشقی و ئەبۆقلیســـی بیزەنتی و دەیانی تر) درێژەیان بە فەلسەفەی یۆنانی دا، لەکاتێکدا ئەم زمانە رۆشـــنبیرییە کۆســـمۆپۆلیتییە لە خۆرئاوای رۆمانیدا بەرەو لاوازبوون دەچوو. دیســـان ئەم ئینتلجنســـیایە هەمان ئەو ئینتلجنســـیایەیە کە لە دێرە ســـریانییەکانی یەعقوبی و نەستورییەکاندا لە سوریا و عێراق، ئەرکی پاراستنی کەلەپووری یۆنانی و کەلەپووری نووسراو بە زمانی یۆنانییان لە ئەســـتۆ گرت لە زەمەنێکدا کە زمانی ئارامی وەک زمانی هاوبەش باڵادەست بوو. دواجار ئەم ئینتلجنسیایە هەمان ئەو ئینتلجنسیایەیە کە توێژێکی فراوانیان تەعریب کران و بوون بە موســـڵمان بۆ پرۆسەی بنیاتنانی چەرخی زێڕینی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی، بێگومان بە هاوبەشی لەگەڵ رۆشنبیرەکانی ئەو هەرێمانەی بە فارسی قسەیان دەکرد.

لە تێڕوانینی ئەم کرانەوە فراوانەی شارستانیەتدا، خەتەرترین رووداو لە مێژووی ئیسلامدا، پاش گەڕانەوەی ســـەرکەوتووانەی پێغەمبەر بۆ مەککە بەر لە مردنی بە دوو ســـاڵ، ئەو بریارەی موعاویە بوو کە پایتەختی گواســـتەوە بۆ دیمەشـــق، دوای ئەوانیش عەبباســـیەکان پایتەختیان گواستەوە بـــۆ کوفـــە و دواتریش بۆ بەغداد. لەوانەیـــە بریاری یەکەم زۆر لە بریارەکانی تر، لە گواســـتنەوەی پایتەختدا، گرنگتر و خەتەرتر بووبێت، چونکە بریاری دووەم تەنها گۆڕینی پایتەختێکی سیاســـی بـــوو بە پایتەختێکی تری سیاســـی، بەڵام بڕیاری یەکەم (بڕیارەکـــەی موعاویە) بووە هۆی ئەوەی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی لە لانکی ئایین دوور بکەوێتەوە تا لە سێنتەری شارستانیەت نزیک ببێتەوە.

جـــا بۆ ئەوەی لـــە مەزنیی ئەو بریارەی موعاویە تێبگەین، ئەوەندە بەســـە باســـی ئەوە بکەین کە عومەری کوڕی خەتاب دامەزرێنەری راســـتەقینەی دەوڵەتی عەرەبی ئیســـلامی، کاتێک عومەر ئەلعاســـی داگیرکاری وڵاتی میسر بۆ دروستکردنی شـــاری فسطاط (قاهیرەی کۆنی ئێستا) راوێژی

پێکرد، عومەری کوڕی خەتاب وەسیەتی بۆ کرد کە تا ئەتوانێت لە دەریا دوور بکەوێتەوە، لەبەر ئەوەی عەرەب هیچی لێنازانن. بەڵام موعاویە دوای بیست ساڵ هێزێکی کەشتیەوانیی گەورەی پێکهێنا -لەمەشدا سوودی لە شارەزایی سورییەکان و پاشماوەی فینیقییەکان وەرگرت- تا لەوێوە پەلاماری قوبرس و رۆدۆس و کرێت بدات و گەمارۆی قوستەنتینیە بدات.

بایەخی ئایینیی ئەم بریارە شارستانییە بایەخێکی کەم نەبوو، ئەگەر پایتەخت نەگوازرابایەوە بۆ دیمەشق و دواتریش بۆ بەغداد، ئەوا شام و عێراق و فارس بەزۆری بە نوسرانی و زەردەشتی دەمانەوە. لە سەردەمی خولەفاکانی راشدیندا قەدەغە بوو سەربازەکان تێکەڵ بە خەڵکی ئەو ناوچانە بوونایە کە فەتحیان دەکرد. بەڵام لە سەردەمی حوکمی ئومەوییەکانەوە ئەو تێکەڵبوونە مێژووییە دەستی پێکرد و هەر لەو سەردەمەشدا تەعریب و تەسلیم (بە عەرەبکردن و بە ئیسلامکردن)ی فیعلی درێژەی پێدرا، ئەگەر وانەبوایە ئەوا ئیسلام هەرگیز نەدەبوو بەو ئیسلامەی ئەمڕۆ کە دووەمین ئایینی جیهانییە لە دوو ئایینە گەردوونیەکەی جیهان.

## سەرچاوە


بەشێکە لە فەسڵی چوارەمی ئەم کتێبە:

(جورج طرابيشي، من النهضة الى الردة، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٠).

# دەستەواژە کورت و پوختەکان کە گوزارشتیان لە مێژوو کردووە

هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

دانەری ئەم کتێبە توێژەرو مێژونوسی فەرەنسی «دانێل لاکوت»ە، ئەو کتێبەکەی بەم دەستەواژەی مێژونوســی ناوداری یۆنانی «هیرۆدێت» دەستپێدەکات: (خەڵکی وادەزانن کە ئەوە ئەوانن جڵەوی ڕوداوەکان دەگــرن، بەڵام لە واقیعدا ئەوە ڕوداوەکانن جڵەوی ئەوان دەگرن! مرۆڤ کەســێکە زیاتر دەستبەسەرکراوە لەوەی ئازادبێت).

پاشان دانەر چیرۆکی ئەو دەستەواژە بەناوبانگانە دەگێڕێتەوە کە لە یادەوەری مێژودا ماونەتەوە. وەک ئەوەی «یۆلیۆس قەیسەر». «یۆلیۆس قەیسەر» دوای ئەوەی ناپاکی نزیکترین کەسی «برۆتۆس» بۆ دەردەکەوێتو دەزانێ لەگەڵ ئەوانی دیکەدا پلانی لە دژی داناوە، پێی دەڵێ: (برۆتۆس، تەنانەت تۆش!) ئەم دەســتەواژەیە بووە بە پەند. ئەمە مانای ئەوەیە (لە دۆستوبرادەر بترسێ) وەک ئەوەی کوردەواری دەڵێ.

دەســتەواژەیەکی دیکە، ئەوەی پاشای فەرەنسایە «هنری چوارەم» کە دەڵێ: (پاریس شایەنی نوێژێکی کاسۆلیکیە) یان (پاریس شایەنی قوداسێکی کاسۆلیکیە). «هنری چوارەم» دوای ئەوەی مەزهەبەکەی خۆی لە پرۆتســتانتەوە گۆڕیو چووە سەر مەزهەبی کاســۆلیک، ئەو دەستەواژەیەی وت. ئەمەش بۆ ئەوەی میللەت ڕازیکات بەوەی ببێتە پاشــای فەرەنسا. بۆ ئەم پاشایە ئاسان نەبوو مەزهەبەکەی خۆی بگۆڕێتو بچێتە سەر مەزهەبە نەیارەکەی خۆیو هەموو تایەفەکەی. لەنێوان ئەو دوو مەزهەبەدا هەم ڕقوکینە هەبوو هەم خوێنڕژابوو. وەلێ هیچ چارەیەکی دیکە نەبوو، فەرەنســا لەو ســەردەمەدا، واتە سەدەی شازدەهەم، ئامادەنەبوو جڵەوی خۆی بداتە دەست پاشایەکی غەیری کاسۆلیک.

پاشان دانەری کتێبەکە دەڵێ: ئەوەی لەم مەسەلەیەدا سەیرە، ئەوەیە ڕابەرانی بەرەی کاسۆلیکە دەمارگیرەکان، لەوە دەترسان پاشا هەنگاوێکی لەو جۆرەبنێت، واتە وەک ئەوان ببێت بە کاسۆلیک! بۆچی؟ چونکە دەیانزانی ئیدی میللەتی فەرەنسا پێیڕازیدەبنو لە دەوری کۆدەبنەوەو تاجی پاشایەتی پێدەدەن، ئەوانیش هەرگیز ئەمەیان ناوێت. چونکە ئەو دوژمنە هەرە سەرسەختەکەیانە، جگە لەوە ئەوان ئەوەیان بەڕاست وەرنەگرتبوو کە پاشا هاتووەتە سەر مەزهەبی زۆرینە، پێیانوابوو ئەوە تەنها جۆرێکە لە تەکتیک یان کارێکی سیاسییە. لە واقیعدا «هنری چوارەم» لەو کاتوساتەداو لە ژیانیدا، مەترسیدارترین بڕیاری خۆی دا. هەرگیز ئاسان نەبوو بۆ ئەو بڕیارێکی لەو جۆرە بدات. هەوادارانو لایەنگرانی لە مەزهەبی پرۆتستانت، لەسەر ئەو بڕیارەی زۆر بە توندی سەرزەنشتیانکرد. بەڵام پاشا لە دواجارداو بۆ ئەوەی بێدەنگیان بکات پێیوتن: (پاریس شایەنی قوداسێکی کاسۆلیکیە!) واتە پاریس سەرکردایەتی خۆی ناداتە دەست کەسێک سەر بە ئاینی زۆرینە یان مەزهەبی زۆرینە نەبێت. لێرەوە لێمگەڕێن بڕۆمە سەر ئەم مەزهەبە، ئەگەرچی بەشێوەیەکی ڕوکەشانەش بێت، بۆ ئەوەی حوکمی فەرەنسا بکەوێتە دەستمانەوەو زوڵمو زۆرداری سەرمان ڕەتکەینەوە.

بەم شێوەیە هەوادارانو لایەنگرانی، بە پێناخۆشبوونەوە، بێدەنگبوون. وەلێ ناکۆکییە مەزهەبییەکان، کۆمەڵێ ناکۆکی سەختو قورسە، بۆیە دواجار دەمارگیرێکی کاسۆلیک بەناوی «ڕافیاک» پاشای تیرۆرکرد. پاشا لە میانەی حوکمڕانییەکەیدا، هەوڵیدا هەردوو مەزهەبەکە ئاشتبکاتەوە، مەزهەبی کەمینەی پرۆتستانت لەگەڵ مەزهەبی زۆرینەی کاسۆلیک. لەوەشدا بۆ ماوەیەک سەرکەوتوبوو، توانی ئەو جەنگە ناوخۆییە وێرانکەرە بوەستێنێت کە زیاد لە سی ساڵ بوو بەردەوامبوو، فەرەنسای هەلاهەلا کردبوو. ئەو جەنگە مەترسیدارترین جەنگی ناوخۆ بوو، لە هەموو جەنگەکانی دیکە زەرەرو زیانو قوربانی زۆرتری لێکەوتبووەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ڕەنگە بە هۆی ئەوەوە، کاسۆلیکە دەمارگیرەکان، هەستان بە ناردنی «ڕافیاک» بۆ تیرۆرکردنی «هنری چوارەم». «ڕافیاک» دوای کۆمەڵێ هەوڵو تەقەلا بە مەرامەکەی خۆی گەیشتو لەڕێگەی لێدانی چەند جارەی خەنجەرەوە، پاشای کوشت. ئەمەش لە شەقامی (ڕیفۆلی) بەناوبانگ ڕویدا.

خەڵکی پێیان سەیربوو «ڕافیاک» چۆن گەشتووەتە پاشا کە بە کۆمەڵێ پاسەوانو سەرباز دەورەدرابوو. لە ڕاستیدا گروپی فێندەمێنیتالیزمی دەمارگیر لای کاسۆلیکەکان، هەرگیز لەوە خۆش نەبوون پاشا، کە لە تێڕوانینی ئەواندا پرۆتستانتێکی گومڕاو کافرە، وێراویەتی لەسەر عەرشی فەرەنسا دانیشێت. سەرەڕای ئەوە، ئەوان چیرۆکی وازهێنانی پاشا لە مەزهەبەکەی خۆیو هاتنەسەر مەزهەبی کاسۆلیکیان بە ڕاستنەدەزانی. بەڵام هەموو ئەو شتانە، نەبوونە ڕێگر لەبەردەم «هنری چوارەم»دا، بەوەی ببێت بە یەکێک لە پاشا گەورەکانی فەرەنسا، لەپاڵ «لویسی شازدەهەم»و ئەوانی دیکەدا.

دواتر دانەری کتێبەکە دەستەواژەیەکی بەناوبانگی «ماری ئەنتوانێت» دەهێنێتەوە کە تێیدا وتویەتی: (بۆچی پسکیت ناخۆن)، وەلێ ئەو شتەی کە سەیرو سەمەرەیە ئەوەیە «ماری ئەنتوانێت» هەرگیز ئەو قسەیەی نەکردووە، بەڵکو ئەوە بە درۆ یان بە هەڵە خراوەتەپاڵ ئەو، ئەمە مانای وایە

پڕوپاگەنـــدە لە حەقیقەت بەهێزترە. خەڵکی هەموو لـــەو بڕوایەدان «ماری ئەنتوانێت» کاتێ ئەو قسەیەی کردووە کە هەژارەکانی پاریس، لە میانەی شۆڕشی فەرەنسیدا، پەلاماری کۆشکی ڤێرسای دەدەن. کاتێ شاژن گوێی لە هاتوهاوارو قیڕەقیڕ دەبێت، دێتە ناو بەلەکۆنەکەوەو لە داروەستەکەی دەپرسێت: (ئەوانە چیان دەوێت)، وەڵامی دەدەنەوە: (شاژنی خاوەنشکۆ، ئەوانە برسییانەو دەیانەوێ نان بخۆنو نانیان نییە)، شاژن وەڵامیان دەداتەوە: (ئەی بۆچی پسکیت ناخۆن؟). ئاشکرایە پسکیت زۆر لە نان گرانترە، ئەوەی نەتوانێت نان بکڕێت، ئیدی چۆنو بە چ شـــێوەیەک دەتوانێ پســـکیت بکڕێت؟ لە ڕاســـتیدا ئەم پەرەگرافە بەناوبانگە لە کتێبی (دانپیانانەکان)ی «جان جاک ڕۆســـۆ»دا هەیە، پاشـــان بەهەڵە خراوەتە پاڵ «ماری ئەنتوانێت». ئاشـــکرایە شۆڕشگێڕە فەرەنسییەکان زۆر سەرسامبوون بە «ڕۆسۆ».

دەستەواژەیەکی دیکە هەیە خراوەتە پاڵ «ماری ئەنتوانێت»، بەڵام ئەم دەستەواژەیەیان ڕاستە. کاتێ شـــاژن دەچێتە سەر سەکۆکە بۆ ئەوەی سەری لەژێر مەقســـەڵەکەدا لێبکەنەوە، ساتمەیەک دەکاو قاچـــی دەنێـــت بە پێی ئەو جەلادەدا کە دوای چەند خولەکێـــک یان چەند چرکەیەکی دیکە، ئەرکی سەرلێکردنەوەکەی پێســـپێردرابوو، شاژن پێی دەڵێ: (بمبورە جەلادی بەڕێز، من بەدەستی ئەنقەست ئەوەم نەکرد)، پاشان سەری لێدەکرێتەوە!

لە مێژودا دەستەواژەیەکی دیکەی بەناوبانگ، بەناونیشانی (دۆزیمەوە، دۆزیمەوە!) هەیە، خاوەنی ئەم دەســـتەواژەیە زانای مەزنی یۆنانی «ئەرخەمێدس»ە، کە زانـــای بیرکاریو فیزیاو ئەندازە بوو. ئاشـــکرایە «ئەرخەمێدس» بە درێژایی چەندین مانگ، بەشوێن نهێنی یەکێک لە یاساکانی فیزیادا دەگەڕا، بێ ئەوەی هیچ چارەســـەرێکی بۆ بدۆزێتەوە، هێند گەڕاو هێند پرســـیاری کرد شەکەتببوو. ڕۆژێک بە مەبەســـتی خۆشـــۆردن، چووە ناو حەوزێکی پڕ ئاو، لەناکاو چارەســـەرەکەی دۆزیوە، بە ڕووتوقوتی لە ئاوەکە هاتەدەرەوەو بەناو شـــەقامەکاندا ڕایدەکـــردو بە هەمو دەنگی هاواری دەکرد: (دۆزیمەوە! دۆزیمەوە!)، ئەم دەربڕینە نیشـــانەی جوانی دۆزینەوەو خۆشـــی گەیشتنە بە ئەنجام، دوای گەڕانو شەکەتبونێکی دوورودرێژ. «ئەرخەمێدس» بەلایەوە گرنگ نەبوو خەڵکی بەڕووتوقوتی بینیویانە، بگرە لەوانەیە هەستی بەوە نەکردبێت کە ڕووتوقوتە، چونکە ئەو سەرسامی چرکەساتی دۆزینەوەکە بوو.

دەســـتەواژەیەکی بەناوبانگی دیکە بەناونیشانی (ئابڕوچوونو شورەیی لەناوبەرن)هەیەو هەموو فەرەنســـییەکان دەیزانن، خاوەنی ئەم دەستەواژەیە فەیلەســـوفی گەورەی ڕۆشنگەری «ڤۆڵتێر»ە، ئەم فەیلەســـوفە هەموو ئەو نامانەی کە بۆ هاوڕێ دڵسۆزەکانی دەنوسی، بەو دەستەواژەیە کۆتایی پێدەهێنان. هاوڕێکانی لە سەرەتادا دەیانپرسی ئاخۆ مەبەستی لەوە چی بێت؟ هەندێکیان دەیانوت مەبەستی ئاینی مەسیحییە، هەندێکی دیکەیان دەیانگوت نەخێر مەبەستی تەنها مەزهەبی کاسۆلیکی پاپای ڕۆمانییە. هەندێکی دیکەیان شـــتێکی تریان دەگوتو...هتد. پاشـــان زانیان ئەو بە دروستی مەبەســـتی دەمارگیرییو فێندەمێنتاڵستە دەمارگیرەکانە، ئەوانە لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆریان، لایەنگرانی پاپاو مەزهەبی کاســـۆلیکی بوون، بۆیە دەســـتەواژەکە ئەوان دەگرێتەوەو بەسەر ئەواندا

جێبەجێ دەکرێت. ئاشـــکرایە «ڤۆڵتێر» هەمو ژیانی لە هێرشکردنە سەر پیاوانی ئاینیو خورافاتو جادوگەرییو عەقڵیەتی غەیبدۆزی کە پێچەوانەی زانســـتو عەقڵە بردەســـەر. فێندەمێنتالیســـتە دەمارگیرەکان پێیانوابوو «ڤۆڵتێر» ســـەرۆکی حیزبی فەیلەســـوفەکانە کە لە «دیدرۆ، جان جاک ڕۆسۆ، دلامبێر»و ئەوانی دیکە پێکهاتبوو.

دواتر ناکۆکی دەکەوێتە نێوان «ڤۆڵتێر»و «لویســـی پازدەهەم»ەوە، پاشا «ڤۆڵتێر» لە پاریس دەردەکاتو کتێبەکانـــی قەدەغە دەکاتو بە توندی بەشـــوێنییەوە دەبێت. ســـاڵی ١٧٥٠ «ڤۆڵتێر» ڕادەکاتە لای پاشـــای بروسیا «فردریکی دووەم» کە پاشـــایەکی ڕۆشنگەری زاڵم بوو. ئەم پاشایە ســـەرەتا ڕێز لە «ڤۆڵتێر» دەگرێت، دیاری گەورە گەورەی پێشـــکەش دەکات، بۆ بەرزترین ئاست بەرزیدەکاتـــەوە. بەڵام دوای ئـــەوە ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوەو لە کۆشـــکەکەی دەریدەکاتو بۆ ماوەیەکیش شوێنی دەکەوێت. ئیدی «ڤۆڵتێر» دەڕوات بۆ سویسرا، لەوێ بۆ ماوەیەک دەمێنێتەوە، پاشـــان بە شێوەیەکی یەکجارەکی لەسەر سنوری فەرەنسا/ سویسرا نیشتەجێدەبێت. لەوێوەو تاکو دوا ساتەکانی ژیانی، جەنگە فیکریەکەی لەگەڵ فێندەمێنتالیستە مەسیحییەکانو تاریکبینەکان بەرپادەکات.

کاتێ «ناپلیۆن پۆناپارت» لە ساڵی ١٧٩٨ وەک داگیرکەرێک دەگاتە میسر، قسەیەکی بەناوبانگی هەیەو دەڵێ: (ئەی ســـەربازەکان، لە بەرزایی ئەم ئەهرامانەوە، چل ســـەدە لە مێژوو، تەماشـــاتان دەکات). ئاشکرایە «ناپلیۆن» دوای ئەوەی لەنێوان ساڵانی ١٧٩٦/١٧٩٧ سەرکەوتنە سەربازییەکانی لە ئیتالیا بەدیهێناو بە شـــکۆمەندییو بە خەرمانەیەک لـــە نەمرییو ناوبانگەوە گەڕایەوە بۆ پاریس، بووە بەڵایەک بۆ حوکمکردن، بگرە هەموو ســـەرکردە سیاســـییەکانی فەرەنسا لێیدەترسان، لەسەرو هەموویانەوە کەسێک بەناوی «باراس» بوو. ئەو سەرکردە سیاسیانە بیریان لە باشترین ڕێگا کردەوە بـــۆ ئەوەی خۆیان لە «ناپلیۆن» ڕزگار بکەن، پێش ئەوەی لەوە زیاتر گەورەتربێتو دەســـەڵاتیان لێوەرگرێت. پێشـــنیاریان بۆ کرد ئینگلتەرە داگیربکات، بەڵام «ناپلیۆن» یەکســـەر هەســـتدەکات جێبەجێکردنی کارێکی لەو شـــێوەیە، شـــێتیەکە هیچ شـــتێکی دیکەی بەدواوە نییە. ئینگلتەرە لەو ســـەردەمەدا گەورەترین کەشـــتیگەلی جەنگی هەبـــوو لە جیهاندا، بۆیە مەحـــاڵ بوو بتوانێت بگاتە کەنارەکانی. «ناپلیۆن» پێشنیارێکی دیکەی خستە بەردەم سەرکردە سیاسییەکان، ئەویش لێدانی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیابوو لە ڕێگەی بڕینی ئاڵۆگۆڕی بازرگانی نێوان بەریتانیاو ناوچە کۆلۆنیکراوەکان لە ڕۆژهەڵاتی دوور، واتە هیند. چۆن؟ لە ڕێگەی داگیرکردنی میسرو وڵاتی شام.

ئاشکرایە بازرگانەکانی مارسیلیا، پەیوەندییەکی کۆنو ڕەسەنی بازرگانییان لەگەڵ میسردا هەبوو، بەم شـــێوەیە هەموان بە پرۆژەکەی «ناپلیۆن» ڕازیبوون، لەوانەش «تالێران»ی زۆرزان. سەرکردە سیاســـییەکان پێیانوابوو ئەم هێرشە، ئامرازێکە بۆ دوورخستنەوەی جەنەڕاڵ «ناپلیۆن پۆناپارت» لە ناوەندی دەسەڵات لە پاریس. پاشان «ناپلیۆن» بە سەرۆکایەتی کەشتیگەلێکی جەنگی گەورە، کە ٣٣٥ کەشـــتی جەنگیو ٣٨ هەزار پیاوی لەخۆگرتبوو، بەرەو میسر کەوتەڕێ. لە ڕێگای ڕۆشتنی بۆ میسر، ماڵتای داگیرکرد، ماڵتا نەیتوانی بەرەنگاری ئەم سوپا زەبەلاحەو ئەو کەشتیگەلە گەورەیە

ببێتەوە. دەستەیەکی گەورە لە زانایانو هونەرمەندانو ئەندازیاران، لەگەڵ «ناپلیۆن»دا بوون. کاتێ سوپاکەی «ناپلیۆن» گەشتە کەنارەکانی ئەسکەندەرییە، لە ماوەی تەنها ٢٤ کاتژمێردا داگیریان کرد.

دواتر دانەری کتێبەکە دەڵێ: لەو سەردەمەدا میسر پاشکۆی تورکیا بوو، چەندین سەدەبوو لەژێر فەرمانڕەوایی مەمالیکەکاندا بوو کە بە ئازایەتیو سوراچاکی بەناوبانگ بوون، بۆیە مەمالیکەکان بڕیاریاندا بەرگری لە خاکو لە وڵاتیان بکەن. ئیدی لەو کاتەدا جەنگێکی گەورە لە نزیک (جیزە) ڕودەدات کە بریتییە لە جەنگی ئەهرامەکان. کاتێ جەنگەکە تاودەسێنێ، «ناپلیۆن» بەم پەرەگرافە سەبازەکانی جۆشدەدات: (ئەی سەربازەکان، مێژو تەماشاتان دەکات، لە بەرزایی ئەم ئەهرامانەوە، چوار سەدە لە زەمەن تەماشاتان دەکات، بۆ پێشەوە ئەی سەربازەکان، لە گۆڕەپانی نەبەردیدا سەبرتان هەبێت).

لە واقیعدا «ناپلیۆن» جەنگەکەی دەدۆڕاند، ئەگەر سوپاکەی چەکو تەقەمەنی تازەی نەبوایە کە مەمالیکەکان نەیانبوو، وەک تۆپهاوێژ. لێرەوە شمشێرو ئازایەتی پیاوان، لەبەردەم تۆپە قورسەکانو تەکنەلۆژیای تازەدا، دەتوانن چی بکەن؟ تۆپەکانی «ناپلیۆن»، لاشەی سەربازە ئازاو نەبەردەکانی مەمالیکەکانی، بە هەزاران دەچنییەوە. ئابەم شێوەیە «ناپلیۆن» توانی قاهیرە داگیر بکاتو دەست بەسەر میسردا بگرێت.

دەستەواژەیەکی دیکەی بەناوبانگ لە مێژودا هەیە، وەک ئەو قسەیەی «شارل دیگۆڵ» کە دەڵێ: (فەرەنسییەکان، ئێمە شەڕەکەمان دۆڕاند، بەڵام جەنگەکەمان نەدۆڕاندووە)، ئاشکرایە ئەو کاتێ ئەم قسەیەی کرد کە سوپاکەی «هێتلەر» هاتبووە ناو پاریسو هێڵی بەناوبانگی (ماجینۆ)یان ڕوخاند بوو. لەو ساتەدا تاڕادەیەک هەموو سەرکردە سەربازیو سیاسییەکان خۆیان دا بەدەستەوە، تەنها جەنەڕاڵ «دیگۆل» نەبێت کە لە لەندەنەوە بانگەوازە بەناوبانگەکەی ئاراستەی میللەتی فەرەنسا کرد. لە ئێستادا فەرەنسییەکان بە بۆنەی تێپەڕبوونی ٧٠ساڵ بەسەر ئەو بانگەوازە بەناوبانگەدا، یادی دەکەنەوە.

کۆمەڵێ قسە یان پەرەگرافی دیکەی بەناوبانگ لە مێژودا هەیە، لەوانە: (قورسترین شت بریتییە لە هەنگاوی یەکەم)، (دوای خۆمان با تۆفان هەستێت)، (ئەو بە مردویی گەورەترە تا بەزیندویی)...هتد. هەموو ئەو قسانە دواتر وەک پەندیان لێهات، چونکە لە کاتوساتی خۆیاندا هاتوون. بەشێوەیەکی کورتو پوخت گوزارشتیان لە شتە سەرەکییەکە کردووە.

## سەرچاوە:

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، لاپەڕەی مونتەدای ڕۆشنبیری، ٢٠١٠/٧/١١

# سەبارەت بە هۆشیاری و هۆشیاریی دیموكراسی

محەمەد حەمزە
لە عەرەبییەوە: یاسین عومەر

دیموكراسیەت، ڕێگە دەدات بە دروستكردنی پەیوەندییەكی دەوڵەمەند لەنێوان تاكو كۆمەڵگەدا بەچەشـنێك كە هەردوولا دەتوانن هاوكاریی یەكتریی بكەنو بـەڕووی یەكتردا بكرێنەوەو یەكتری ڕێكبخەنو چاودێریی یەكتری بكەن. دیموكراسـیەت ناكۆكییـەكان ڕێكدەخاتو جەنگە مادییەكان دەگۆڕێت بۆ جەنگی بیروبۆچوونەكان، پاشـان لەڕێی گفتوگـۆو هەڵبژاردنەكانەوە دیاریدەكات كام یەكێ لەم بیرانە بەشـێوەیەكی كاتی سـەردەكەوێت، كێش بەرپرسـیارە لـە پراكتیس كردنی ئەو بیرانە.

یەكێك لە كەموكوڕییەكانی دیموكراسیەتی خۆرئاوایی ئەوەیە هاوڵاتیان سەبارەت بە ئەڵتەرناتیڤە گەورە و شـیاوەكان ڕاوێژیان پێ ناكرێت، بەچەشـنێك كە سیاسەتكردن لە سیاسەت دادەماڵرێتو هاوڵاتـی مافـی نییە بۆ نمونە بیر لە چەكی ئەتۆمی بكاتەوەو چاودێری بكات، ئەم كارە جێهێڵراوە بۆ سـەرۆكی دەوڵەت، بەبێ ئەوەی سـەرۆك لە پەیوەند بەم مەسەلەیەوە ڕاوێژ بە هیچ دەزگایەكی دیموكراسی بكات.

گواسـتنەوە لە سەردەمی بەڵگەنەویسـتەكانەوە بۆ سـەردەمی ئاڵۆزی، بەتوندیو مكوڕییەوە دروسـتبوونی بیرێكی هاوشـان بۆ ئەم ئاڵوگۆڕەی هێنایە گۆڕێ. لە نێـو ئەڵقەكانی ئەم بیرەدا، بیری دیموكراسـی هەیە كە هۆشـیاریی دیموكراسی دەریدەدات كە دژی هۆشیاریی دواكەوتووانەیە. هۆشـیاری بەشێوەیەكی گشتی بنەڕەتەكەی بریتییە لە بەشدارییەكی هۆشیارانە، بەشداریكردنە لە بەدەسـتهێنانی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. كۆمەڵگەی دیموكراسیش بریتییە لە ڕەوتێكی مرۆڤایەتیی

کەڵەکەبووئامێز و پێشـــکەوتوو و ئاوێتە کە هاوڵاتیی دیموکراسیســـت بەشـــێوەیەکی یەکلاکەرەوە بەشداری تێدا دەکات.

ســـێکۆچکەیەک هەیە کە ئەویش بریتییە لە ســـێکۆچکەی (تاک/ کۆمەڵگە/ چەشن). تاکەکان لەوە زیاترن کە هەر تەنها بەرهەمی ڕەوتێک بن کە بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی چەشنی مرۆیی کار بـــکات، چونکـــە ئەم ڕەوتە لە هەمـــوو نەوەیەکدا تاکەکانی خۆی بەرهـــەم دەهێنێت، کارلێکی نێـــوان تاکەکانیش کۆمەڵگە بەرهەم دەهێنێت، ئەمەی دواییشـــیان (واتـــە کۆمەڵگە) لە تاکەکان هەڵدەگەڕێتەوە. ڕۆشنبیری بەواتا گشتییەکەی، لەڕێی ئەم کارلێکانەوە کە بەرهەمیهێناوەو خۆیشی بەرهەمهێناوە، کاردەکات بۆ جیاکردنەوەی کۆمەڵگەو تاکەکان، هەر بۆیە و بەم چەشـــنە (تاکەکان/ کۆمەڵگە/ چەشـــن) چەند ڕەگەزێکی لەیەکتر دابڕاو نین، بەڵکو بەشێوەیەکی هاوبەش یەک یەکتری بەرهەم دەهێنن. هەریەکێک لەم پێکهاتانەش لە هەمان کاتدا ئامرازو ئامانجیشـــە بۆ پێکهاتەکانی دیکە.

چ تـــاکو چ کۆمەڵگـــە ناکرێت بە دابڕاوی لە یەکدی هەبن، بۆیە دیموکراســـیەت ڕێگە دەدات بە دروستکردنی پەیوەندییەکی بەهێز و ئاوێتە لە نێوان (تاک/ کۆمەڵگە)دا، بەچەشنێک کە کۆمەڵگەو تاکەکان دەتوانن بەڕووی یەکتردا بکرێنەوەو هاوکاری یەکتری بکەنو یەک ئەوی تریان ڕێک بخاتو چاودێری یەکتری بکەن. دیموکراســـیەت لەســـەر بنەمای چاودێریکردنی ئامێری دەســـەڵات لەلایەن چاودێریکراوەکانەوە (واتە خەڵک) دادەمەزرێت، پاشانیش کەمکردنەوەی مافی بەکۆیلەکردن (ئەوەی دەســـەڵات جیادەکاتەوە ئەوەیە کە ملکەچی پەرچەکرداری ئەو کەســـانە نابێت کە هەڵدەستێت بە ملکەچکردنیان)، بەم واتایە دیموکراســـیەت لەوە زیاترە کە هەر تەنها سیســـتمێکی سیاسی بێت، دیموکراسی ئەفراندنێکی نوێبووەوەیە بۆ بازنەیەکی ئاوێتەو ڕولەدوا، هاوڵاتیان دیموکراسیەت بەرهەم دەهێننو دیموکراسیەتیش ئەوان بەرهەم دەهێنێت.

کۆمەڵگە دەســـەڵاتخوازو تۆتالیتارییەکان، بەپێچەوانەی کۆمەڵگە دیموکراتییەکان (کە لەســـەر بنەمای ئازادییە فەردییەکان و خســـتنە ئەســـتۆی بەرپرسیاری بۆ ســـەر تاکەکان وەستاوە)، ئەو تاکانـــەی کـــە لەژێر دەســـتیاندان کۆیلە دەکەن. لە دیموکراســـیەتدا تـــاک هاوڵاتییەکە، بەهەموو واتایەکیش کە وشەکە لەخۆی دەگرێت خودێکە سەربەخۆیە، تاک لەلایەکەوە کەسێکە گوزارشت لە هیواو بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکات، لەلاکەی تریشـــەوە کەسێکە بەرپرسە لە شارەکەیو هاوکاری شارەکەی خۆیەتی.

## ڕەهەندی ئاوێتە

وەک چـــۆن هۆشـــیاریی مرۆڤایەتـــی ڕەهەندێکی ئاوێتەو ئاڵـــۆزە، ئەوا هەمان لۆژیک بەســـەر دیموکراسیەتیشـــدا دەســـەپێت، کەواتە ناکرێت دیموکراسیەت بە شـــێوەیەکی سادەو ساکار دیاری بکەین، ســـەروەریی (گەل/ هاوڵاتی) لە هەمان کاتدا بەیاســـاکردنی خودیی بۆ ئەم ســـەروەرییەش

لەخۆدەگرێت، ئەویش لەڕێگەی هێزی یاسـاکانو ئاڕاسـتەکردنی ئەم سـەروەرییە بۆ دەنگدەران، هەروەها دیموکراسـی بەیاساکردنی خودی دەسـەڵاتی دەوڵەتیش لەخۆ دەگرێت، ئەویش لەڕێگەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و مسۆگەرکردنی مافەکانی تاکو پاراستنی ژیانی تایبەتییانەوە.

دیموکراسـی بەسروشتی خۆی پێویسـتی بە پێکهاتنی زۆرینەی هاوڵاتیان و ڕێزگرتنی بنەماو ڕێسـاکانی دیموکراسیەتە، بەڵام لە هەمان کاتدا پێویسـتی بە فرەییو ململانێی جۆراوجۆر هەیە. ئەزموونی ڕژێمە تۆتالیتارییەکان دەریانخسـت کە مۆرکی جیاکەرەوەی دیموکراسی ئەو پەیوەندییە زیندوەیەتی کە بە فرەییەوە هەیەتی. دیموکراسـی کار بۆ گەشـەدان بە فرەیی بەرژەوەندییەکانو فرەیی بیرو بۆچوونەکان دەکاتو ئەم فرەییەش دەسەپێنێت. دیموکراسیەت بەواتا ڕێزگرتن لە فرەیی، دیموکراسـیەت هاوتای ئەو دیکتاتۆریەتە نییە کە زۆرینە بەسـەر کەمینەکاندا پراکتیسی دەکات، پێویسـتە دیموکراسیەت مافی کەمینەو نارازییەکان لە هەبوونو گوزارشت لەخۆکردن لەخۆبگرێت، هەروەها پێویسـتە ڕێگە بدات بیروبۆچوونە لاپرەسەنگ و لادەرەکانیش گوزارشت لە خۆیان بکەن. وەکچۆن پێویسـتە لەپێناو پاراسـتنی ژینگەی ژیانیدا پارێزگاری لە فرەیی جۆرەکانی بوونەوەرە زینـدووەکان بکرێت، ئاواش پێویسـتە لەپێناوی پارێزگاریکردن لە ژیانی دیموکراسـی پارێزگاری لە فرەیی بیروڕاکانو فرەیی سـەرچاوەکانی هـەواڵ (ڕۆژنامە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن) بکرێت. هەر لەهەمان کاتیشـدا دیموکراسی پێویسـتی بە ململانێی نێوان بیروڕاکانە، چونکە ئەم ململانێیانە زیندوێتی و بەرهەمداری پێ دەبەخشـن، بەڵام زیندوێتیو بەرهەمداری ئەم ململانێیانەش گەشـە ناکەن ئەگەر ململانێکان خۆشـیان مل بۆ بنەماکانی گەمەی دیموکراسـی کەچ نەکەن کە ناکۆکیو لێکدژییەکان ڕێکدەخاتو جەنگە مادییەکان دەگۆڕێت بۆ جەنگی بیروبۆچوونەکان و لەڕێی گفتوگۆو هەڵبژاردنەکانـەوە دیـاری دەکات کام یەکێک لەو بیروبۆچوونە ململانێکەرانە بەشـێوەیەکی کاتی سـەردەکەوێت، لەبەرامبەریشـدا کێ ئەو بەرپرسـیارییەی هەیە کار بۆ پراکتیس کردنی ئەو بیرو بۆچوونانە بکات.

## پێکهاتنو ململانێ

ئا بەم شـێوەیەو لەبەرئەوەی دیموکراسـی لە یـەک کاتدا داوای (پێکهاتـنو فرەییو ململانێ) دەکات دەکرێت بوترێت: دیموکراسـی، لە ڕێکخسـتنو شارستانیی سیاسـیانە نەسەقێکی ئاوێتە پێکدەهێنێـت، نەسـەقێک خۆراک دەدات بە سـەربەخۆیی تاکەکانو ئازادیی بیـروڕاو ڕادەربڕینو شارستانیبوونیان، خۆیشی (واتە دیموکراسیەت) خۆراک لە سەربەخۆیی تاکەکان و ئازادیی بیروڕاو ڕادەربڕینو شارسـتانیبوونیان وەردەگرێت، واتە نەسـەقێکە خۆراک بەم نمونە ئایدیاڵیە (ئازادی/ یەکسانی/ برایەتی) دەداتو هەر خۆشی خۆراک لەم نمونە ئایدیاڵیە وەردەگرێت.

ئەم نەسەقە لەنێوان ئەم سێ زاراوە لێک جیایەدا، جۆرە ململانێیەکی داهێنەرانە لەخۆدەگرێت. کەواتە دیموکراسـی نەسەقێکی سیاسیی ئاوێتە پێکدەهێنێت، هەروەها ئەو واتایەش پێکدەهێنێت

کە وای لێدەکات وێڕای پاراستنی یەکێتیی کۆمەڵ، هەر بەهۆی ئەم فۆرمانەوە، لە فرەییو کێبڕکێ و لێکدڕژیدا بژی. بەم شێوەیە دیموکراسی بریتییە لە نەسەقێکی ئاوێتە کە لە هەناوی خۆیدا یەکێتی و لێکترازانـــی تێدایە، دیموکراســـیەت زۆربەی کات و هەندێ جاریش بەشـــێوەیەکی کەفوکوڵئامێز ئـــەو ململانێیانە پەســـەند دەکات و خۆراکیان دەداتێ کە ئەو زیندوویێتییەی پێ دەبەخشـــێت کە هەیەتی، واتە دیموکراسی بەهۆی ئەو فرەییەوە دەژی کە هەیە، تەنانەت لەسەر ئاستی دەوڵەتیشدا (دابەشـــکردنی دەســـەڵاتەکان: یاســـادانانو جێبەجێکردنو دادوەری) بەچەشنێک پێویستە لەسەر دیموکراسیەت ئەم فرەییە بپارێزێت بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت.

پەرەســـەندنی پێکهاتە سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتییەکان خۆراک دەداتە چەشنە جیاوازەکانی ئارەزووی تاکگەرایی، ئەم تاکگەراییەش لە مافەکانی تاکدا بەرجەستە دەبێت (مافەکانی تاک وەکو کەســـێک کە ژیانی تایبەتی خۆی هەیە، هەروەها مافەکانی وەک هاوڵاتی)، ئەم مافانەش لەســـەر بنچینەی چەشـــنە هەمەجۆرەکانی ئازادیە وجودییەکان دادەمەزرێت (واتە هەڵبژاردنی سەربەخۆی هاوبەشی ژیان، نیشتەجێبوون، هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی..).

دەتوانرێت بوترێت سەرجەم تایبەتمەندییە گرنگەکانی دیموکراسی مۆرکێکی گفتوگۆئامێزانەیان هەیـــە، ئەم مۆرکەش بەشـــێوەیەکی تەواوکاریانە کۆکردنەوە لە نێـــوان زاراوە ناکۆک و لێکدژەکاندا دروســـت دەکات: (پێکهاتن/ ململانێ، ئازادی/ یاکســـانی/ برایەتی، کۆمەڵی نیشتمانی/ لێکدژییە کۆمەڵایەتیو ئایدۆلۆژییەکان). دواجار دیموکراسیەت بەستراوە بە مەرجگەلێکی دیکەوە کە ئەوانیش پەیوەستن بە مومارەسەکردنی دیموکراسییەوە (بوونی بیری مەدەنی، پەسەندکردنی ڕێسای گەمەی دیموکراســـی). ئەدگار مۆران دەڵێت هەموو دیموکراســـییەتەکان لەرزۆکـــن و بەهۆی ململانێکانەوە دەژین، بەڵام ئەمەی دواییان (واتە ململانێکان) دیموکراسی بەقوڵاییدا دەبەن، هەروەها دیموکراسی، هێشتا و تاهەنوکەش لە سەرجەم لاکانی ئەم هەسارەیەدا بەگشتیو لە جیهانی عەرەبیدا بەتایبەتی (ســـەرباری جیاوازیی پەراوێزەکانی دیموکراســـیەت لەم وڵات بۆ ئەو وڵات) نەگشتێنراوە، سەرەتای ڕاســـتەقینەش بۆ گواســـتنەوە بەرەو دیموکراســـی ئێستاشی لەســـەر بێت قوربانیی زۆری دەوێت لەلایەن دیموکراتخوازانی عەرەبەوە. بەڵێ جیهان هێشتا چەندین سیستەمی دیکتاتۆریو پاشماوەی کیانگەلێکی تێدایە کە سەدەی بیست ناسیونی، هەروەک بوونی ئەمە سەرچیخچوونێکی سەرەتایی بۆ ســـەرهەڵدانی شمولیگەراییەکی نوێی بەخۆوە بینی، ڕاستە دیموکراسیەت وەک نیشانەئامانجێک بۆ هەرەشـــەلێکردن دەمێنێتەوە، بەڵام ســـەرباری ئەمەش تەنانەت ئەو دیموکراسییانەی کە هەیشن دیموکراسیەتێکی تێرو تەسەلو تەواو نین، بەڵکو دیموکراسیەتگەلێکی ناتەواوو کەموکوڕن.

## دیموکراسیکردنی ناڕێکو پێک

دیموکراســـیکردنی کۆمەڵگە خۆرئاواییـــەکان ماوەیەکی دوورودرێژی خایاند، کە لە هەندێ بواردا بەشـــێوەیەکی ناڕێـــکو پێک بەردەوام بوو، بۆ نمونە گەیشـــتنی ژنان بە یەکســـانیی تەواو لەگەڵ

پیاوان لە زەواجدا، لە كاردا، لە بەدەســـتهێنانی پلەوپایەدا، لە بەرژەوەندییە گشتیەكاندا. ئەزموونی خۆرئاوایی بۆ بەدیموكراسیكردنی ڕێكخستنی ئابووریو كۆمەڵایەتی بۆ كۆمەڵگەكانیان سەركەوتنی بەدەســـت نەهێنا، دامو دەزگاكانی بواری كارگێڕیو تەكنیكی (شـــارەزایی)، ئابووری، بیركردنەوەی چەندایەتی (پشـــكنینو ئامارەكان) وەك خۆیان مانەوە، ئەوەی لە سیاسەت دەمێنێتەوە ئەوەیە كە توانای تێگەیشتن لە ژیان و جۆرو چەشنەكانی گرفتو ناخۆشی و گۆشەگیریو ئەو پێداویستیانەی كە قابیلی داپۆشین نین لەدەست دەدات، هەموو ئەمانە دەبنەهۆی پاشەكشەگەلێكی ترسناكئامێزی دیموكراسی، كە هاوڵاتیان لە گرفتە جەوهەرییەكانی مەدەنیەت دادەبڕن.

گرفتێكی گەورە هەیە كە زیاتر ڕووبەڕوی دیموكراســـیەتەكانی ســـەدەی بیستو یەك دەبێتەوە، ئەدگار مۆران دەڵێت: ئەو گرفتە بەرئەنجامی پەرەســـەندنی ئـــەو ئامێرە گەورەیەیە كە هەریەك لە زانستو تەكنیكو بیرۆكراسیەت لە پەیوەندییەكی توندوتۆڵدان لەگەڵ یەكتری، ئەم ئامێرە گەورەیە هەر تەنها مەعریفەو ڕوونو ئاشـــكرایی بەرهەم نەهێناوە، بەڵكو نەزانیو كوێریشی بەرهەم هێناوە. ئەو پەرەسەندنانەی كە لە بوارە جیاوازەكانی زانستدا ڕوویانداوە هەر تەنها ئیجابیاتەكانی دابەشكردنی كاری لەخۆیـــدا هەڵنەگرتووە، بەڵكو گەنیو خراپییەكانی پسپۆڕیشـــی لەناو خۆیدا هەڵگرتووە كە بریتییە لە نەسەقگەلێكی دەسەڵاتخوازی پلەپلەیی، لەسەر بنچینەی ئەنجومەنو نەقابەكان هەندێك بەش بە دیموكراســـی كراون. بێگومان سنورێك هەیە بۆ دیموكراسیكردنی دامەزراوەكان كە مەودای كاریگەرییان پەیوەستە بە ئاستی ملكەچبوونو گوێڕایەڵییانەوە.

بوژاندنەوەی دیموكراسیكردنی تەواو بریتییە لە هاندانی تاكەكانو كۆمەڵەكان بە ئاڕاستەی گیانی دەستپێشخەریو لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی. بەهەرحاڵ دیموكراسیكردنی خۆرئاواییانە خەوشو كەمایەســـی تێدایە، چونكە لە دیموكراســـیكردنی خۆرئاواییشدا ســـەبارەت بە ئەڵتەرناتیڤە گەورە شـــیاوەكان ڕاوێژ بە هاوڵاتیان ناكرێت. كاروانی ڕولەدوای دیموكراســـیەت گرێدراوە بە كەڵەكەبوونو ئاڵۆزبوونی گیروگرفتەكان، هەروەها گرێدراوە بەو شـــێوازە شـــێوەوەی كە بۆ چارەســـەركردنی ئەو گیروگرفتانە بەكاردەهێنرێت، سیاسەت دابەش دەبێت بۆ بوارگەلێكی جیاواز، كە لە كۆیدا ئیمكانیەتی پەیبردن پێی كەم دەكات گەر نەڵێین نامێنێت.

لە هەمان ناوكۆ(سیاق)دا، دەتوانرێت باس لەوە بكرێت كە سیاسەتكردن لە سیاسەت دامالرێت، بەچەشنێك هاوڵاتی لە خۆرئاوا مافی ئەوەی نییە بیر لە چەكی ئەتۆمی بكاتەوە یان چاودێری بكات، ئەم كارە جێهێڵراوە بۆ ســـەرۆكی دەوڵەت بەبێ ڕاوێژكردن بە هیچ دەزگایەكی دیموكراسیو یاسایی، بۆیە چەند سیاســـەت ببێتە گوزارشتكردن لە تەكنیك ئەوەندەش لێهاتوویی دیموكراسی پاشەكشە دەكات. ئا بەم چەشـــنە هاوڵاتیان لە بوارە سیاســـییەكان دوور و پەراوێز دەخرێن، تا دێتیش ئەم بوارانـــە زیاتر و زیاتر لەلایەن پســـپۆڕانەوە قۆرخ دەكرێن، بۆیە دەكرێـــت بوترێت هەژموونی چینە نوێیەكە (واتە پسپۆڕانی سیاسی) بەبێ دیموكراسیبوونی مەعریفە واقیع دەگۆڕێت. دەتوانین بڵێین قەتیســـكردنو دابڕینی ئەو شتانەی كە سیاسین لەو شـــتانەی كە تەكنیكیو ئابوورییین، هەروەها قەتیسكردنو دابڕینی ئەو شتانەی كە ئابوورین لە مەسەلەی گەشەسەندنو پاشان ونبوونی پێوەرو

ئاســۆکان، هەموو ئەمانە شتگەلێکن دەبنە هۆی لاوازبوونی شــار و هەڵاتنو جوخزخواردنەوە لەناو ژیانی تایبەتی و جموجولانیَ لە نێوان کەمتەرخەمیو ڕودانی شۆڕشــە توندوتیژەکاندا، بەم شێوەیە وێرای پاراســتنی دامو دەزگاکانی دیموکراسی کەچی ژیانی دیموکراسی ڕوبەڕوی نەمانو لەناوچوون دەبێتەوە .

ژیاندنەوەی سەرلەنوێی دیموکراسی ژیاندنەوەی سەرلەنوێی شار دەسەپێنێت، وەکچۆن ژیاندنەوەی سەرلەنوێی شار ژیاندنەوەی سەرلەنوێی هاوکاریو یەکسانیی لە بەرپرسیاریدا دەسەپێنێت.

گەڵاڵەبوونی بیروباوەڕی دیموکراسی وەک داننانێک بە مرۆڤ لە کەینونەو مافە سروشتییەکانی کە بەر لە مافە ڕۆشنبیریو ئایینیو بەرژەوەندییەکانیەتی، بەواتای وەکیەکی نێوان ئەم گەڵاڵەبووەو ئەوەی کە بۆرژوازی لە قۆناغی پێشــکەوتن و پاش پەرەســەندنی شێوازی سەرمایەداری بۆ ڕێسای دیموکراســی تەبەنــی کردوە، کە بەهۆی گوشــاری ئەو زەبرانــەوە نییە کە لە ڕەحمــی بزوتنەوە کرێکارییەکانی ســەدەی نۆزدەوە ڕاچەنیون. یەکێک لە باشــییەکانی دیموکراسی ئەوەیە هەر تەنها وەک تیۆرەیەک بەدەست نەهاتووە بەڵکو بە ڕێگەگەلێکی پراگماتیکی پراکتیزە کراوە .

دیموکراســیەت لــە پەیوەند بە کۆمەڵگەیەکــی وەکو کۆمەڵگەی ئێمەوە هەر لــە بناغەوەو بەر لە هەرشــتێک گەڕانەوەی ئیعتیبارە بۆ بیروبۆچوونەکانی ســەردەمی ڕۆشــنگەری کە مارکس وەک ساتەوەختێکی شۆڕشگێڕانەی مرۆیی ئاماژەی بۆ کردووە .

لــە کۆمەڵگەیەکی وەکو کۆمەڵگەکەی ئێمەدا، لەپاڵ بوونی پەراوێزی دیموکراســی (کە مەگەر نەهیلیســتێک ئەگینــا کەس ناتوانێــت نکۆڵی لێبکات) لەپێناو گواســتنەوەی دیموکراســیانەدا خەبات دەکرێت، خەبات لەپێناو گواســتنەوەی دیموکراســیانەش بەر لەهەر شتێک لە هێزە چەپە دیموکراســیەکان (ئەوانەی لە دۆگمی شۆڕشی نیشــتیمانی دوورکەوتوونەتەوە) دەخوازێت بەرگری لە یەکێتی نیشــتیمانو مافەکانــی هاوڵاتیبوون بکەن، یەکێتی نیشــتیمانیش بەواتەی ئەوەی کە بە دیموکراســیەتو مافەکانی مرۆڤ ڕەوتی جیاخوازی (انفصــال) ببەزێنرێت. بەرگری لە یەکێتیی نیشتیمانو مافەکانی هاوڵاتیبوون نەسەقێکە لە بینین کە لە ڕێی زنجیرەیەکی پێکەوە بەستراوەوە بەردەوام دەبێت، یەکێک لەو هەڵقانەش بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی هاوڵاتیبوونە لەبری جەختکردنەوە لەسەر هۆشیاریی چینایەتی ئەبســتراکت. پێشکەوتن لە بارودۆخی پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی نوێی سۆشیال دیموکراتی کە حیزب بانگەشەی بۆ دەکات هەنگاونان بە ئاڕاستەی خوڵقاندنی هاوڵاتییەکی دیموکراسی دەخوازێت کە کرداری گۆڕینەکە لەخۆیەوە دەست پیَ دەکات، چونکە دواکەوتنی دەوڵەت درێژبووەوەی دواکەوتنی کۆمەڵگەیە . چاکسازیی دەوڵەتو کاریگەری دانان لەسەری لەپێناو مافەکانی مرۆڤ کە بۆتە ڕێکخراوەیەکی ڕۆشنبیریی ڕێنوێنیکەر، تەنها بە دروستکردنی هاوڵاتیبوونێکی نویَ و کۆمەڵگەیەکی مەدەنیی سیاســیی هاوچەرخ و تەرکیز خستنە سەر بواری ڕۆشنبیریو دەستەییو خەباتی سەندیکایی تا دەگاتە جەختکردنەسەر بەشداریکردن لە دامەزراوەکانی نوێنەرایەتیی گەڕەکو ئەنجومەنی نیشتیمانیو تواندنەوە لە ناو بۆتەقەی خەباتی گەردوونیدا، دەبێت.

گواستنەوە بەرەو دیموکراسی بۆ خۆشــیی نییە، بەڵکو پێداویستیگەلێکی ئەو دیموکراسییەیە

کە ژێر هەڕەشــــە کەوتووە، کە بەهۆی هەڵەو شوێنەوارەکانی ڕابردوویەوە دوچاری بووە، کە بریتین لە: ســـاختەکردن لە هەڵبژاردنــــەکان، تەنینەوەی توندوتیژیو کۆیلایەتــــیو ملکەچیی پەیوەندییە خزمایەتییەکان.

وڵاتی مەغریب وێڕای گیروگرفتەکانی کە هەر تەنها بە بارودۆخی لەبەریەک هەڵوەشاوی ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە ناوەســـتێت، بەڵکو سەرباری ئەوەی کە بەدەست بەڵگەنەویستە ئایینییەکانو ڕقو کینە نەژادییەکانەوە دەناڵێنێت بەر لەمپەرێکی دیکەش دەکەوێت کە بریتییە لەوەی: دیموکراســــی لەدایکبووی نەســــەقێکە لە (بەهاگەلێک) کە لای داگیرکەری پێشــــوو (ئیســــتعماری فەرەنســــی) باڵادەســـت بووە، پاشـــانیش بەنیسبەت ئێمەوە ســــەختییەکان هەر تەنها لە زەرووڕەتی پێکهاتنی نێـــوان بەرهەمی هێنراو و حەساســـیەتە ناوخۆییەکان و کارکردن بۆ دروســـتکردنی وێنەگەلێک لە وێنەکانی دیموکراســـیەتێکی گونجاو بۆ ئەو نیشـــتیمانە نیە کە لەبارەیەوە دەدوێین، نەخێر بەڵکو لە چۆنیەتی ڕووبەڕوو وەســـتانەوەی ئەو کەســـە شـــومانەیە کە دیموکراسیەت تەنها وەک داهێنراو و گەمەیەکی ئەهریمەنانە لە گەمەکانی تاک دەیبینن.

گواستنەوە بەرەو دیموکراسیەت کە هاتنەکەی لەوە زیاتر تێینەپەڕاندووە هێرشێکی وردوخاشکەری ســـەرمایەدارییی بەجیهانیکراوو ناردەکردنی دیموکراســـیەتیی ئەمریکـــی و کێبەرکێی ئابوورییەکی دڕندانـــەو جیهانیو دەستبەســـەراگرتنی کۆمەڵایەتی کە ٤٠ ســـاڵ بیناکراوە، نە گەشـــەی هێناو نە دیموکراســـی، سیاســـەتی تەوافوقی و گرێبەســـتئامێز دەخوازێت کە ڕێگە بدرێـــت بە تێپەڕبوونی ئاشتییانەو گرێبەستوانە بەرەو دیموکراسیەت وەک میکانیزمێکی فەلسەفیو ئامڕازێک بۆ ڕاپەڕاندنی فەرمانڕەوایەتیو بەتەکنیککردنی جیـــاوازی و گۆڕینی ئەم جیاوازییانە بە ئامڕازێک لە ئامڕازەکانی گەشە، گەشە بەبێ ئازادی نابێت، بەواتا بەرفراوانەکەی گەشە بەبێ بوونی سەرجەم ئامڕازو تواناکانی مرۆڤی ئازاد لە سەپاندنی ئیختیارو دروستکردنی ژیان ڕونادات.

گەشـــە/ پەرەسەندن، پرۆســـەیەکە بەڕێوەبردنی بازاڕو فەرمانگە حکومییەکانو پەیوەندییەکانی نێوان فەرمانڕەواو فەرمانبەرانو دامەزراوەکانی یاســـادانانو پارتە سیاسییەکانو دامەزراوە دادوەریو ڕاگەیاندنو فێرکارییەکان و هەموو کۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتی دەگرێتەوە.

مۆرکی پیرۆزیی دانە پاڵ پەیوەندییە سیاسییەکان یەکێکە لە ڕێگرییەکانی بەردەم دیموکراسیو دەشـــێت لەگەڵ سەروەریی کەســـی ئازادو پێگەیشـــتووی دنیاخوازدا یەک نەگرێتەوە. قایمڕاگرتنی دیموکراســـیەت بەرپرســـیاریی دیموکراتخوازانو هێـــزە دیموکراتییەکانە، چونکە ئـــەم کارە (واتە قایمڕاگرتنـــی دیموکراســـیەت) دەتوانێت هەموو ڕێگریو لەمپەرەکانی بەردەم گۆڕین بە ئاڕاســـتەی دیموکراســـیدا وەلابنێت وەک ئایدۆلۆژیاکانی دەوڵەتو کۆمەڵگەو ئەو مەرجەعیەتانەی کە زیادەڕۆیی دەکـــەن لە هەڵگوتن بە ڕابوردوو و تایبەتمەندییو ناســـنامەی ڕۆشـــنبیریو حەزاریداو بەشـــداری دەکەن لە داپۆشینی واقیعی مێژوویی دواکەوتوو لە بڵاونەکردنەوەی کولتووری ئازادیدا، تاقمەکانی بەرهەڵســـتیکردنی نۆژەنکردنەوەی سیاســـیو ئایدۆلۆژیو دیموکراســـیکردن، لەناو دەســـتەبژێرە هاوچەرخەکانیشـــدا دەبینین کە لە شێوەی دەستگرتن بە ڕەوایەتی نیشتیمانیی ڕەمزیو بەکردەوەو

پاراستنی پێگە جێبەجێکارەکان لە پارتەکانو لە پانتایی سیاسیدا خۆیان دەشارنەوە، یان لە شێوەی پاساودانەوەی بارودۆخی سیاسیی ئێستادا بەناوی بەرهەڵستیکردنی مەترسییە دەرەکییەکان یان لەژێر گوشاری تەوژمی گەشەسەندندا خۆیان مەڵاس دەدەن.

سەرکەوتنی دیموکراسی گرنگیو بایەخی بەکردەوەو هۆشیارانەی جەماوەر دەخوازێت، ئەو هۆشیارییەی کە ناتوانرێت لە شەوو ڕۆژێکدا و بە بڕیارێک یان بە (کن فیکن)ێک گەڵاڵە بکرێت، بەڵکو سەیرورەیەکی دوورودرێژە کە جەماوەرو پارتەکانی بە مەبەستی بەرێخستنی ڕاسانێک (بەواتا گشتگیرە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیرییەکەی) وانەو شارەزایی تێدا کەڵەکە دەکەن.

لە کۆتاییدا، ئێمە لەبەردەم ڕاپۆرتی دەستەی ئینسافو ئاشتبوونەوەداین، ئەوەی کە ئەم دەستەیە پێیهەستاوە ڕوداوێکی سەرپێیی نییە، بەڵکو بەردی بناغەیە لەپێناو بەشێکی هەقیقەتدا، واتە بەشێکە لەو دەستکەوتە دیموکراسیانەی کە لەبواری مافەکانی مرۆڤدا بەدەست هاتوون، هەروەها ناکرێت نکوڵی بکرێت لەوەی کە دۆسیەی پێشێلکاریە ترسناکەکانی مافەکانی مرۆڤ لە ڕێی کاری دەستەی ئینسافو ئاشتبوونەوەدا هەنگاوێکی بۆ پێشەوە ناوە، لەگەڵ ئەم هەنگاوەشدا ئەم بابەتە لە چەندین لایەنییەوە بە کراوەیی ماوەتەوە، جا ئەو لایەنە چ پەیوەست بێت بە زانینی هەقیقەتی تەواوەوە کە ڕاپۆرتەکە خۆشی دان بەمەدا دەنێت یان ئەو لایەنانەی کە پەیوەستن بە گرەنتییە دەستووریو دامەزراوەییو دادوەریو کارگێڕییەکانەوە، بۆئەوەی ئەو حاڵەتە دوبارە نەبێتەوە کە ڕویدا و لە سزا قوتاریان نەبێت.

کاری حقوقی هێشتا تەواو نەبووە، بەڵام هەر ئێستا کارە بەراییو پێشەکییەکانی لە گۆڕەپانی سیاسیدا دیارن. ئایا ئێستا بە دەستوورێکی دیموکراسیی تێرو تەسەلو بێگەرد یان بە دەستوورێکی ئینتیقالی کە هۆشیاریی دیموکراسی کۆمەڵگەیی لەبەرچاو بگرێت دەتوانین ئەو کارە بکەین یاخود بە کۆنگرەیەکی تەئسیسی یان بە ... هتد.

ئێمە، لەپێناو ڕزگارکردنو پێشخستنی چاکسازیی دەستووریی ئەم قۆناغەمان یەکەمجار پێویستیمان بە ئیرادەیەکی سیاسی بەکۆمەڵی گرێبەستئامێزانە هەیە، کە لەپێناو چاکسازییە ئابووریو کۆمەلایەتیو ڕۆشنبیریەکانو بەزاندنی جوداخوازی بە دیموکراسیەتو سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی ڕەوشت بۆ کاری سیاسی وەک کارێکی مێرخاسانەو گشتی لەپێناو دیموکراسیکردنو پێشکەوتنو نۆژەنکردنەوەو تێپەڕاندنی دواکەوتنی مێژوویی، لە پێگەیشتوویی گشتیی دیموکراسیەتیی کۆمەڵگە تێبگات.

## سەرچاوە:

http://www.alhourriah.org/?page=ShowDetails&Ides

# بلیمەتی و شێتی

هاشم سالح
لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

لە پەراوێزی کتێبی باسکاری فەرەنسی فیلیپ بریدنو: بلیمەتی و شێتی لە نیگارکێشان و موسیقا و ئەدەبدا.

ئایا دەتوانین لێکدانەوەیەک بۆ ئەو قەیرانە هیستریایانەی ڕامبۆ بکەین لەو کاتەدا کە هەردوو کارە ناوازەکەی: فەسڵێک لە دۆزەخ و درەوشانەوەکانی دەنووسی؟ ئەی نهێنی ئەو حاڵەتەی عوسابی (نیرۆسس) و خەمۆکیە چیە کە هەندێک جار گۆتەی پیا تێدەپەڕێ؟ ئەی دوودڵیە گەورەکەی کیرکیگارد و کافکا و ڕێلکە چ مانایەکیان هەیە؟ ئەی ڕاتان بەرانبەر بە کولیردج و بۆدلێر و کۆکتۆ چیە کە بەو ڕادەیە حەزیان لە مادە هۆشبەرەکان هاتووە؟ ئەی هەڵچوونە میزاجیە سەیرەکانی مایکل ئەنجیلو بەچی لێک دەدرێتەوە؟ ئەی مەیلە خۆکوژیەکەی گۆگان و ڤان کوخ و ڤیرجینا وڵف و چەندانی دی چۆن شرۆڤە بکەین؟ ئایا هیچ پاساوێک بۆ هەرەسهێنانی ئەقڵی نیچە هەیە لە کاتێکدا کە لەوپەڕی داهێنان و بلیمەتیدا بووە؟ ئەی چی بە شێتیەتی گی دی موباسان دەوترێت لە کاتێکدا لە لووتکەی گەنجی و بەخششدا بوە؟ ئەی چی بە شیزۆفرینیا ترسناکەکەی ئانتۆن ئارتۆ بڵێین؟ یان خەمووکیە دەروونیە قووڵەکەی بیتهۆڤن و بیساواو فتگنشتاین..؟ ئەی ورێنە سەرسوڕهێنەرەکانی جان جاک رۆسۆ؟ یان نۆرە پەرکەمە ترسناکەکانی دۆستۆیفسکی؟ هتد..

ئەم لیستە ترسناکە تا ناکۆتا درێژەی هەیە و دەیان نووسەر و هونەرمەند و فەیلەسووف و نیگارکێش دەگرێتەوە. کاتی ئەوە هاتووە فایلێک بۆ ئەم بابەتە زۆر گرنگە بکرێتەوە. ئاشکرایە بلیمەتی ئەم کەسایەتیە ئاوارتانە هاوشانە لەگەڵ شێتیەتیدا، ئەوەیش ڕوونە کە مەستیی داهێنان لای ئەم داهێنەرە گەورانە هەندێک جار هاوئاهەنگە لەگەڵ خەمۆکی و خەمێکی یەکجار قووڵدا.

لەم کتێبەدا — بلیمەتی و شێتی لە نیگارکێشان و موسیقا و ئەدەبدا — کە باسکاری فەرەنسی فیلیپ برینو نووسیویەتی، نووسەر باس لە چارەنووسی ئەو کەسایەتیە گەورانە دەکات و ئەم پرسیارە گرنگە دەوروژێنێت: ئایا داهێنان لە شێتی ناوەوەو ئازاری گەورەوە خواردن و زیندە خۆراکی خۆی بەدەست دێنێت؟ ئەی پێویستە بلیمەتی بە چەند قۆناغێکی شکستی دەروونی و خەمۆکی قووڵدا تێبپەرێت کە چ لێکدانەوەیەک هەڵناگرێت؟ بە جۆرێکی دی: ئایا باجی بلیمەتی تا ئەم رادەیە قورس و گرانە؟ لە حاڵەتێکی وادا دەبێت خۆزگە بە خۆمان بخوازین کە بلیمەت نین؟ ئەی چارەسەری دەروونی کەی دەگاتە ئەو ئاستەی رووناکایی بخاتە نێو وێڵگە و نهێنیەکانی داهێنان و بلیمەتیەوە؟ تۆ بڵێی رۆژێک لە رۆژان ئەو ئەنجامە بدۆزێتەوە؟

زۆربەی خەڵکی لەو دۆزینەوەیە بەگومانن؟ بڕوایان وایە بلیمەتیی نهێنی نهێنیەکانە و کە دۆزرایەوە کاریگەریی نامێنێت یان لە بلیمەتیی دەکەوێت. بلیمەتیی نادیاریەکی گەورە و ئەو هێڵە سوورەیە نابێت کەس لێی نزیک بکەوێتەوە. بلیمەتەکان تاقە کەسن لە ئاکارێکدا لەگەڵ خودادا هاوبەشن ئەویش بریتیە لە: چێژی دروستکردن و کیمیای داهێنان.

تەوەری ئەم کتێبە بە چێژ و پڕ لە شتی سەیر و سەمەرەو شیکاریی قووڵ لەبارەی ژیانی داهێنەرە گەورەکانەوە دەربارەی هەموو ئەم پرسیارانەیە کە نووسەرەکەی — فیلیپ برینو- نووسەر و پزیشکی دەروونی و مامۆستای زانکۆی سۆربۆنە.

نووسەر لە کتێبەکەیدا بە جۆرێک لە جۆرەکان پێمان دەڵێت: زوربەی بلیمەتەکان تووشی شپرزەییەکی توندی دەروونی هاتوون، هەندێک جار بێ هیچ ئامادەکاری و پێشینەیەک لە ناکۆکیەکی سەرانسەریدا دەژین، لە دژەوە بۆ دژ. جار هەیە لە چرکەساتی داهێنانی دەگمەندا سەردەکەونە لای خودا، جاری تریش لە ناو دەمارگرژی و خەمۆکی دەروونیدا مەلەیانەو دادەبەزنە ژێری ژێرەوە. بۆ نموونە شاعیری فەرەنسی جیرار دو نیرفال بەرهەمە ناوازە و نەمرەکانی لە خەستەخانەی شێتاندا، یان بابە ڕێزەوە بڵێین لە نەخۆشخانەی ئەقڵیدا دەنووسی. نەخۆشیەکەیشی لە جۆری هێستریا و خەمۆکیە قووڵەکان بوو. واتا هەندێک جار حەماسەتی زۆر و توانای داهێنانی دەخرۆشا. کەچی جاری دی دەکوژایەوە، تەنانەت نەیدەتوانی تاقە وشەیەک بنووسێت یان لەگەڵ کەسێکدا پەیوەندی هەبێت. ئەمە پێی دەوترێت نۆرەشێتی. واتا ئەو شێتیەی ناوە ناوە دێت، بەپێی وەرزی ساڵ یان مانگەکانی ساڵ. ئەم شاعیرە، دوای گەڕانەوەی لە گەشتی ئیتالیا و بەلجیکا، شێتیەتیەکەی بەتەواوی تەقیەوە، کەوتە وڕێنەیەکی سۆفیانەی کەمێک تێکەڵ بەلایەنی سایکۆلۆژی، بوو بە زانای رۆحی یان ئامادەکەری رۆحەکان: بەو مانایەی گوێی لەو دەنگانە دەبێت کە لە دنیای ترەوە دێن. پاشان وڕێنەکانی بوون بە جۆرێک لە نەخۆشیی خۆبەزل گرتن. بڕوای وابوو لە نەوەی ئیمپراتۆرەکانی رۆمانە، لە کاتێکدا کە تەنانەت کەپرۆکەیەکی لە پاریسدا نەبوو تیا بژی (لای پووری دەژیا) ئەو وای بیردەکردەوە کۆشکی لەنێو دەشت و دەری فەرەنسادا هەیە.

جیرار دو نیرفالی شاعیر لەگەڵ وڕێنە و شێتیەکەیدا، بەڵام لە کۆتاییەکانی ژیانیدا توانی جوانترین و ترسناکترین چیرۆک بنووسێت کە — (ئۆریلیا)- بوو. لەوێدا باس لە شێتی خۆی دەکات

و لێژبوونـــەوەی بـــەرەو قاتی هەرە خوارەوەی دۆزەخ و ئەو ئـــازارە دەروونیەی وێنەی نیە . هەروەها بـــاس لە خەونێکی زۆر ســـەیری خۆی دەکات کە لە خەودا ئوریلیا-ی هـــەرە جوانی بینیوەو بەمی وتوە خۆشـــم دەوێیت و ئیدی ترس و شـــێتیەکەی دامرکاوەتەوە . ئەمە چیرۆکی خەیاڵی شـــیعرییە کە واقیع لەگەڵ ســـەرووی واقیع و دنیای ســـەرزەوی لەگەڵ میتافیزیکیادا تێکەڵ بەیەکدی دەبن، چونکە بە پێچەوانەی بۆچوونەکانمانەوە دابڕان لە نێوان ئەو دوو جیهانەدا نیە . پردێکی پەیوەندیی نهێنی هەردوو دنیای بینراو و نەبینراو پێکەوە دەبەســـتێت کە ڕەنگە ئەمەی دوەمیان ڕێک لە دوای بینراوەکەوە بێت. لەو دنیایەی ترەوە ئۆریلیا دەردەکەوێت و بە پەرۆشیەوە هاوار لە شاعیر دەکات: من دایکتم، من هەموو ئەو ژنانەم بە درێژایی ژیانت خۆشت ویستوون، مەترسە و ئێمە لەگەڵتاین. لەوانەیە ئۆریلیا خودی مریەمی پاکیزە بێت.

جیرار دو نیرفالی شاعیر مرۆڤێکی خۆش ڕەفتار بوو، گومانی تێدا نیە کە لە مێژووی فەرەنسادا، پاک و بێگەردترین دەنگی شـــیعریی ئەو وڵاتەیە . بەڵام وەک هەر مرۆڤێکی هەستیار لە ناکۆکیەکی دەروونی وادا دەژیا کە چارەسەرکردنی مەحاڵ بوو.

لـــە ڕابووردوودا خەڵکـــی وا بیریان دەکردەوە کە شـــێتی لەلایەک و ئەقـــڵ لەلایەکی ترەو هیچ پەیوەندیەکـــی هاوبەش لە نێوان ئەو دوانەدا نیە . مرۆڤـــی ئاقڵ — بلیمەت ئەوە هەر هیچ — چرکە ساتێکی شێتی بە خۆیەوە نابینێت. بەڵام زانستی تازەی پزیشکی ئەوەی دۆزیوەتەوە کە بلیمەتیی بێجگە لە دەرەوشـــانەوەیەکی شێتی هیچی تر نیە . یان با بڵێین بلیمەتیی ئەو پەرگیریە و شێتیش هەروایە . بۆیە بێ هوودەییە داوا لە بلیمەت بکرێت وەک کەســـانی دی ئاســـایی و سروشـــتی بێت. ئەگـــەر داوای ئەوە لە بلیمەت بکرێت مانای وایە بلیمەتیەکەی دەکوژیت و دەســـتدرێژیی دەکەیتە ســـەر ئازیزترین شـــتی ئەو کە: ناوازەیی و نامۆیی و گوێ نەدانیەتی بە ڕێ و ڕەســـمی باو. میشێل فۆکـــۆ بەردەوام بەدەم پێکەنینەوە ئەم ڕســـتەیەی دەوتەوە: هاوڕێیـــان، نامۆییە خودیەکەتان پەرە پێبدەن، بێ شـــەرم کردن شـــێتیە تایبەتیەکەتان تێر بکەن، خۆتان چۆنن وا بن، ئەوانەی خۆشیان ناوێـــن بـــا چی دەکەن بیکـــەن.. گوێ لە وتەوت مەگرن و ســـەر بۆ حوکمە تەســـک و چکۆڵەکانی کۆمەڵـــگا دامەنەوێنـــن.. ئەگەر وا نەکەن و ملکەچ بن هەرگیز نابنە داهێنەر. هەرچۆنێک بێت گومان لەوەدا نیە و هەموو قەناعەت بەوە دەکات کە کەســـی بلیمەت کەسێکی شێتۆکەیە . بەو مانایەی لە ناوەوەیدا شەیتانێک یان حاڵەتێکی دەروونی زۆر تایبەت یان دوودڵیەک هەیە . نووسەری فەرەنسی ناودار ســـتاندال دەڵێت: بلیمەت کەسێکی شێتۆکەیە بە بیرۆکەکانی و ئازاریان لێ دەچێژێت. هەر لەبەرئەوەیە کە ناچارە قەڵەم بگرێتە دەســـت و زیاد لە خەڵکانی دی تەعبیر لە خۆی بکات. بۆیە کاتێک هەر نووســـەرێک دەخوێنیتەوە پێویستە پرسیار بکەیت: چی ئەم نووسەرەی جووڵاندوە؟ چ شتێکی ناوەوە دنەی نووسینی داوە؟ بۆچی بێدەنگ نابێت؟

پزیشـــکی سایکۆلۆژی و زانای ئەنترۆپۆلۆژی فیلیپ برینو وای دەبینێت کە خەمۆکیی دەروونی سیفەتی هەموو داهێنەرە گەورەکانە . ئەو کەسەی هیچ گرێیەکی دەروونی یان زامێکی ناوەوەی نەبێت پێویستی بەوە نیە ببێتە نووسەر یان بلیمەت. بۆ نموونە ناپلیون زۆر کورتە بالا بوو، لەباتی ئەوە

دەستی بەشەڕ کرد و سەرکەوتنی زۆری بەدەست هێنا. دیارە کە ئەفلاتوون و ئەرەستۆ و ئەبیکۆر و موزارت و بەلزاک و سپینۆزایش هەر کورتە بالا بوون. بەڵام تەندروستیی مارسیل برۆست و شۆپان زۆر خراپ بووە. بۆیە لەبری ئەوە پەنایان بردۆتە بەر نووسینی داهێنەرانە و مۆسیقای ناوازە.

هەر بلیمەتێک گرێیەکی دیاریکراوی هەیە، رەنگە ئەو گرێیە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاواز بێت، بەڵام هەموویان تووشـــی هاتوون. بیتهۆڤن کەڕ بـــوو، دەتوانین بڵێین بلیمەتیی مەعەڕیش بەهـــۆی ئەوەوە بوە کە کوێر بوە. هەروەها تەها حســـەینیش. هەر کەســـێک ناتەواویەکی تیا بێت بەزەبرە! ئەم گرێیە کەرامەتی شەخســـیان یان نێرجســـیەتیان بریندار دەکات، بۆیە بۆ داپۆشین و تۆڵەی برینەکانیان دەیانەوێت لە بوارێکدا زۆر زەبر بەدەست بن. بە گشتی شیکاری دەروونی نهێنی داهێنانمان لەم ڕوانگەیەوە بۆ لێک دەداتەوە.

لـــەم بارەیەوە ســـەرنجێکی تریش هەیە کـــە زوربەی بلیمەتەکان ژن ناهێنـــن و هەر بە ڕەبەنی دەمێننەوە. نیچە دەڵێت: ئەو فەیلەسووفەی ژنی هێناوە مایەی پێکەنینە، فەیلەسووفی راستەقینە لە ژیانیدا یەک شت دەهێنێت: فەلسەفەکەی، ئازادیەکەی، بلیمەتیەکەی. بێگومان ئەمە بەو مانایە نیە کە ماوە ماوە پەیوەندیی خۆشەویســـتی و دڵدارانەی نەبێـــت، بەڵام ئەو پەیوەندیە لە دەرەوەی هاوســـەرگیریی و ترادیشـــنە بێزارکەرەکان و زیندانی کردندایە، با ئەم نـــاوە گەورانە بخوێنینەوە: دیکارت، لایبنتز، مابرانش، کانت، شـــۆپنهاوەر، سپینۆزا، مایکل ئانجیلۆ، نیوتن، لیوناردو دافنشی، ڤۆڵتێر، شاتۆبریان، بیتهۆڤن... هتد.. هەموو ئەم ناوانە ڕەبەن بوون. بەڵام ئەمە ئاوارتەی گەورەیشی تێ دەکەوێت لە بابەتی: هیگڵ، مارکس، فرۆید.. هەندێک جار هاوسەرگیریی و سەقامگرتن پەرە بە بلیمەتی دەدات.

لـــەوە دەچێـــت بلیمەت ئەوەندە شـــێتی داهێنانەکەی بێت تا ئەو ڕادەیـــەی خۆی لەبیر بچێت. هاوســـەرگیریی و نەوە خســـتنەوە فەرامۆش بکات. لە ڕاســـتیدا بەرهەمەکانی جگەر گۆشـــەیین*. ئەمەندەیشی خۆش دەوێت و پارێزگاری لێدەکات کە دایک منداڵەکەی خۆش دەوێت و دەیپارێزێت. وەک چۆن ژن بە منداڵ ئاوس دەبێت، ئەویش ئاوسە بە داهێنانەکەی. بۆیە ناتوانێت دوو جار منداڵ بخاتـــەوە. یان لە یـــەک کاتدا بایەخ بە دوو خێزان بدات. ئەوەندەی بەســـە یەکجار منداڵ بخاتەوە. گوڵە بەدەکانی بۆدلێر لە هەزار وەچەخســـتنەوە گرنگترە.. بۆ؟ چونکە هەموو کەســـێک دەتوانێت وەچـــە بخاتەوە، بەڵام ناتوانن — گوڵە بەدەکان — بنووســـن. بۆدلێـــر بەردەوام حەزی بە هەژاندن و تەحـــەدای دنیای دەرەوەو دەوروبەری کـــردوە. هەموو ئەوەیش بەرەنجامی ئەو برینە قووڵانە بوە کە بەر ژیانی کەوتوون. لە سەرەتادا کەس دانی بە شیعرو بەهرەیدا نەناوە. تەنانەت لە کۆتاییشدا هەر دانی گەورەی پێدانەنراوە. بەڵکو ئەو دوای مردنی ناوبانگی نارنجۆک ئاسا تەقیەوە، بە تەواویی وەک نیچە. ئەو لە لایەنی ئابووریەوە پاشـــکۆی دایکی بوو، ئەویش بەپێی ئارەزووی خۆی پارەی دەدایە یـــان هەر نەیدەدایـــە. دایکی وەک منداڵ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، تەنانەت دوای ئەوەیش کە بوو بە پیاوو تەمەنی بوو بە ســـی چل ســـاڵ، وایان لە قەڵەم دابوو کە دەســـتە پاچەیە و ناتوانێت خۆی خۆی بەخێو بکات. بۆیە وەک سەرپەرشـــتیار یەکێکیان بۆ دانا. ئەمە بۆ ئەو سووکایەتی پێکردن و

بریندارکردنی کەسایەتیی بوو. بێجگە لەوەی کە دوای مردنی باوکی بە ماوەیەکی کەم دایکی شووی کردەوە . ئەمەیان ئەو زەبرە هەرە ترسناکە بوو کە لە مێژووی ژیانیدا نەهاتەوە سەرخۆی و نەیتوانی لەو ناپاکیە گەورەیەی دایکی خۆش بێت. بۆیە وای لێ هات بە چاوی سووکەوە تەماشای کۆمەڵگا و پەیوەندییە باوەکان بکات و تا بێت زیاتر بکەوێتە ناو پەراوێزو، بەرەڵایی و تلیاک کێشان و شەراب خواردنەوەوە، هەروەها لە شەقامی موفتاری پاریسدا بچێتە لای لەشفرۆشەکان تا لە دواییدا تووشی نەخۆشیی سوزەنەک بوو کە نەخۆشیەکی هەرە ترسناکە، ئەو نە بڕوای بە ژیان ما نە بە سیستمی شــتەکان. ئەنجامی ئەو بەپەراوێزیە ڕەش و ئازاراویـــە و خلۆربوونەوەی بۆ خواری خوارەوە، دیوانی مودێرنەی ئەوروپی بوو، دیوانی: گوڵە بەدەکان. وەک ئەوەی ژیانی بەختەوەری و ســەرکەوتنی ناو کۆمەڵ دوژمنی هونەر بن. دەبێت تەواو بسووتێت بۆئەوەی لاپەڕەیەکی بە مانا بەدی بێنێت.

ئایــا بلیمەتیی پەیوەندی بــە دنیایەکی ترەوە هەیــە بێجگە لەوەی کە ئێمــە دەیزانین؟ ئایا بلیمەت دەنگی نائاســـایی دەبیستێت و ئەو شــتانە دەبینێت کە ئێمەی مرۆڤی ئاسایی نایبینین؟ هەندێک وای دەبینن. زانای ســـایکۆلۆژی "لولــوت" Lelut لە لێکۆڵینەوەیەکی بەناوبانگیدا بە ناوی "شەیتانی سوکرات" ئەوەی سەلماندوە کە سوکرات گوێی لەو دەنگانە بوە کە بانگیان کردووەو کەس نەیبینیون، بۆیە هەندێک جار وڕێنەی کردووە یان تووشی هێستیریا بووە . ئەو دەیگوت دەنگێک لە ناوەوەی خۆیدا دەبیستێت هەر ئەو دەنگەیشە کە ناهێڵێت کاری ناپەسەند بکات. ئەمە بەو مانایەیە کە بەربەستە ویژدانیەکەی زۆر بەهێز بوەو ئەمەیش لە خۆیدا ڕەوشت بەرزیی ئەو دەردەخات. بۆیە ســەیر نیە لەوە پاشــگەز نەبوەوە کە بڕوای پێی بوو و بە ڕاســتیی دەزانی، هەر بۆیە بۆ بەرگریی كــردن لە هەقیقەت ژەهرەکەی خــواردەوە . ئەمە نموونەی باڵای قوربانیدانە لە ڕێگای هەڵوێســتی فیکریدا. ئەم ســیفەتە تەنیا لای گەورە پیاوانی وەک عیســا و محەمەد و لۆسەر و جان جاک ڕۆسۆ هەیە . لە ڕاستیدا پزیشکی دەروونی بەناوبانگ جان ئیتیان ئیسکرۆڵ لە لێکۆڵینەوەیەکی گرنگیدا ئەوەی ســەلماندوە کە محەمەد و لۆسەر و کاتون و باسکاڵ و جان جاک رۆسۆ بە هەمان پێکهاتەی ســایکۆلۆژیەوە بەشــداریان کردووە . یان بە هەمان ئەو خولیا دەروونیەوە کە لە ناوەوەیاندا ئاگری بلیمەتیی داگیرساندوە .

تایبەتمەندیەکــی تر هەیە بلیمەتەکان لە خەڵکی دی جیا دەکاتەوە، ئەویش پێشــبینی کردنی شــتەکانە، یان هەســت پێکردنیەتی پێش ئەوەی ڕوو بدەن. بلیمەتەکان رادارێکی ناوەوەی خۆیان هەیە هەموو نهێنی و تاریکیەکان دەدۆزێتەوە . ئەمەیش تەنیا پەیامبەر و بلیمەتە گەورەکان هەیانە لە بابەتی جان جاک ڕۆســۆ کە پێش ئەوەی شۆڕشــی فەرەنســی ڕووبدات ئەو پێشبینی ڕوودانی شۆڕشــەکەی کرد و بە ڕوونی و سەرســووڕهێنەرانە لە دەقدا باسی کرد. شاعیری گەورەی ئەڵمانی — گۆتــە — وای دەبینێت ئەو کارە ئاوارتانەی بلیمەتەکان بەرهەمی دێنن، بەرئەنجامی کەســایەتی فشــۆڵە لە باری دەروونیەوە . ئەو فشۆڵیە دەروونیە یان جەستەییە وای لێکردوون هەست بە شتی دەگمــەن بکەن کە خەڵکانی دی هەســتی پێ ناکەن. لێرەوەیە گرنگی نیوروســس یان نەخۆشــی دەروونی دەردەکەوێت ئەوانە تەنیا لایەنی نەگەتیفیان نیە بەڵکو لایەنی پۆزەتیفیشــیان هەیە . ئەو

بلیمەتانە دەرفەتی ئەوەیشـــیان هەیە دەنگە ئاسمانیەکانیش ببیستن. بەڵام ئەم پێکهاتە دەروونیە فشـــۆڵەی کەسی بلیمەت دەشێت لە بەرکەوتنی دنیای دەرەوەدا بە ئاسانی لێڵ یان بریندار بکرێت. هەروەها بەردەوام لەبەردەم نەخۆشی و لەرزینداییە. گۆتە زیاد لە جارێک دانی بەوەدا ناوە کە ئەو لە لایەنی دەروونیەوە پێکراوەو مەیلی خۆکوشتنی زۆرە. بەڵام لە رێگای داهێنانەوە چارەسەری کردوەو پاڵەوانـــی رۆمان و شـــانۆگەریەکانی لەباتی ئەم خۆدەکوژن. بروانە رۆمانـــی (ئازارەکانی ڤارتەری گەنج) ئەمە راســـتیی تیورەکەی فرۆید دەسەلمێنێت کە دەڵێت: داهێنانی بلیمەتەکان چارەسەری حاڵەتە ئاڵۆزەکان و کەسایەتیە بەگرێ و گۆڵەکانە. با گوێ لە قسە بەناوبانگەکەی بگرین لەبارەی دۆستویفســـکیەوە: لە کەســـایەتی یان ئینسانی دۆستۆیفســـکیدا دەتوانیت هەموو نەخۆشیەکانی ســـەر زەوی بدۆزیتەوە. بەڵام لەبەردەم دۆستویفسکی داهێنەر و هونەرمەندا دەبێت چەک دابنێیت و بچەمیتەوە.

زانای ســـایکۆلۆژی فەرەنســـی جان دولی Jean Delay کتێبێکی بەناوی نیورۆســـس و داهێنان داناوە کە بە وردی باس لە ســـێ بلیمەت دەکات: نیچە، دۆستۆیفسکی، فلوبیر. دۆلی گەشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە قەیرانە توندەکانی ناوەوەی ئەو سیانە هۆی سەرەکیی داهێنانیانە. بەڵام هەریەکەیان جەختی لەســـەر ئەو پنتە کردوە کە مەبەستیەتی. نیچە لەشی بە بار و نەخۆش و حەساسیەتێکی لەڕادەبەدەری هەبوە، بۆیە جەختی لەسەر ئیرادەی هێز و مەزنی کردوە. واتا ئەو شتانەی بە واقیعی لە خۆیدا نەبوە. دۆستۆیفســـکیش نیوروســـێکی تایبەت یان گرێیەکی سایکۆلۆژیی دیاریکراوی هەبوە کە هەست کردنی زۆریەتی بە گوناهو تاوان. هەموو ئەمەیش لەوەوە سەرچاوەی گرتوە کە لە منداڵیـــدا باوکی زۆر دڵڕەق بوە بەرانبەری. لەبەرئەوەیش کە باوکی ئازاری دایکی داوە ئەو ڕقی لێی بوە. تا ئەو ڕادەیەی لە ناوەوەیدا حەزی کردووە باوکی بمرێت. بۆیە کاتێک بیستی باوکی بە دەستی کۆیلەیەکی کارگوزار کوژراوە هەستی وابوو کە خۆی کوشتوویەتی.

لێرەوەیە هەســـت کردنی زۆر ترســـناکی بە گرێی تاوانباری و هەر لەگەڵیشیدا مایەوە. بۆیە لە ڕۆمانەکانیدا لەســـەر چەند چەمکێک زۆر وەســـتاوە، وەک: ملکەچیی، ڕق، تۆڵە، لێ خۆشـــبوون. تاوان، سزا.. بەڵام فلۆبیر چارەی نەخۆشیە دەروونی و تەریکیەکەی لەو ڕێگایەوە کردوە کە بکەوێتە ئامێـــزی ئەدەب و خەیاڵی داهێنەرانەوە. ئەدەب بوو بە ئاین و نەریتی. لە پەرســـتگاکەیدا ئەدەبی ناوازەی بەرهەم دەهێنا.

شـــپرزەیی دەروونیی کەســـایەتی داهێنەر دەکاتە مرۆڤێکی شکست خواردوی ناو کۆمەڵگا بەڵام ســـەرکەوتوو لە بوارێکی تردا. لە ڕاســـتیدا داهێنەرە گەورەکان زوربەی کات نائاساییین، واتا لە یاسا گشـــتیەکەی کۆمەڵگا بەدەرن و لەو بارە قایل نین کە هەیە. جان جینییە دەیوت: خۆشی لەوەدایە من ناتوانم چاک بنووســـم لە زیندانندا نەبێت. جینیە لە رێســـای گشتی خۆرئاوا دەرچوو کاتێک زۆر هەق بێژانە پشـــتی مەسەلەی فەلەستینی گرت. لێرەدا کەســـێکی گەورە لەو ڕێسایە دەردەکەم کە جەنەڕاڵ دیگۆل بوو.

توانای ڕانەهاتن لەگەڵ کۆمەڵگادا وا لە داهێنەر دەکات لە بوارێکی تردا خۆی بســـەلمێنێت، یان

تیایدا سەربكەوێت. ئەمەیش لەجیاتی ئەو كەمایەتیەوەیە كە هەستی پێ دەكات و كێشەیەكی راستەقینەی ناوەوەی بۆ پێش هێناوە. بۆیە كافكا بوو بە گەورەترین رۆماننووس. بتهۆڤن بە مۆسیقارێكی بێ وێنە و نیچەیش بە فەیلەسووفێكی زۆر قووڵ.

لوردبایرون و مایكل ئەنجیلو لە باری دەروونیەوە دوو كەسی نەخۆش بوون. نەیاندەتوانی لەگەڵ ژیانی كۆمەڵگاكەیاندا رابێن یان بگونجێن. بەڵام ئەمە نەیتوانی رێ لەوە بگرێت كە ببن بە داهێنەری گەورە. بەڵكو هەر ئەوە بوو بە هۆی ئەوەی ببنە داهێنەر. ژیانی سێكسیی بایرون پڕە لە ناوزڕاندن و بێ ئابڕوویی كە لە سەردەمی مەلیكە ڤیكتۆریادا كۆمەڵگای موحافیزكاری ئینگلیزی وروژاند و ڕقی هەستاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بایرۆن پشت و پەنای هەژار و ستەم لێكراوان بوو، یەكێك بوو لەو گەورە كەسانەی گۆرانیی بۆ ئازادی دەوت، هەر ئەمەیش بوو كە هەر لە تافی گەنجیدا و لەسەر داكۆكی كردن لە ئازادی لە وڵاتی یوناندا لەناو بچێت. لە ڕاستیدا كەسی بلیمەت و داهێنەر، پێش هەر شتێك داكۆكیی لە ئازادی تایبەتی خۆی دەكات، ئەو كۆت و بەندانە دەشكێنێت كە ڕێ لە بیری شۆڕشگێڕانەی دەگرێت. بەڵام مایكل ئەنجیلۆ كەسایەتێكی بەهێز و مەیلی ئازادی خوازی هەبوو. لەبەر بلیمەتیەكەی ئەو هەڵسوكەوت و ڕەفتارانەی لێ قبووڵ دەكەین كە لە كەسانی تری قبووڵ ناكەین، ئەو لووت بەرزبوو، خەڵكی خۆش نەدەویست، توند و حەسوود بوو. حەزی لە شەڕ و شۆڕ دەكرد، ناوەوەی لێكترازاو بوو. لەگەڵ ئەمانەیشدا خاكی و بەخشندە بوو، پرسیارەكە لێرەدا ئەمەیە كە چۆن توانیبووی ئەم هەموو ناكۆكیانە لە خۆیدا كۆبكاتەوە. هیچ قوتابیەكی بەهرەمەندی قبووڵ نەدەكرد. كاتێك نیگاری دەكێشا حەزی نەدەكرد هیچ كەسێك لەوێ بێت تەنانەت ئەگەر خودی پاپا بوایە.. تەواوی خۆی تەرخانی داهێنان دەكرد. لە ڕاستیدا دەشێ گرێ سایكۆلۆژیەكان هاندەری داهێنان بن. بەڵام ئەگەر گرێكان زیاد لە ڕادەی خۆیان ڕووخێنەربن لەوانەیە ڕێ لە داهێنانەكە بگرێت. زۆر جار كەسانێكمان دیوە لە سەرەتادا بەهرەمەندبوون، بەڵام گرێ دەروونیەكانی وەك ئەنجام سەركەوتوون و بەخشش و بەهرەكەیان مراندوون. مانای وایە گرێی دەروونی چەكێكی دوودەمە: یان شڕ و پڕت دەكات و دەتكوژێت، یان هەڵدەگەڕێتەوەو دەتكاتە بلیمەت.

## پەراوێزەكان:

*نالی دەڵێ: لە جگەرگۆشەی شیعرم مەدە مانایی خراپ

بێ خەتا كەس نیە رازی كە لە ئەولادی درێ

حاجی قادری كۆییش دەڵێت: مەڵێ حاجی نەما رۆیی جەهەنم

لە سایەی شیعرەوە بابی كوڕانم

## سەرچاوە:

تەنویر. لە بڵاوكراوەكانی بلون: پاریس، چاپی دوەم ٢٠٠٧.

# چەند تێرمێکی گرنگی کارڵ مارکس


کارڵ مارکس

لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

## لەخۆنامۆیی و دابڕاوی (Alienation and Estrangement)

هێگل و نوسەرانی دیکە، وشەی لەخۆنامۆیی بە هاوتای بەرهەستبوونەوە (Objectification) دەزانن. مارکس یەکەم بیرمەند بوو کە ئەم دوو چەمکە تێکئاڵاوەی لێک جیا کردەوە و جێگا و شـــوێنی شـــیاوی هەر کامیانی دیاری کرد. ئەو زیاتر ئلیناســـیۆنی وەک شـــێوازێکی چەواشە و نائاسایی بەرهەستبوونەوە

پێناسە کرد، کە لە خۆیدا نە باشە و نە خراپە، بەڵکوو رۆڵێکی ناکارا inactive دەگێڕێ. بەڕای مارکس، ئلیناسیۆن تەنیا بەهۆی دۆخێکی تایبەتی کۆمەڵایەتی پێکدێت- دۆخێک کە لەودا هێز و توانای سروشتی مرۆڤ لە رێگەی کار و تێکۆشـــانەوە بەرهەســـت دەبنەوە و لە دژی سروشـــت و زاتی ئینســـانی مرۆڤ دەوەستن.

ئلیناسیۆن بەردەوام بەهۆی شتێکەوە پێکدێت (کەوابوو، ئلیناسیۆن لەگەڵ «دۆخێکی مرۆڤی» هاوتا نییە)، بەڵکوو بەهۆی نامۆ بوون و دابڕان لە شـــتێک بەدی دێت. لەخۆنامۆیی لە سیســـتمی سەرمایەداریدا خاوەن ئەم چوار رەهەندەیە:

١. مرۆڤ لە بەرهەمی کاری خۆی، کە دەبێتە موڵکی سەرمایەدار، نامۆ بووە؛

٢. مرۆڤ لە تێکۆشـــانی بەرهەمهێنەری خۆی (یانی لە کار) کە ئێســـتا سروشت و توانای ئەو رەت دەکاتەوە، نامۆ بووە؛

٣. مرۆڤ لە سروشتی سەرەکی خۆی، یانی لە مرۆڤایەتی نامۆ بووە؛

٤. مرۆڤ لە مرۆڤەکانی تر، یانی لە کۆمەڵگە، نامۆ بووە.

## نرخاندن (critic)

بۆئەوەی پێوەندی مارکس لەگەڵ ئەندێشەی بورژوایی بناسین، دەبێ مانای چەمکی هەرە گرنگی نرخانـــدن بزانین. مارکس ئەم چەمکە بۆ پیشـــاندانی گرنگی پراتیکی "راشـــکاوانە" بەکاردێنێ کە پەردەی رەمزاوی ئەو تیوریيانە دەدڕێ کە "ســـاتی هەقیقەت" دادەپۆشن. ئەم "ساتەی هەقیقەت"، بە نۆرەی خۆی [بەهۆی نرخاندن]، بە رەتکردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی تیۆری پێشوو، لە تیوریيەکی راستەقینەتردا جێگیر دەبێ.

## سروشت و گەوهەری مرۆڤ (Essence, nature of man)

مارکس ئەو بیر و باوەڕانە کە بەشـــێوەی ئابســـتراکت گەوهەر و سروشـــتی مرۆڤ بە قەتیس و نەگۆڕ دەزانن، رەت دەکاتەوە. بە رای مارکس، تاک "بوویەکی کۆمەڵایەتی"ـە و "کۆمەڵێک پێوەندی کۆمەڵایەتی"، سروشت و گەوهەری ئەو پێکدێنن. بەمجۆرە، ئەگەر تاک لە تێکڕای پرۆسەی کۆمەڵایەتی، دابېڕێت، یانی لە دژی کۆمەڵگە بوەستێ، یان کۆمەڵگە ئەو پەراوێز بخات، لە سروشتی خۆی نامۆ دەبێت. دیدگای مارکس لەمەڕ سروشـــتی ئینسانی لە سێ رەهەندی ماناییدا، لەگەڵ وشەی ئاڵمانی wesen دا دێتەوە:

١. wesen بە مانای "سروشت" یان "بنەڕەت" بەمجۆرە کە لەم تێرمەدا دەبینرێت Menschliches Wesen بە مانای "سروشتی ئینسانی"؛

٢. Wesen بەمانای "بوون" یان "بوونەوەر" لە تێرمی Menschliches Wesen یانی (بوونەوەری ئینسانی)؛

٣. wesen بەشـێوەی تێکهەڵکێش لەگەڵ هەندێ ناوی دیکە بۆ ئاماژە بە سیسـتمێک، وەک: Schulwesen یانی "سیستمی پەروەردە". مارکس بەردەوام بە مانای جیا جیا ئەم وشەیە بەکار دێنێ کە زۆر جار وەرگێڕ تووشی سەرسام بوون دەکا و بۆ هاوتای دروست دادەمێنێ.

## بوتکراوی، تلیسماوی (fetishism)

پەرستنی شت و کاڵای بێ گیان کە خەسڵەتی جاودوویيان پێدراوە. لە هەندێ برگە لە مێژووی مرۆڤــدا، "بەرهەمەکانی زەینی مرۆڤ بە چەشـنێک ژیانی تایبەت دەگــەن... ' وەکچۆن لە جیهانی کاڵاکانیشدا، بەرهەمەکانی دەسکردی مرۆڤ، گیانیان تێدەکەوێ." پراتیکی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنەر، بەشێوەی شت (کاڵا) دەردەکەوێ کە بەسەر بەرهەمهێنەردا زاڵ دەبێ، لەجیاتی ئەوەی کە لە خزمەتی ئەودا بێ." (مارکس بۆ یەکەم جار، چەمکی فتیشیزمی کاڵای لە بەرگی یەکەمی سەرمایەدا بە وردی شرۆڤە کردووە.)

## بەرهەستبوونەوە (Vergegenstandlichung)

بەرهەســتبوونەوە دەرفەتێکی سروشــتی مرۆڤە تا بەهۆی کار و تێکۆشانی [سروشت و توانای] خۆی دەربخات. بەر لە مارکس، سنووری نێوان دوو وشەی ئلیناسیۆن و بەرهەستبوونەوە، تاریک و تەماوی بوو. بەڵام چەمکی پراکســیس دەرفەتێکی بە مارکس بەخشی تا ئەم دوو چەمکە لێک جیا بکاتەوە. بەرهەســتبوونەوە دەرفەتێک بۆ مرۆڤی ئازاد فەراهەم دەکات تا خۆی لە دنیای دەسکردی خۆیدا بناسێتەوە.

## پراکسیس یان چالاکی بەرهەمهێنەر
(praxis and productive activity)

مارکــس هەردوو چەمکی بکەری ناســیار و هزرڤانی هێــگل و "ماتریالیزم"ی فۆیرباخ، وەک دوو راڤەی ئابســتراکت و تاکرەهەندی لەمەڕ جیهان، رەت دەکاتەوە- بۆیە دیدگای هێگل رەت دەکاتەوە چونکە هێگل مێژوو بە دەرکەوتنی [پەتی] رۆح دەزانێ، بۆیە بۆچوونی فۆیرباخیش رەت دەکاتەوە، چونکە فۆیرباخ توخمی ئەکتیڤ، یانی تێکۆشـــانی پراتیکی کە فۆرمی شت (ئوبژە) دیاری دەکات، لەبەرچاو ناگرێت. مانای پراکسیس لای مارکس بریتییە لە پرۆسەیەک کە لەودا مرۆڤ خۆی دەناسێ و لە رێگەی بەرهەمهێنانی شتەکانەوە، شێوازی ژیانی خۆی و فۆرمی سروشت دیاری دەکات؛ ئەمە پردێکە لەنێوان "ئایدیالیزم" و "ماتریالیزم"دا.

پراکســیس لە هەمان کاتدا بناغەی "زانســتی مرۆڤ" پێکدێنێ کە جێگەی فەلســەفەی هزرڤان

(تیۆریک) و ئابووری سیاسی دەگرێتەوە و ناکۆکی نێوان ئەم دووانە لەنێو دەبات. مارکس بە سوود وەرگرتن لەم چەمکە مێژووی مرۆڤ راڤە دەکات، مێژوویەک کە بەرهەمی کار و تێکۆشانی ئابووری کۆمەڵایەتی مرۆڤە.

## بوونی تیپیک (Gattungswesen) Species being

چەمکی "بوونی تیپیک" کە یەکەم جار لودویگ فۆیرباخ بەکاری هێنا، لە ئەندێشـــەی مارکســـدا وەک چەمکێکی گرنگ رۆڵ دەگێڕێ. فویرباخ "جیاوازی سەرەکی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ" لەم راستییەدا دەبینێ کە مرۆڤ نە هەر "لە بوونی خۆی وەک تاک وشـــیارە"، بەڵکوو لە هەمان کاتدا، خۆی وەک ئەندامێـــک لە تیپی مـــرۆڤ، یانی بوونی تیپیک، دەبینێ. [کەوابوو] "مرۆڤ لە راســـتیدا، لە یەک کاتـــدا، هـــەم منە و هەم تۆ؛ یانی دەتوانێ خۆی لە جێگەی "ئەویـــدی" دابنێ، بەم هۆیە، نە تەنیا تاکێتی مرۆڤ، بەڵکو تیپی مرۆڤ، سروشتی سەرەکی و بنەڕەتی مرۆڤ، بابەت و ئامانجی ئەندێشە پێکدێنێ." (فویرباخ: گەوهەری مەســـیحیەت). کەوابوو، جڤاتێکی دابەشکراو و پڕ لە رکەبەرایەتی کە لەودا تاک و گشـــت (universal) لەگەڵ یەکتر لە ناکۆکیدان، لەگەڵ ئەو شتەی مرۆڤێتی مرۆڤ پێکدێنێ جیاوازی هەیە.

## ئاوف هێبن (Aufhebung)

لە زمانی ئینگلیزی و فارسی و کوردیدا هیچ وشەیەک نییە کە بتوانێ بە وردی و بەتەواوی مانای وشـــەی Aufhebung بەوجۆرە کە هێگل و مارکـــس بەکاریان هێناوە، بگەیەنێ. Aufhebung زیاتر دوو مانای سەرەکی دەگەیەنێ، یەکەم بە مانای مەنفی (رەتکردنەوە و هەڵوەشاندنەوە)؛ دووهەم بە مانای موســـبەت (وەرگرتن و واوەترچوون). هێگل کاتێ وشـــەی Aufhebung بەکار دێنێ، هەر دوو لایەنی موسبەت و مەنفی پرسێک/ کردارێک راڤە دەکات کە لەودا فۆرمێک لە ئەندێشە یان سروشتی بانتر جێگەی فۆرمی نزمتر دەگرێتەوە و لە هەمان کاتدا چەند بەشـــێکی فۆرمی پێشوو دەپارێزێ. بەمپێیە، چەمکی "نرخاندن" لای مارکس بریتییە لە وەرگرتن و رەتکردنەوە و واوەترچوون.

## سەرچاوە:

ارغنون شماره ۳، ص ص ٢٤-٢٧.

Early Writings, trans. R. Livingstone and G. Benton, Penguin, 1977.

# دڵی من هی باوکمە

## MY HEART BELONGS TO DADDY

## بەشی سێیەم لە کتێبی گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا


نینار ئەسبەر

نینار ئەسبەر
لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار:** ئایا تۆ چۆن پێناسـەی باوکایەتی ئەکەیت؟ ڕاستییەکەشی ئەوەیە من بۆخۆم نازانم چۆن باوکێک ئەبێت ڕەفتار لەگەڵ کچەکەی، یان بەشـێوەیەکی گشـتی لە گەڵ منداڵەکانیدا بکات. لە کۆمەڵگەی عەرەبی خۆرهەڵاتیدا باوک بەڕۆڵی پەیداکردنی پارە هەڵئەسـتێت بۆ ماڵ، هەر ئەویشـە کە بڕیاری ئا و نەئی لەدەسـتدایە. دیارە من وێنەی باوک ئەکاریکاتێرێنم، وەک گشـتێک ئەیبینم و زیادەڕۆیی تیائەکەم! بەڵام باوک بۆخۆی سـیمایەکی گرنگە، بەتایبەتی لە دەرەوەی ماڵ. ئایە تۆ چ جۆرێک لەو باوکانەبوویت بۆ من؟ ئایا گەر تۆ لە تەمەنی بیسـت سـاڵیدا باوکت لەدەستنەدایە، ئەبوویتە باوکێکی جیاوازتر لەوەی کە ئێستا هەیت؟

**ئەدۆنیـــس**: لە هەموو کۆمەڵگایەکدا، بەتایبەتیش لە کۆمەڵگای عەرەبیدا، باوکان بۆخۆیان ڕۆڵی کەسێکی دەسەڵاتدار ئەبینن، ئەوانن کە فەرمان ئەدەن یان داوا لەوانی تر ئەکەن گوێڕایەڵیانبن. باوک ئەیەوێـــت منداڵەکانی وەک خۆی بن، هەموو بەهـــا و ئاکارەکانی خۆی بۆ منداڵەکانی بگوێزێتەوە. بەهـــۆی ئەمەوەیە کە تۆ ئەتوانیت تێبگەیـــت، کۆمەڵگەی عەرەبی کۆمەڵگەیەکی باوکســـالارە. لە ڕابـــردوودا کۆمەڵگەی عەرەبی کۆمەڵگەیەکی ماتریاڵـــی بووە، بەڵام بەداخەوە ئەو جۆرە کۆمەڵگەیە لەناوچووە.

لە کلتوری عەرەبیدا باوک وێنەیەکی بچووککراوەی دەســـەڵاتی خودای هەیە، دەسەڵاتدارێکی وەها کە تۆ نەتوانیت بەهیچ شـــێوەیەک بەرپەرچی بدەیتەوە. بۆیە باوکی عەرەبی بە شـــێوەیەکی گشتی وەک شـــمەکێک سەیری منداڵەکانی ئەکات، «شمەکێکی دانســـقە»، کە ئەو چۆنی بوێت وایان لێ ئـــەکات. ئەم جـــۆرە کۆمەڵگایە لە زۆرینەی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەکانـــدا ڕەخنەی لێگیراوە. لەو ڕووەوەی کە باوکان منداڵەکانی خۆیان شـــێواندووە و نەیانهێشـــتووە ژیانی خۆیان بژین. هەروەها منداڵەکانیـــش لەلای خۆیانەوە هەمان پەیوەندیان لەگـــەڵ منداڵەکانیاندا دووبارەکردۆتەوە. تۆ برۆ «هیشام شەرابی» بخوێنەرەوە تا بزانیت کە ئەو چۆن ئەم دیاردەیە ئەخوێنێتەوە.

من خۆم وەک باوک هەرگیز نەمویســـتووە ئەم جۆرە ڕۆڵە ببینم. هەروەها دیارە منداڵەکانیشـــم ئـــەم جۆرە پەروەردەکردنەیان قبوڵنەکردووە و نەیانتوانیوە تێیبگەن. من ویســـتوومە ئێوە بێ هیچ دەســـتێوەردانێک لەلایەن منەوە گەورەبن، پێشـــمواپە ئێوە خۆشتان هەســـتان بەمە کردووە. بەڵام


ئەدۆنیس

هەندێــک جاریش ڕوویداوە کە ئێوە ئەمەتان وەک کارێکی نەگەتیڤ ســەیرکردووە. ئەمەش مانەی ئەوەیە کە هەندێک نەریت و جۆری پەیوەندی ئینســانی لە ئێوەشدا گیرساوەتەوە. سەرباری ئەوەی کە ئێوە دژ بە نەریتی باوی باوکسالاریشــن، بەڵام ڕەنگە ئێوە هەندێک جار پێویســتان بەم جۆری هەیبەتی باوکایەتییە هەبووبێت تا لە نزیکتانەوەبێت.

ئێوە لە ژینگەیەکی وادا گەورەبوون کە هەندێک شــتی تیادانەبووە، ئەمەش کاریگەری لەســەر کەسایەتی و ڕەفتاری ئێوە داناوە.

من پێموابوو دایکتان ئەتوانێت ئەو بۆشــاییەی منتان بۆ پڕبکاتەوە، ئەمەش لە ڕاســتیدا منی دەســتخەڕۆکرد. بەڵام لە کۆتایشــدا زۆر شــادمانم پێتان، چونکە توانیوتانە لــەم حاڵەتە بگەن. ئەگــەر من خۆم بەراوردبکەم بە هەندێک باوکی تر ئــەوا ئەبوو ئێوە زۆر خراپتر بوونایە، کە دیارە وانەبوون.

بەڵام سەرباری ئەوەش من پێموایە هەڵەبووم: چونکە وامئەزانی کە ئێوە پێویستان بە هەیبەتی باوکایەتــی من نییە. مــن پێموابوو دایکتان جێگای مــن ئەگرێتەوە. بەڵام دواتر تێگەیشــتم کە هەڵەبــووم. مــن تەمەنا ئەکەم بمتوانیبایە بگەڕێمــەوە بۆ ئەو کاتانە و ئەو شــتانەم بکردایە کە نەمکردوون، بەڵام تازە ئەمە ناکرێت...

**نینا:** من ئەو بیرۆکەیەم پێباشــە کە ڕێبدەیت منداڵ خــۆی دوور لە هەیبەتی باوی باوکایەتی گەورەببێــت. دیارە هەموو شــتێکیش پەیوەندی بــەو کۆمەڵگەیەوە هەیە کە تێیــدا گەورەئەبیت. منداڵ کــە لە ئەوروپا گەورەئەبێت، لەناو کۆمەڵێک خێزانــی لەیەکنەچوودا گەورەئەبێت، ئەمەش کارئاســانییەکە بۆ ئەوان. چونکە تەنها یەک جۆر خێزان نییە، بەڵکە چەندان جۆر خێزان ئەبینن: لــەو جۆرە خێزانانە هــەن کە منداڵیان گرتۆتەخــۆ «ئەدۆپتێرە»یان کردووە، بــاوک و دایکەکان هۆمۆسێکســوێلن، منداڵەکــە هی یەکێکیان یــان هەردووکیانە. بەڵام لە لوبنــان کاتێک کە ئێمە منداڵبوویــن زۆر هۆکاری دژوار هەبــوون: لە هەموویان گەورەتریــن و نائارامتریانیان جەنگ بوو. بەڵام ڕەنگە هەر ئەوەش بووبێتە هۆی ئەوەی کە ئێمە توانیبێتمان ڕزگارمان ببێت. جەنگ بێ حەد دژواریی خولقاند، ســەرباری خولقاندنی چەندان تــرس و دڵەڕوکێی تر. ترس لە مردن وای لێکردین بەســەر هەموو ترســەکانی تردا زاڵبین. هەڕەشەی کوشــتن لە هەموولایەکەوە لەسەرمان بوو. وەک ئەڵێــن هاتنە کایەی ئەو تەق و تۆقەش پێویســت بوو! بۆ ئەوەی بەجۆرێــک لە جۆرەکان خۆمان بگونجێنین و لەســەر دروستکردنی دژەبەرگرییەک ڕابێیت، تا هەوڵی ئەوەبدەین بمێنینەوە. ئەمەش تەنها هۆکارێک بوو بتوانیت بەشێوەیەکی باش دژەبەرگرییەک لە خۆماندا دروستبکەین و بمێنینەوە. بەڵام کاتێک ئینسان دوای ئەو جۆرە ژیانە، دەستبکات بەژیانێکی «ئاسایی»، بۆ نموونە لە وڵاتێکی وەک فەرەنســادا، ئەوا ئەو دژەبەرگرییەی کە هەیەتی هەمیشــە توشی نارەحەتی ئەکات. ئەمە وەک ئەو ئازارە وایە پێڵاوێکی بچوکت لە پێدابێت، یان کەمەری پانتۆڵەکەت تەنگبێت. بۆیە پێویستە لە دەستیان ڕزگارت بێت، پێش هەرشت ئینسان ئەبێت لەدەست ئەو ترسە ڕزگاری بێت، بۆئەوەی چیتر

پێویستت بە بەکارهێنانی ئەو جۆرە دژە بەرگرییە نەکات کە وەک خۆپاراستن بەکاریئەهێنیت.

**ئەدۆنیس**: من پێموایە ئەوەی کە ئەم شـتەی هێندەی تر ئاڵۆزتر کرد ئەوەبوو کە دایکتان هیچ کاتێک لەگەڵ مندا لەسـەر ئێوە قسـەی نەکردووە. ئەو بە هەموو کیشە و هەڵە و لەڕێ لادانەکانی ئێوەی زانیوە، بەڵام ئەو سەبارەت بەو شتانە هەرگیز هیچی لای من نەوتووە، وەک ئەوەی من کەسێک بم لە دەرەوەی ئێوە. بەهەرحاڵ هەرچۆنێک بێت من بە ئاگاییەوە نەمویسـتووە ڕۆڵی باوکایەتی لە ناو ژیانی ئێوەدا ببینم.

**نینار**: تۆ پێویستە شتێک بزانیت: ئەوەی وایکردووە ئەو هیچ شتێک لەلای تۆ نەدرکێنێت، هۆی ئەوەبوو کە ئێمە خۆمان پێمان وتبوو هیچ شتێک لای تۆ باس نەکات. هەمیشە لەو کاتانەدا من بە دایکم ئەوت هیچ شتێک بە تۆ نەڵێت.

**ئەدۆنیس**: من بەمەم نەزانیوە ـ من تەنها باسی ئەوە ئەکەم کە چۆن بووە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هەرگیز دایکتان بۆی باسـنەکردووم کە ئەروەد یان نینار ئەم کێشـەیەی هەیە یان نییە. ڕاستە من هەڵەم کرد ـ هەڵەیەکی زۆر کوشـندە ـ ش، ئەمـەش بەهۆی ئەو کەمی پەیوەندییەوە بوو، ئەو بارە خراپەی خولقاند.

**نینـار**: ئاهـ، من دواتر تێگەیشـتم ئەم هەڵەیە هۆی ئەو جـۆری پەیوەندی تۆ و دایکم بوو. ئەو زۆرجار پێی ئەووتم کە من خۆم بێم بۆ لات، ئەیووت: «بڕۆ و قسە لەگەڵ بکە» یان ئەیووت «ئەمڕۆ سـڵاوت لە باوکت کرد؟» «باوکت ماچ کرد؟» «ئەو وێنەی کە کێشـاوتە پیشانی باوکت دا؟» ئەم جۆرە داوایانەی ئەو کە لە منی ئەکرد شـێتیان کردبووم، بێ حەد دەهری ئەبووم. نەمئەویست ئەو شتانە بکەم کە ئەو ئەیویست، بۆیە منیش پێچەوانەی ئەو شتانەم ئەکرد کە ئەو ئەیووت. من بەوم ئەووت: «ئەم هەمو شتە چییە تۆ ئەیڵێیت! تۆ هەر باسی ئەو ئەکەیت!» (پێئەکەنێت).

**ئەدۆنیس**: زۆر سەیرە ئەو هیچ کام لەم شتانەی لای من باس نەکردووە! (پێئەکەنێت)

**نینار**: بەهەرحاڵێک ئەو دەهریی ئەکردم. چەندان جار لەسـەر ئەوە شەڕم لەگەڵ کردووە! ئا بیرم کەوتەوە، من ئەوم ناو نابوو پارێزە بەرگریکەرەکەی تۆ!

دوای چەند دەقەیەکی تر...

**نینار**: پێتوایە ئەبێت جۆرێک لە باوکایەتی بدۆزیتەوە تا لەگەڵ منداڵەکانت بگونجێت؟

**ئەدۆنیس**: باوکایەتی شتێک نییە بدۆزرێتەوە، بەڵکە جۆرێک لە شێواز ئەدۆزیتەوە. مەبەستم لە وێنەی باوکایەتییە ـ واتا ئەو جۆری تێگەیشـتنەی کە ئەبێت باوکێک چۆن بێت ـ ئەبوو ئەمەش لە ناو کۆمەڵگەی عەرەبیدا بخرایەتە ژێر پرسیارەوە.

**نینـــار:** تەنها ئەمەوێت ئەوە بزانم کە تۆ جیاوازبوویت لەگەڵ من و ئەرواددا. ئایە هیچ شـــتێکت لەسەر من یان لەسەر ئەو هەیە؟

**ئەدۆنیس:** ئەوەی هەموو ئەم حاڵەتانەی ئاڵۆزکردبوو ئەوەبوو کە من کەمجار ئەکەوتمە ماڵەوە، لەبەرئەوەی من کارم زۆر ئەکرد بۆ ئەوەی پارە پەیدابکەم. نائامادەیی من و سەفەرەکانم بووە هۆی تێکدانی پەروەردەکردنی ئێوە، من ئێجگار کەم ئێوەم بینیوە.

**نینار:** وایە، بەڵام هەمیشـــە ئامادەبوونی جەســـتەیی زۆر شت ناکات. بۆیە منیش ئەو پرسیارەم لێکردیت کە ئایا چەند جۆری جیاوازی باوکایەتی هەیە.

**ئەدۆنیس:** مەبەستت لە «جۆرە جیاوازەکانی باوکایەتی» چییە؟

**نینار:** مەبەستم لەو جۆرانەیە کە هەن.

**ئەدۆنیس:** جۆرە جیاوازەکانی باوکایەتی؟ وایە.

**نینار:** وەک ئەو شێوەیەی کە باوک تێیئەگات و وەک ئەوەش کە منداڵ تێیئەگات؟

**ئەدۆنیس:** بێگومان ئەمە پەیوەندی بە هەڵسوکەوتی باوکەکانەوە هەیە، بەو جێگایەی کە هەیانە. هەموو باوکەکان جیاوازن.

**نینار:** زوو مردنی باوکت چ کاریگەرییەکی لەسەر تۆ دانا؟ دوای مەرگی باوکت تۆ چیت لێهات؟

**ئەدۆنیس:** من ئەو کاتە شانســـێکی گەورەم هەبوو. پێویستی بارودۆخەکان لەسەر من بەجۆرێک بـــوون کـــە ئەبوو زۆر کاربکەم بۆ ئەوەی هـــەم ناوێک بۆ خۆم پەیدابکەم و هەم خۆشـــم بژییەنم. لەبەرئەمە تێپەڕاندنی مەرگی باوکم هێندە قورس نەبوو بۆ من.

**نینـــار:** ڕەنگە ئەو بارودۆخانەی تۆ باســـیان ئەکەیت یارمەتیدەرێک بووبن بۆ لەبیرکردنی مەرگی باوکت. چونکە ئەوان پڕکەرەوەی ئەو بۆشاییە بوون.

**ئەدۆنیـــس:** نەخێر، ئـــەوکات من مەجبوربووم. ئەبـــوو کارم بکردایە بۆ ئەوەی حوســـەینی برام بەردەوام بێت لە قوتابخانە، بۆ ئەوەی بژێوی فاتیمەی خوشـــکم دابینبکەم. مەرگی باوکم مۆرکێکی وای لەســـەردانام کە بەچەشـــنێک لە چەشـــنەکان مەجبوریکردم تێبگەم و دەستبکەم بە کارکردن و پراکتیکردنـــی ئـــەو دیوەی تری ژیان. من پێموایـــە لایەنی ئابووریت ســـەربەخۆنەبێت ناتوانیت بژیت. فێربووم کە خۆم ژیانی خۆم ببەم بەڕێوە و لایەنی ئابووری خۆم دابینبکەم. دەســـتمکرد بە کارکردنێکی قورس تەنها بۆئەوەی منیش دەستێکم هەبێت لە بەڕێوبردنی بژێوی خێزانەکەمدا.

**نینار:** پێتوایە تۆش هەمان حاڵەتی باوکایەتیت لە ژیانی تایبەتی خۆتدا دووبارەکردبێتەوە؟

**ئەدۆنیس:** ئـا، ڕەنگە وابێت. بەتایبەتی بە بیرکردنەوە لەوەی کـە ئەو منی بەخێونەکرد بەڵکە وازی لێهێنام ئازادبم.
کەمێک دواتر...

**نینار:** پێت سەیر نییە یان پێتناخۆش نییە کە من تۆ ناخوێنمەوە؟
**ئەدۆنیس:** بەهیچ شێوەیەک.

**نینار:** تۆ ئەزانیت کە من بۆچی تۆ ناخوێنمەوە؟
**ئەدۆنیس:** لەڕاسـتیدا ئەمە من بێتاقەت نـاکات. بەپێچەوانەوە جاری واهەبـووە بەخۆم وتووە باشـتر کە تۆ من ناخوێنیتـەوە، چونکە ئەوە ئازادییەکی گەورەترت ئەداتێ کە کەسـایەتی خۆت دروستبکەیت.چونکە ئەوە زۆر باشترە لەوەی کە من کاریگەریم لەسەر تۆ هەبێت.
لە ڕاسـتیدا هەندێک جار من دڵخۆشـترم بەوەی کە تۆ من ناخوێنیتەوە، بەتایبەتی کە ئەتبینم تۆ خەریکی شتێکی تریت، شتێکی جیاوازتر لەوەی من. ڕەنگە من ئەو کاتە خەمم بخواردایە کە تۆ خەریکی هیچ نەبوویتایە.

**نینـار:** زۆر جار خەڵکی پرسـیاری ئەوەم لێئەکەن: «تۆ چی لـە باوکتەوە فێربوویت؟» «لە چ ڕوویەکەوە ئەو کاریگەری لەسـەر تۆ هەیە؟» هەروەها «تۆ چ شـتێکی ئەوت تیایە؟» من ڕقم لەم جۆرە پرسیارانەیە، ئەگەر بێتوو وەڵامیشیان بدەمەوە نازانم چیان پێ بڵێم. بەدوای وەڵامێکدا ئەگەڕێم و میکانیکیانە ئەڵێم: «ڕێزگرتنی ئەوەی بەرامبەر، پرسـیارکردن لە خودی خۆم، نەرمونیانی». ئەی باشە تۆ خۆت پێتوایە چیت بە من بەخشیوە؟
**ئەدۆنیس:** لێبووردەیی.. ڕەنگە. نازانم، ڕەنگە سەرسـەختی، خۆڕاگریی. ئەگەرچی تا ئێستا هیچ کام لەو شتانە لە تۆدا دەرنەکەوتوون! (پێئەکەنێت)

**نینار:** (پێئەکەنێت)
**ئەدۆنیس:** ڕەنگە، خۆشەویسـتی بۆ کەسی بەرامبەر، پەنا نەبردن بۆ توندوتیژی. حورمەتگرتنی ئینسان وەک بوونەوەرێک. ڕازینەبوون بەوەی فەرامۆش بکرێیت، هەروەها باوەڕکردن بە خۆت.

**نینار:** ئەبێت خۆشـنەبێت کە لێکچونێکی ڕوخسـاری خۆت لە سـیمای کچەکانتا ببینیتەوە، بەقـەدەر ئەوەی ئەو لێکچوونە لـە کوڕێکتا ببینیت، ئایە ئەمە وایە؟ چونکە ئەم لێکچوونە دیاری نادات کە من وەک کچ خۆم بگۆڕم؟ من بۆخۆم هیچ شـتێک لەم بارەیەوە نازانم، چونکە تائێسـتا منداڵم نییە ـ تەنها دوو پشیلەم هەیە! بەڵام پێشموایە ئەمە بۆ خۆی زۆر زەحمەتە.
**ئەدۆنیس:** ئەو لێکچوونە دڵخۆشم ئەکات.

**نینار:** بەڵام ئەی جیاواز نییە وەک کچ خۆت بگۆڕیت؟

**ئەدۆنیس:** پێموایە ئەو شتەی کە لە پیاودا نوقسانە ئەوەیە کە ناتوانن خەسڵەتی ژنانەیان هەبێت. وەک ئەوەی کە ژنانیش خەسڵەتی نێرانەیان نییە. کاتێکیش خەسڵەتی نێرانە لەلای کچەکانم ئەبینمەوە دڵخۆشئەبم پێی.

**نینار:** من مەبەستم خەسڵەتەکانی تۆیە.

**ئەدۆنیس:** ئا. خەسڵەتی کەسایەتی من.

**نینار:** نەخێر، خەسڵەتی کەسایەتی تۆ نا؛ خەسڵەتی جەستەیت.

**ئەدۆنیس:** کاتێ ئەبینم چاوەکانت لە چاوی من ئەچن دڵخۆش ئەبم.

**نینار:** هەر ئەوەندە؟ ئایا هیچ نارەحەتنابیت کە ڕوخساری خۆت لە ئافرەتێکدا ببینیتەوە؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، ئەو لێکچوونە وام لێئەکات ڕووی ئافرەتانەی خۆم ببینم.

**نینار:** ئەی ئەمە بۆ خۆی بێزارکەر نییە؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، بۆ من وانییە.

**نینار:** کۆپییەکی بچکۆلانەی خۆت ببینیت؟

**ئەدۆنیس:** من هیچ کۆپییەکم لەو ڕووەوە نییە.

**نینار:** بێگومان وایە. لە ڕاستیدا من بۆیە ئەم پرسیارە لە تۆ ئەکەم چونکە من سی و سێ ساڵم و منداڵیشم نییە. من خۆم منداڵم ناوێت. من نامەویت ژیان ببەخشم بە بوونەوەرێک کە ئەبێت دواتر بمرێت!

من دوو پشیلەم هەیە و زۆریشم خۆشئەوێن، بەڵام من ڕوخساری خۆم لای ئەوان نابینمەوە کە هەندێک جار هەستبکەم لەوان ئەچم!

من زۆر کونجکوڵم بۆ تێگەیشتن لەسەر ئەو پەیوەندییەی نێوان ئینسان و منداڵەکانی. ئەگەر ڕۆژێک بهێڵم کوڕێکی بچووکم ببێت، ڕەنگە ئەو هەستە بژیم کە ڕوخساری خۆم لەودا ببینمەوە. دواتر...

**نینار:** پێتوایە کە گرنگە ئینسان شتێکی خۆی ببەخشێت بە منداڵەکانی؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر.

**نینار:** گرنگ نییە؟!

**ئەدۆنیـــس**: بێگومان نا! من ئەمەوێـــت منداڵەکانم پێچەوانەی من بن، زیرەکبن لەو شـــتەدا کە ئەیکەن. دیارە دڵخۆشیش ئەبم گەر هات و لە منیش چوون.

**نینار:** ئایە هیچ شتێکی بەهادارت بۆ منداڵەکانت نەگواستۆتەوە؟

**ئەدۆنیس**: نەخێر، بەهەرحاڵ من هەوڵمداوە هیچ شـــتێک لەناو ئێوەدا بەجێنەهێڵم. تەنها شتێک کە جێی سەرنجی منە ئەوەیە کە ئێوە لەو بوارەی کە کاری تیائەکەن زۆر باشبن، گرنگ نییە ئیتر هەرچ کارێک بێت کە ئێوە خۆتان هەڵتانبژاردووە.

**نینار:** گواســـتنەوەی شتێک بۆ منداڵەکانت، شتێکە تا ئەبەد ئەمێنێتەوە؟ ئەگەر تۆ بە جۆرێک لـــە جۆرەکان لە مندا بژیت، ئەگەر منیش هەوڵبدەم ئـــەوە وەربگرم کە فێرت کردووم، دواتریش تۆ بمریت و نەتوانیت ئەوە ببینیت. من پێم وانییە ئەمە هێندە گرنگبێت منداڵەکانی خۆت والێبکەیت کـــە بەشـــێکی تۆ لەواندا بژی. من بۆ خۆم ئەمەم بەهیچ شـــێوەیەک لەلاگرنـــگ نییە. منداڵ لەلای خۆیەوە شتی تری هەیە خۆی پێوە سەرقال بکات، بەقەدەر ئەوەی ببێت بە نەوەیەکی ناو ئەو بازنە خێزانداریيە. من پێموایە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە خەیاڵخاویی و نائومێدانەیە. زۆرینەی ئینسانەکان منداڵیـــان ئەبێـــت، هەندیک جاریش بێ ئەوەی خۆیان ویســـتبێتیان یان بیریـــان لێکردبێتەوە کە منداڵیان ببێت ـ وەک بەوەی ئەمە نەریتێک بێت و هەمووان ئەبێت منداڵیان ببێت.

**ئەدۆنیـــس**: گواســـتنەوەی بیرۆکەیەک بـــۆ منداڵەکانت گرنگترە لە گواســـتنەوەی لێکچوونێکی جەستەیی.

**نینار:** من لەمەدا تەواو لەگەڵتام، بەڵام زۆر خەڵک هەن کە منداڵ دروست ئەکەن تەنها بۆ ئەوەی منداڵیان هەبێت.

**ئەدۆنیس**: وایە، لەبەرئەوەی ئەوان شتێکی تریان نییە بیکەن جگە لەمە، هەروەها لەبەر ئەوەشی کە هیچ بیانوویەکی تریان نییە کە ئەمە نەکەن. ئەوان پێیانوایە دوای خۆشیان لەناو منداڵەکانیاندا ئەژین. لە دێکەی ئێمەدا ئەگەر منداڵێک زۆر لە باوکی بچوایە ئەیانووت: «ئەڵێی باوکی تفی کردۆتە دەمی».

**نینار:** وایە، پێیان وابووە کە ئەوان دوای خۆیان لە ناو منداڵەکانیاندا ئەژین.

**ئەدۆنیس**: خەڵکی لاوازی خۆیی هەیە.

**نینار:** بەڵام چ سودێک لە دروستکردنی منداڵ ئەبینن؟

**ئەدۆنیس**:لە هەموو شـــتێک گرنگتر ئەوەیە کە ئەوان ئینســـان ئەخەنەوە. ئەگەر ئەوان وەکو تۆ بیریان بکردایەتەوە، ئەوا دوارۆژ هیچ وەچەیەکی تری بە خۆیەوە نەئەبینی.

**نینار:** ئێمە شەش ملیارد و نیو ئینسانین لەسەر ئەم زەوییە!
**ئەدۆنیس**: ئەگەر شەش ملیاردیان وەکو تۆ بیری بکردایەتەوە ئەوا ساڵانێکی زۆری نەئەبرد منداڵێک چییە لەسەر زەوی نەئەما.

**نینار:** ئەمە مانای ئەوەنییە کە ئینسانەکان بە هۆی لایەنی ئابوورییەوە منداڵیان خستۆتەوە؟
**ئەدۆنیس**: بۆ ئەوەی بژین، بۆ ئەوەی بەردەوامبن.

**نینار:** بەردەوامبوون! چ پێویستییەکیان بە بەردەوامی هەبووە؟ ڕۆژێک دێت زەوی بۆ خۆی ئەمرێت و خۆریش ئەکوژێتەوە.
**ئەدۆنیس**: وایە، بەڵام ئەمە شتێکی ترە و هیچ پەیوەندی بە پاراستنی ڕەگەزەکانەوە نییە.

**نینار:** بێگومان، بەڵام بۆچی ئەمە هێندە بۆ مانەوەی ڕەگەزەکان گرنگە؟
**ئەدۆنیس**: بۆ تۆ ئەتەوێت، ڕەگەزەکانی ئینسان نەمێنن؟
**نینار:** ئا!!! (پێئەکەنێت)

**ئەدۆنیس**: گەر ئەمە باوەڕی تۆیە، ئەبوو تۆ هەر زوو قسەت بکردایە! (پێئەکەنێت)
**نینار:** نەخێر، بەڵام من زۆر بە جدیمە و ئەمەوێت بزانم بۆچی؟
**ئەدۆنیس**: لەبەرئەوەی ئینسان جوانترین ڕەگەزە لەناو هەموو بوونەوەرەکانی تردا.
**نینار:** ئاوها.
**ئەدۆنیس**: هیچ ڕەگەزیکی جوانتر لە ئینسان نییە. بۆیە ئەبێت بپارێزرێت.

**نینار:** بەڵام ئینسان بۆچی ئەوانە ناپارێزێت کە ئێستا هەن و لەسەر زەوین؟ ئەوانەی بەهۆی نەخۆشی و جەنگەکانەوە لە برساندا ئەمرن؟ دیارە ئەوە ڕوونە کە ئەبێت ئینسانەکان بپارێزرێن، ئەوەی پەیوەندی بەم پاراستنەشەوە هەیە شتی زۆرن کە ئەبێت ئینسان بیانکات.
**ئەدۆنیس**: ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر منداڵ، ئەبێت تۆ ئەوە بزانیت کە من بۆ خۆم منداڵم نەویستووە و ئێوەش لە ڕێی لەدەستدەرچوونەوە دروستبوون.

**نینار:** وایە، ئەوەیان ئەزانم.
**ئەدۆنیس**: ئەمەت پێشتر ئەزانی؟ ئەروادیش ئەمە ئەزانێت؟ ئەوکاتانە من و دایکت بە زەحمەت خواردنی ڕۆژانەمان هەبوو، هیچ شتێکمان نەبوو لەسەری بژین. ئێمە نەمانئەویست منداڵێک بخەینەوە کە وەکو خۆمان بەدبەختبێت. بەڵام کاتێکیش کە ئێوە هاتنە ژیانەوە هەر زۆر نازداربوون! (پێئەکەنێت)

**نینار:** وایە، من خۆم وام لە خۆم کرد تا نازداربم.

**ئەدۆنیس:** ئێوە زۆر نازداربوون. بەهیچ شـێوەیەک ئێـوە نەتان ئەتوانی بێنە ژیانەوە گەر من و دایکت ئەو هەڵەیەمان نەکردایە؟ (پێئەکەنێت)

**نینار:** بەڵام ئێستا تازە هیچ ناکرێت!

**ئەدۆنیس:** نەخێر، بەڵام تۆ بەجدیتە کە ئەڵێیت پێت باشتربووە نەهاتیتایەتە ژیانەوە؟

**نینار:** ئا، هەندێک جار وا بیرئەکەمەوە.

**ئەدۆنیس:** ئۆکەی، هەندێک جار، بەڵام من مەبەستم شێوەیەکی مەبدەئییە.

**نینـار:** من زۆر گوێ نادەمـە ئەمە. لەڕاستیشـدا لەبەرئەوەیە کە بەتەواوەتـی نازانم. چونکە هیـچ بڕیارێک لە دەسـتی خۆمدا نەبووە لە هاتنم بۆ ناو ژیان، بۆیە ناتوانم وەڵامی پرسـیارەکەت بدەمەوە.

**ئەدۆنیس:** ئەمە بۆ هەموو ئینسانێک وایە.

**نینار:** هەندێک جار پێموایە کە ژیان هێندە خۆش نییە.

**ئەدۆنیس:** بەڕاستیتە؟ تۆ لە مەرگ ئەترسیت؟

**نینار:** هەڵبەت ئەترسم. من زۆر لە مەرگ ئەترسم.

**ئەدۆنیس:** بەڵام ئەی بۆچی لەبری ئەوە ناڵێیت کە ژیانت خۆشئەوێت؟

**نینار:** من ئەژیم لەبەرئەوەی ڕاهاتووم بژیم، نەک لەبەرئەوەی کە حەزئەکەم بژیم.

**ئەدۆنیس:** تۆ چۆن ئەتوانیت وابیربکەیتەوە؟

**نینار:** ئەو شتە چییە وا لە ژیان ئەکات خۆشتبوێت؟

**ئەدۆنیس:** بەڵام ئەگەر واناکەیت، ئەی کەوایە بۆچی ئەژیت؟

**نینار:** نازانم. من هێنراومەتە ناو دنیاوە، لەبەرئەوەش ئەبێت شـتێک بدۆزمەوە تا شـەقنەبەم و بمرم. لەم هۆکارەش زیاتر شکنابەم.

**ئەدۆنیـس:** ڕەنگـە ئەمەش بۆخۆی هۆیەکی باشـبێت. بەڵام تۆ ئەبێت شـتێک بۆ ژیانی خۆت بکەیت.

**نینـــار:** من لە ئەمڕۆدا ئەتوانم بڵێم کە من بۆ ژیانـــی هونەری خۆم ئەژیم، هەروەها لەبەرخاتری هاوڕێکانم تاکو شتێکیان لەگەڵدا بەش بکەم. لەوکاتەوەی تێگەیشتووم جگە لە ژیان هیچ دەرفەتێکی ترم لەبەردەستا نییە، قبوڵی ئەوەم کردووە کونە خۆڵەکانی خۆم بکەمەوە تا چی لە قوڵایمدا هەیە بێتەدەرەوە. من ســـەری خۆم خســـتۆتە ئاوەوە بێ ئەوەی بزانم ئەم زریانەی لە ناو خۆمدایە بەرەو کوێم ئەبات. من تورەبوونی خۆمم دۆزیوەتەوە. من لە پێناوی کارە هونەرییەکانمدا ئەژیم، لە پێناوی ئەو گەردوونەی کە خەڵقم کردووە. من هەموو ئەو بەربەستانەی بەردەمم ئەبڕم کە ڕێگام پێئەگرن، هونەرەکەم تەنها شتێکە منی لە ژیاندا هێشتۆتەوە. خۆ ئەگەر من ئەم کارەم نەبوایە ئەوا نەمئەزانی ڕوولەکوێبکەم، چونکە پێموایە ژیان پڕە لە زەبروزەنگ و مەرگیش کە سەرداری هەموو شتێکە.

**ئەدۆنیـــس:** بـــەڵام ژیـــان ئەکرێـــت زۆر جـــوان بێـــت، ئافرەتێکی جـــوان یـــان پیاوێکی قۆزت خۆشبووێت...

**نینار:** وایە، ئەوە ڕاستە، بەڵام هەموو ئەمانە کورت خایەنن.

**ئەدۆنیـــس:** ژیـــان دەرفەتـــی ئەوەمان ئەخاتە بەردەم کە شـــتێک بکەین، کاتێـــک ئێمەش ئەو دەرفەتانەی کە پێمانوایە بەشـــدارمان ئەکات لە دروستکردنی دنیادا بەکاریان دێنین، ئەبێتە هۆی پێدانی ڕوویەکی تازە بە ژیان.

**نینار:** وایە، من واخەریکە ئێستا لەمە تێئەگەم، چونکە هەموو کات و توانای خۆم تەرخانکردووە بـــۆ کارەکەم. بەڵام ئەوەت لەبیرنەچێـــت ئەو ئەزموونی جەنگەی کە هەمبووە، بەڕاســـتی کەمێک لەبەردەم حەقیقەتدا غەریبی کردووم.

**ئەدۆنیس:** ئەمە وایە بەڵام هەزاران کچیش هەن لەم حاڵەتەی تۆدان.

**نینار:** هەموو ئینســـانێک لەو جۆرە ژیانەدا ئەژی کە خۆی ئەیەوێت، بەتایبەتی ئەگەر بتوانێت. تەنهـــا لەبەر ئەوەی دوو ملیۆن کچ هەمان عەزابی جەنگیان وەک من چەشـــتووە و دواتر توانیویانە تێیبپەڕێنن، ئیتر مانای ئەوە نییە کە منیش ئەتوانم.

**ئەدۆنیـــس:** نەخێر، ئەمە ڕاســـتە، ئەم جۆرە شـــتانەش بەردەوام یەک لـــە دوای یەک لە مێژوودا دووبارەئەبنەوە، بەڵام ئەوەی مێژویشە نیشانەی ئەوە نییە ئازاراوی نییە.

**نینار:** ئازاراویی؟

**ئەدۆنیس:** من بەدەستی خۆم خۆم نەخستۆتە ئەو یاریەوە. ئینسان ئەتوانێت بەسەر هەموو ئەو شتانەدا سەرکەوێت کە مێژوویین.

**نینار:** ئەوە راســـتە ئینسان ئەتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا، بەڵام ماکی خۆی بەجێدێڵێت و تاریک

ئەبیت. تۆ بیرتنایەت ئەوکاتە من چەندە بچووک بووم.

**ئەدۆنیس**: وابوو، بەلام ئینسان بەهێزە. ئەتوانێت بەسەر هەموو شتێکدا زالبێت. دواتر...

**نینار**: ئایە دوو ئینسان ئەتوانن یەکیان خۆشبوێت بێ ئەوەی مندالیان ببێت

**ئەدۆنیس**: بێگومان.

**نینار**: ئەتوانن پێکیشەوەبن بێ ئەوەی مندال دروستبکەن.

**ئەدۆنیس**: تەنانەت زۆر لەوە زیاتر ئەتوانن پێکەوەبن بەبێ ئەوەی مندال دروست بکەن؟ کاتێک مندال دێتە ئاراوە هەموو شتەکان ئەگۆڕێن. لەگەل مندالدا کارلەیەککردنێکی نوێ و دۆخێکی نوێ دێتە ئاراوە. مندال وەک شۆڕشێکی بچکۆلە وایە کە لە مالدا ڕوودەدات.

**نینار**: هەروەها مندال ئەبێتە شەریکێکی ناو ئەو پەیوەندییەش.

**ئەدۆنیس**: بەلێ.

**نینار**: کەوایە بۆچی دوو ئینسان مندال دروست ئەکەن کە ئەشزانن ئەبێتە بومەلەرزەیەک بۆ ئەو پەیوەندییەی نێوانیان.

**ئەدۆنیس**: زۆر هۆ هەن وا لە خەلکی ئەکەن مندال بخەنەوە، ئەو هۆیانەش هەمیشە تایبەت و سەرنجڕاکێش نین.

**نینار**: تۆ حەزت نەئەکرد کوڕێکت ببوایە؟ عەلییەکی بچکۆلە؟ کە ڕەنگە ببوایەتە ئەدۆنیسێکی دوارۆژ؟

**ئەدۆنیس**: من هەرگیز بیرم لە شتی وانەکردۆتەوە، زۆر بەسادەیی لەبەر ئەوەی ئەمە هیچ گرنگییەکی لای من نییە کە مندالەکەم کوڕ بێت یان کچ.

## سەرچاوە:


Samtal med min far, Adonis
Ninar Esber
ISBN 978-91-88992-91-8

# وتووێژێك دواى تاراوگە

## دیدارێك لەگەڵ بەهمەنى قوبادى و روكسانا سابرى



بەهمەنى قوبادی

**لە فارسییەوە: مەنسوور تەیفووری**

"کەس ئاگای لە پشیلە ئێرانیەکان نییە" پێنجەمین بەرهەمی دەرهێنەری ناسراوی کورد بەهمەنی قوبادییە، کە دە ســاڵ پێشــتر بە فیلمی "ساتێک بۆ مەستی ئەســپەکان" خەڵاتی کامێرای کانی وەرگرتووە . ئەو لەم فیلمە تازەیدا یەکەم جارە لەگەڵ کەســێکی دیکە دەقی فیلم بنووســێت، واتە لەگەڵ ژوورنالیستێکی ئێرانی ئەمەریکی بە ناوی رۆکسانا سابری. رەنگە باشترین ناو بۆ رۆکسانا هــەر ئەو ناوە بێــت خۆی دواتر لە کۆی بیرەوەریەکانی خۆی ناویەتی: "لە نێوان دوو ژیاندا: ژیانی خۆم و دەستبەســەری لە ئێران" کە زۆر بە خێرایی لــە لایەن دەزگای "هارپەر جوولینس"ەوە چاپ کرا. ئەگەرچی قوبادی خۆی ئینگلیزی دەزانێت، کەچی نەیویست بە ئینگلیزی وەڵامی پرسیارەکان باتەوە، بەڵام بە یارمەتی شــیاوی رێزی وەرگێڕەکەی، واتە شــەیدا دیانی لەگەڵ قوبادی و روکسانا لە ســەر گێڕانــەوە تاقانەکەیان بۆ موزیکــی ژێرزەمینی ئێرانی دوام. فیلمەکە بەســەرهاتی دوو موزیسیەنە بە ناوی نیگار و ئەشکان کە بیر لە دروستکردنی گروپێکی مووزیک و چوون بۆ دەرەوە بۆ نواندنی مووزیک دەکەنەوە و، ئەو شتانەی لەم رێگەدا تووشی دەبن.

**پرســیار**: بۆچی رووتان لە گێڕانەوەی فیکشــناڵ یان خەیاڵی کردوە و تەنیا فیلمێکی بەتەواوی بەڵگەنامەییتان دروست نەکرد؟ لە کاتێکدا پێشتریش لەم بارەوە لێکۆڵینەوەتان کردبوو.

**قوبادی**: راستە . زۆربەی ئەو فیلمانەی باسی مووزیک دەکەن بەڵگەنامەیین. بە داخەوە لە جیهانی ســینەمای دۆکیۆمێنتری یان بەڵگەنامەییدا جۆرێک گوشــار هەیە . کاتێ بڕیارمدا لەباتی فیلمێکی بەڵگەنامەیی فیلمێکی هونەری درووســت بکەم، چەند ئایدیایەکم لە خەیاڵدا بوو، یەکێکیان ئەوە بوو زیاتر بگەمە بینەر. بۆیە لام وابوو ئەگەر فیلمەکە جۆرێک گێڕانەوەی تێکەڵ بێت، گەرموگوڕتر دەبێت. هەروەها لام وایە ئەمە رێگەیەکی باشــتری نیشــاندانی تارانی راستەقینە بێت. فیلمەکە بە شــێوەی ئاسایی درامیشــی تێکەڵە، ئەکتەرەکان دەگوێزنەوە، خۆیان دەشــارنەوە . هەر ئەمەش وا دەکات فیلمەکە راستەقینەتر بێت.

**پرسیار**: خانمی رۆکسانا، گیرانە بەناوبانگەکەی ئێوە لە تاران چ کاریگەرییەکی لەسەر فیلمەکە هەبوو؟ لە کام بەشی فیلمەکەدا بوو کە ئێوە گیران؟

**روکســانا**: من یەکەم ئێدیتەکانی فیلمەکەم بینیبوو. نوســخەکەی یەکەم زۆر زووتر بوو. من رای خۆم گوت و دوو یان سێ هەفتە دوای ئەوە گیرام.

**پرسیار**: کەواتە گیرانی ئێوە بە کردەوە کاریگەریی لەسەر فیلمەکە نەبوو، واتە لە بەرهەمهێنان و ئێدیتدا، لە کاتێکدا پێشتر بە قورسی سەرت بە فیلمەکەوە قاڵبوو؟

**روکسانا**: ئەم گیرانەی من دەشێ کاریگەریی لەسەر بیرکردنەوەی بەهمەن دانابێت. ئەو بە خەمی منەوە بوو. واتە کاریگەریی گیرانەکەی من ناڕاستەوخۆ بووە .

**پرسیار**: تێدەگەم. چیرۆکی سامناکی پاش بەرهەمهێنان! باشە ئێوە پێش گیرانەکەتان چۆن وەک نووســەری هاوکار یارمەتی بەهمەنتان دەدا؟ هەر کەس بەشێکی دەنووسی یان پلانەکانتان پێکەوە دەنووسی؟

**روکســانا**: بەهمــەن پێی گوتم بەنیازە فیلمێک لەســەر مووزیکی ژێرزەمینی دروســت بکات و ئایدیاکەی لای من باس کرد و لێی پرسیم ئاخۆ حەز دەکەم هاوکاریی بکەم. ئەو و نیگار و ئەشکان بەشی زۆری کارەکەیان نووسیبوو. من تەنیا بە وتنی بۆچوونی خۆم یارمەتیم دەدان. بەڵام بەزۆری مووزیســیەنەکان خۆیان فیلمەکەیان دەنووســی. سیناریۆکە بەپێی ژیانی ئەوان و ئەو کێشانە بوو تووشــیان دەهات. هەروەها ویســتیان بۆ ژەندنی مووزیک. ئەڵبەت من بۆ هەڵبژاردنی گرووپەکەش یارمەتیم دان. مووزیســیەنەکان ئێمەیان بە کەســانی دیکە دەناساند. ئێمە باسی ژیانی خۆیانمان لەگەڵ دەکردن، شــوێنی تەمرین و پرۆڤەیانمان دەبینی، ناڕەزایی دراوســێکانی ئەوانمان ئەزموون دەکرد و بەم شــێوە لە خەمەکانیان تێدەگەیشــتین. ئەوان بۆیان نەبوو لە بواری گشتیدا مووزیک لێبدەن. نەیاندەتوانی بە مووزیکەکەیان بژین. ئێمە چیرۆکەکەمان بەپێی ئەم راستیانە داڕشت.

**بەهمەنی قوبادی:** روکســـانا بەڕاستی کاریگەری و دەورێکی زۆری لە فیلمەکەدا هەبوو. من داوام لێکـــرد یارمەتیمان بدات، ئەو لە روانگەی بینەرێکی رۆژئاواییەوە ســـەیری کارەکەی دەکرد و ئەمە بۆ من زۆر پێویســـت بوو. لە هەڵبژاردنی مووزیک و گرووپەکاندا زۆر یارمەتی داین. روکســـانا بە هەڵبژاردنی پارچە مووزیکەکان و ناسینی گرووپەکان یارمەتییەکی گەورە بوو.

**پرســـیار:** کێشە و گرفتەکانی تەمرین یان پرۆڤەش ناڕاستەوخۆ ئاماژەیان بۆ کراوە. گواستنەوەی بڵندگۆی قورس، داپۆشـــینی سازەکان بۆ ئەوەی دەنگیان نەیەت و دراوسێکان پۆلیس بانگ نەکەن. بەڵام وەک هەموو کۆمەڵگا ژێرزەمینییەکان مووزیک بە ئاشـــکرا نهێنییە. خەڵک تەنیا لە بێزاریدا پۆلیسیان بانگ دەکرد نەک لەبەر رق لە مووزیک وەک دەستبردنێک بۆ شتە پیرۆزەکان. ئەمە بیری رژێمی سۆڤیەتم دەخاتەوە. دەکرێ زیاتر باسی ئەم لایەنە بکەن؟.

**قوبادی:** هۆیەکەی هەر ئەو واقیعەیە کە خەڵکی تێدا دەژین. لە تاران چەشەی مۆسیقایی خەڵک لە چەشـــەی خەڵکی شـــارێکی بچووک، فرە چەشن و فرە رەنگترە. بەڵام زۆربەی خەڵک ئامادە نین کەســـێک بە دەســـتەوە بدەن. بە جۆرێک، لە هەموو کۆڵان و شەقامێکی شاردا یەک دوو ماڵێک بە دەســـتی هێزی بەسیج و مەدەنی پۆشـــەکانەوەیە. هەر ئەمانەن کە مووزیســـیەنەکان بەدەستەوە دەدەن.

**پرسیار:** ئاخۆ ئەمە بە مانای دۆخێکی گشتییە لە گومان؟

**قوبادی:** نا، خەڵک بەدەگمەن یەکتر بە دەســـتەوە دەدەن. بە زۆری هێزی میلیشیا یان مەدەنی پۆشەکان ئەمە دەکەن. لە شارە بچووکەکاندا ئەم رێژە لە تاران زیاترە، کە من لە فیلمەکەدا ئەمەم پیشـــان داوە. ئەکتەرەکان بۆیان دەگێڕامەوە کە جارجار دراوســـێکان بەڕاستی لێیان بێزار دەبوون، واتە دەنگی مووزیک ماندووی دەکردن، بەڵام نەیاندەدان بە دەســـتی پۆلیسەوە. با ئەوەش بڵێم کە پۆلیس ســـاغ نییە. لەباتی گرنگیدان بەو گەندەڵییەی کـــۆی کۆمەڵگای گرتۆتەوە، خۆی بە گرتنی ئەم جۆرە کەسانە و تێکدانی کۆبوونەوەکانیانەوە خەریک کردووە. هۆی دووهەمتان بۆ ئەم بەراوردە لەگەڵ کۆمەڵگای رووســـیا ئەوەیە کە ئەوەی دەیبینین راســـتیی ژیانی ئەم هونەرمەندانەیە. ئەگەر دەبینیت لە شـــوێنێکی پەروەردەی گادا پرۆڤە دەکرێت، لەبەرئەوەیە کە ئەمە بەڕاســـتی روویداوە. هەر لەبەر ئەمەشە ئێمە گەڕاوینەتەوە سەر ئەم دیمەنە و گرنگیمان پێداوە.

**پرسیار:** ئەو کەسەی لەگەڵ جووتە موزیسیەنەکەدایە، واتە کەسایەتی نادر، نەک لەبەر مووزیک بەڵکوو لەســـەر مامەڵەی نایاســـایی فیلم گیراوە. ئاخۆ ئەمە پێوەندی بە سانسۆرکرانی فیلمەکانی تۆوە هەیە لە ئێران و جۆرێک بەراوردە؟

**قوبـــادی:** ئەزموونێکی ناخۆشـــی منداڵیم بیرە، واتە ئەو کاتەی هەژدە یان نۆزدە ســـاڵان بووم. لەســـەر شـــەقام وەستابووم و پۆلیس هات و پرســـی بۆ لەوێم و ئاخۆ چاوەڕێی هاتنەوەی کچانم لە

قوتابخانە؟ منیش وتم چاوەڕێی براکەم دەکەم، بەڵام ئەوان گرتیانم.

جارێکـــی دیکەیان بەبـــێ مۆڵەت ماتۆڕم لێخوڕێبـــوو و دەعمم کرد. بۆ ســـزا ٧٥ قامچییان بۆ نووسیم. دەی ئەمانە بە قووڵی لای من ماوە. ئەزموونی دادوەر و دادگایی. بە تایبەت ئەگەر سوننی مەزهەب یان کورد بیت و دادوەرەکەت شیعە بێت، ئەوە ئیتر گران رزگارت دەبێت. راستە، بەم شێوە کەسایەتی نادر بەپێی کەسایەتی خۆم درووست کراوە.

لە دیمەنی ململانێی دادوەر و نادردا، زۆربەی دیالۆگەکان خۆخولقاون( لەڕاستیدا من ئەو کەسە بووم کە لە چوارچێوەی کامێرادا دیار نییە، بەڵام خەریکی ململانێیە لەگەڵ دادوەرەکە) کاتێ شتێکم پـــێ بـــاش بوو دەمگوت" دەی برادەران ، ئێســـتە تۆمار دەکەین". پێنج دەققـــە یان زیاتر فیلمman هەڵدەگرت. خۆبێژانە دیالۆگەکانمان دەگوت و چێمان پێ باش بوو فیلمman لێ هەڵدەگرت.

**پرسیار**: دیمەنی هەرە جێگەی سەرنج بۆ من سێکانسی ویدیۆی رەپێرە ئێرانیەکان بوو. دەقەکانیان باسی جیاوازی چینایەتی و ئابووری بوو، کە ناوەڕۆکی هاوبەشی رەپە لە دنیادا. ئەم دەقانە زیاتر باســـی خەباتن بۆ ئازادی لە ماڵەوە تاکوو ئازادییەکی داهێنەرانە لە دەرەوەی سنوورەکانەوە. ئەمە ناکۆکییەکی تێدایە. تێکۆشـــەری سیاسی راستەقینە کێییە؟ ئەوەی واز لە هەموو شتێک دەهێنێت بـــۆ ئەوەی وڵاتێکی ئازادتر بدۆزێتـــەوە یان ئەوەی دەمێنێتەوە و بۆ گۆڕانـــی کۆمەڵگاکەی خەبات دەکات؟ رای خۆت لەسەر ئەمە چییە؟

**قوبادی**: بەڕای من هەردووکیان راســـتە. ئەمە دەیســـەلمێنێت کە مـــن ناتوانم پەیامی فیلمەکە کۆنترۆڵ بکەم. من بە موزیسیەنەکانم دەگوت بێن و چییان پێ خۆشە لەبەردەم کامێرادا بیڵێن. کە بڕیاری هاتنە دەرەوەم دا، باســـەکەم لای جەعفەری پەناهی(دەرهێنەرێکی ئێرانی کە خەڵاتی کانی وەرگرتوە و ئەمســـاڵ چەند مانگێک زیندانی کرا) ئاشـــکرا کرد، ئەو ئەم بڕیارەی پێ باش نەبوو و من وامدەزانی کارێکی هەڵە دەکەم. بەڵام ئێســـتا دەبینم هەڵە نەبووم. لێرە دەتوانم زیاتر بەکەڵک بێم. ئێمە لێرە دەتوانین راســـتیەکانی ئێران بۆ جیهانی ئازاد باس بکەین. بڕێکی کەمی ئێمە هاتە دەرەوە، پێنج کەس. ئەوەندەش بەســـە. باشـــە کە هەموان نایەنە دەرەوە. کەسانێکی وەک منیش کە هاتوونە دەرەوە، دەتوانن بە ئەو هەلانەی لێرە دەڕەخســـێت یارمەتی ئەو کەسانە بدەن کە لە ناوخۆ ماونەتەوە.

# پێویستم بە ئازاری تەنیاییە تا خەیاڵەکانم بخەمە کار

## دیدار لەگەڵ ئۆرهان پاموک


ئۆرهان پاموک

**لە فارسییەوە: جەبار سابیر**

– بەیندتان لەگەڵ گفتوگۆدا چۆنە؟

* هەندێکجار تووڕەدەبم، چون وەڵامی گەمژانە بە هەندێک پرسیاری بێسەروبەر دەدەمەوە. ئەم پرسە لە گفتوگۆکانیشمدا بە زمانی تورکی بە ئەندازەی ئینگلیزییەکان روودەدات. بە تورکی قسەکردنی زۆر بۆ من جێگای پیاهەلدان نییە، جارجارێ رستەی گەمژانە دەهێنمە سەر زمان. لە تورکیا، زیاتر بە دەلیلی گفتوگۆکانم، هێرشم دەکرێتە سەر تا بە هۆی کتێبەکانمەوە. لەم وڵاتەدا، نووسەرانی ستوونی سیاسی رۆژنامەکان و کەسانێک کە خەریکی شیکاری سیاسین، رۆمان ناخوێننەوە.

- کتێبەکانی جەنابت لە ئەورووپاو ئەمریکا بە گشـــتی تووشـــی کاردانەوەیەکی پۆزەتیڤ بووە. مامەڵەی رەخنەگرەکان لە تورکیا، لەگەڵ کتێبەکانت چۆن بوو؟

* ئیتر ساڵە باشەکان تێپەڕیون، زەمانێک کە یەکەمین کتێبەکانم بڵاودەکردەوە، نەوەی پێشووی نووســـەران بەرەو فەوتان دەچوو و لەبەرئەوەی نووســـەرێکی تازەبووم بۆیە پێشوازی لە کتێبەکانم دەکرا.

- مەبەستتان لە وەچەی پێشوو کێیە؟

* ئەو نووســـەرانەی دەربەست (ئیلتیزام)ێکی کۆمەڵایەتییان هەبوو، نووسەرانێک کە هەستیان دەکرد ئەدەبیات لە خزمەتی رەوشت و سیاسەتدایە. ئەم نووسەرانە بەشێوەیەکی رەها واقیعگەرابوون، ئەزموونگەر نەبوون. وەک زۆرینەی نووســـەرانی وڵاتە هەژارەکان، تواناکانی خۆیان لە رێگەی خزمەت بە میللەتەکەیان بەهەدەر دەدا. حەزم نەدەکرد وەک ئەوانەبم، چونکە تەنانەت لە گەنجیشـــدا لەزەتم لە کارەکانی ولیام فۆکنەر، ڤێرجینیا وۆڵف و مارســـیل پرۆســـت وەردەگرت- هەرگیز بە دوای مۆدیلە سۆســـیال- ریالیستییەکەی جۆن شـــتاین بێک و ماکســـیم گۆرکییەوە نەبووم. ئەدەبیاتێک کە لە دەیەی شەست و حەفتاکاندا لەدایکدەبوو، وردەوردە بەسەردەچوو، هەربۆیە وەک نووسەرێکی نەوەی تازە پێشوازییان لە من دەکرد.

لە نیوەی دووەمی دەیەی نەوەدەکان، فرۆشـــی کتێبەکانم ئەوەندە زۆربوو کە هیچ کەســـێک لە تورکیادا بە خەونیش نەیدەبینی، مانگی هەنگوینی من لەگەڵ چاپخانەو رۆشنبیرانی تورک کۆتایی هات. لەوەودوا، مامەڵەی رەخنەگران زیاتر کاردانەوەبوو بە ناوبانگ و فرۆشی کتێبەکانم تا ناوەرۆکیان. بە داخەوە ئێســـتا بەهۆی دەربڕینی راوبۆچوونی سیاســـیم ناســـراوم- کە رۆژنامەنووسە تورکەکان زۆرینەیان لەو گفتوگۆیانەم دەردەهێنا کە لە دەرەوەی وڵات کردبووم و بە دزێوی شـــێواندویانە، تا لەوەی کە هەم تووندڕەوتر و لە ئاستی سیاسیدا گەمژەتر بێمە بەرچاو.

-کەواتە کاردانەوەیەکی دوژمنانە بەرامبەر ناوبانگ و خۆشەویستی ئێوە هەیە؟

* بـــە بـــڕوای من، ئـــەم کاردانەوەیە جۆرێک ســـزایە بەهۆی فرۆشـــی کتێـــب و بیروبۆچوونە سیاسییەکانمەوە. بەڵام ئیتر نامەوێ ئەم قسانە دووبارە بکەمەوە، چونکە وادێتە بەرچاو کە بەرگری لە خۆم دەکەم. ئەشێ وێنەیەکی هەڵە لە کۆی مەسەلەکە بدەمە دەستەوە.

- لە کوێ دەنووسی؟

* هەمیشە لەسەر ئەو باوەڕەبووم کە جێگایەک مرۆڤ لێی دەنوێ یا لەگەڵ هاوسەری ژیانیدا تێیدا دەژی، دەبێ جیا بێت لە جێگایەک کە لێی دەنووسرێ. تەشریفات و وردەکاری خێزانی بە شێوەیەک لە شـــێوەکان خەیاڵ لە ناودەبات. شـــەیتان/ خودای ناخم لە ناودەبات. رەوشی ناوماڵ و تەمەڵکەری رۆژانە دەبێتە هۆی ئەوەی ئارەزووی ئەو دنیایەی تر، ئەو دنیایەی کە خەیاڵ بۆ کارابوونی پێویستی

پێیەتی، کاڵ بێتەوە. هەربۆیە، ساڵانێکە کە هەمیشە لە دەرەوەی ماڵ، نووسینگە یا شوێنێکی بچووکم بۆ کارکردن هەبووە. هەمیشە ئەپارتمانی جیاوازم هەبووە بۆ خۆم.

بەڵام جارێکیان شەش مانگێکی خوێندنم لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەسەربرد، ئەویش لەگەڵ هاوسەری پێشووم کە لە زانکۆی کۆڵۆمبیا دکتۆرای وەردەگرت. لە ئەپارتمانی تایبەتی خوێندکارەکان پێکەوە دەژیاین، کە زۆر بچووک بوو، لە ئەنجامدا، ناچاربووم هەر لەو جێیەی کە دەخەوتم، بنووسم. چواردەورم پڕبوو لە نیشانەکانی ژیانی خێزانی. ئەم بابەتە ئازاری دەدام. ببووە خووم بەیانیان، وەک مرۆڤێک کە بیەوێ بڕواتە سەرکار، خوداحافیزی لە ژنەکەم بکەم. لە ماڵ دەچوومە دەر، پیاسەیەکی دەورووبەرم دەکرد و وەک کەسێک کە بگاتە نووسینگەی کارەکەی، دووبارە دەچوومە ئەپارتمانەکەوە.

دە ساڵ لەمەوبەر، ئەپارتمانێکم پەیداکرد بەسەر دەریای بسفۆڕدا دەیڕوانی، بە دیمەنی کۆنی ئەستەنبوڵەوە. ئەم ئەپارتمانە یەکێ لە باشترین دیمەنەکانی ئەستەنبوڵی هەیە. تا شوێنی ژیانم بە پێ بیست و پێنج خولەک رێگەیە. پڕە لە کتێب و مێزی نووسینەکەم بەرامبەر ئەو دیمەنەیە. هەموو رۆژێ، بەشێوەیەکی مامناوەندی، نزیکەی دە کاتژمێرم لەوێ دەبەمەسەر.

– رۆژی دە کاتژمێر؟

* بەڵێ، من کەسێکی پڕ کارم. لەزەت لە کارکردن وەردەگرم. خەڵکی دەڵێن سەرخوازم، رەنگیشە ئەم قسەیە تاڕادەیەک راستی تێدا بێت. بەڵام عەشقی کارەکەمم. وەک منداڵێک کە یاری بە بابەتی یارییەکانی بکات، لەزەت لە دانیشتنی پشت مێزەکەم وەردەگرم. لە راستیدا کارە، بەڵام یاری و سەرگەرمیشە.

– ئۆرهان، گێڕەرەوەی رۆمانی (بەفر) کە هاوناوی تۆیە، وەک کارمەندێکی ئۆفیس وەسفی خۆی دەکات کە هەموو رۆژێ لە کاتژمێرێکی دیاریکراودا لە پشت مێزی کارەکەیەوە دادەنیشێ. جەنابیشت بۆ نووسین وەها دیسپلینێکت هەیە؟

* مەبەستی من جەخت کردن بوو لە خەسڵەتی ئیداری رۆماننووس بە بەراورد لەگەڵ شاعیردا، کە لە تورکیا رێزو حورمەتێکی زۆری هەیە. لە تورکیا شاعیری کارێکی زۆر خۆشەویست و جێگەی رێزە. زۆربەی سوڵتان و دەوڵەتدارانی سەردەمی خەلافەتی عوسمانی شاعیربوون، بەڵام نەک بەو تێگەیشتنەی ئەمڕۆ لە زەینماندایە بۆ شاعیر. ئەم کارە سەدان ساڵ رەوشێک بوو بۆ ئەوەی کە خۆت وەک رۆشنبیر جێگیر بکەیت. زۆربەی ئەو کەسانە شیعرەکانیان لە کۆپی دەستنووسدا بەناوی دیوانەوە کۆدەکردەوە. لە راستیدا، شیعری دەرباری عوسمانی بە شیعری دیوان ناسراوە. نیوەی دەوڵەتدارانی عوسمانی دیوانە شیعریان هەیە. ئەم جۆرە شیعر هۆنینەوەیە رەوشێکی زۆر ئاڵۆز و دەستکردبوو، لەگەڵ یاساو رێسای زۆر. زۆرێک ئاسایی و زۆرێک دووبارە. دوای هاتنە ناوەوەی فکری خۆرئاوایی بۆ تورکیا، ئەم میراتە لەگەڵ ئایدیای رۆمانتیک و مۆدێرن شاعیری وەک کەسێک

ناســـاند کە بە دوای حەقیقەتەوەیە و لێرەوە ڕێزو حورمەتی شاعیری زیاتر کرد. لە لایەکیترەوە، لە بنەماوە ڕۆماننووس کەســـێکە کە بەخۆڕاگرییەوە، وەک مێروولە مەوداکان لەناودەبات. ڕۆماننووس بە خۆڕاگرییەکەی کار لە ئێمە دەکات، نەک بە دیدە شەیتانی یا ڕۆمانتیکییەکەی.

– قەت شیعرت نووسیوە؟

* زۆرجار ئەمەیان لێپرسیوم. لە هەژدە ساڵیدا شیعرم دەنووسی و هەندێک لە شیعرەکانیشم لە تورکیا بڵاوکردەوە، بەڵام وازم لە شـــیعر نووسین هێنا. چونکە تێگەیشتم شاعیر کەسێکە کە خودا لە زمانی ئەوەوە قســـە دەکات. دەبێت شیعر زەین داگیر بکات. من لە شیعردا خۆم تاقی ئەکردەوە، بەڵام دوای ماوەیەک تێگەیشـــتم کە خودا قســـە لەگەڵ من ناکات. زۆر خەفەتم لەم بابەتە خوارد و هەوڵمدا وا لای خۆم وێنای بکەم کە ئەگەر خودا لە زمانی منەوە قسەی بکردایە، چی دەوت؟ زۆر بە وەسواســـی و بەخاووخلیچکی، دەســـتم کرد بە نووسین، هەوڵم دەدا وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزمەوە. ئەم کاری پەخشـــان نووسینە، چیرۆکنووسینە. بەم شێوەیە، وەک کارمەندێکی ئۆفیس، کارم کرد. بە بۆچوونی هەندێک لە نووسەران ئەم قسەیە هەندێک سووکایەتی ئامێزە، بەڵام ئەمەم قبوڵە، من وەک کارمەندێکی ئۆفیس کاردەکەم.

– هەست ناکەیت بە تێپەڕینی کات، پەخشان نووسین بۆ ئێوە ئاسانتر بووە؟

* بە داخەوە وانییە. هەندێکجار هەســـت ئەکەم دەبێ کەســـێتی چیرۆکەکەم بچێتە ژوورێکەوە و هێشـــتایش نازانم دەبێ چۆن ئەو ناچاری ئەم کارە بکەم. ڕەنگە ئێســـتا متمانەم بە خۆم زیاتر بووبێـــت، کە جارجارێ ئەشـــێ زیانی هەبێت، چونکە ئیتر لەو حاڵەتـــەدا ئەزموون ناکەیت، تەنها هەرچییەک بە نووکی قەڵەمەکەتاندا بێت دەینووســـیت. من سی ساڵە پەخشان دەنووسم، هەربۆیە واهەستەکەم کەمێک پێشکەوتووم. بەهەرحاڵ نهۆ جارجارێ لە شوێنانێک کە بیرم لێنەکردبوونەوە، دەگەمە بنبەســـت. کەسێتی چیرۆکێک ناتوانێ بچێتە ژوورێکەوە و منیش نازانم چی بکەم. هێشتا نازانم! دوای سی ساڵ!

پۆلێنکردنی کتێب بە بەشی جیاواز لە شێوەی بیرکردنەوەمدا بۆ من زۆر گرنگە. وەختی نووسینی ڕۆمان، گەر لە پێشەوە تەواوی هێڵی چیرۆکەکە بزانم، کە زۆربەی جاران دەیزانم- بە بەشی جیاواز دابەشی دەکەم و هەندەکی ڕووداوەکان لە زەینمدا دروست دەکەم، کە حەزدەکەم لە هەموو بەشێکدا ڕووبدات. بەگشـــتی لە بەشـــی یەکەمەوە دەســـت پێدەکەم و باقی بەشـــەکانی تر بەڕیز نانووسم. کاتێکیش بیرم کارناکات، کە بە لای منەوە پرســـێکی هێند گرنگ نییە و نیگەرانم ناکات، درێژە بە کارەکەم دەدەم و هەر بەشێکم حەز لێی بێت دەینووسم. ئەشێ بەشی یەک تا پێنج بنووسم و دواتر، گەر کارەکە لەزەتم پێنەدات، بازدەدەمە بەشی پازدەو لەوێوە درێژە بە نووسین دەدەم.

– مەبەستتان ئەوەیە کە لە سەرەتاوە بەرنامەڕێژی بۆ تەواوی کتێبەکە دەکەیت؟

* هەموو شـــتێ. بۆ نموونە رۆمانی (من ناوم ســـوورە)، کارەکتەری زۆری هەیە و من ژمارەیەکی دیاریکراوم لە بەشـــەکان بۆ هەر کارەکتەرێک تەرخانکردووە. وەختایەک کە ئەم رۆمانەم دەنووسی، جارجارێ حەزم دەکرد وەک یەکێ لەو کارەکتەرانە بم. هەربۆیە، وەختێ یەکێ لە بەشەکانی شەکورەم تەواو کرد- وابزانم بەشی حەوت بوو- بازمدا بۆ بەشی یازدە، کە دیسان شەکورە قسە دەکات. حەزم دەکرد شەکورە بم. بازدان لە کارەکتەرێک یا پێرسونایەکەوە بۆ کارەکتەر یا پێرسونایەکی تر، ئەشێ نووسەر دڵسارد بکات.

بەڵام بێگومان هەمیشە دوا بەش لە کۆتاییدا دەنووسم. حەزدەکەم سەر بخەمە سەر خۆم، لە خۆم بپرسم کە دەبێ کتێبەکە چ کۆتاییەکی هەبێت. یەک جار زیاتر ناتوانم کۆتایی بنووسم. لە کۆتایی کارەکەدا، بەرلەوەی کتێبەکە تەواو بکەم، دەست لە نووسین هەڵدەگرم و زیاتر خەریکی پاکنووسی بەشەکانی سەرەتا دەبم.

- لە کاتی کارکردندا خوێنەرێکت هەیە؟

* من هەمیشـــە شتێک کە نووســـیومە بۆ هاوبەشـــی ژیانمی دەخوێنمەوە. هەمیشە سوپاسی دەکەم کە بڵێ دیسان پیشانمی بدە، پیشانم بدە ئەمڕۆ چیت کردووە. ئەم کارە نەک تەنیا فشارێک کە پێویستە دەیخاتە سەر تۆ، بەڵکو وەک ئەوەوایە کە باوک یا دایکتان بە پشتتان بکێشێ و بڵێ ئافەرین! جارجارێ ئەو کەســـە دەڵێ، بەداخم، بە بۆچوونم ئەم بەشـــەی باش نییە. زۆریش باشە. زۆر حەزم لەم شێوازەیە.

هەمیشـــە (تۆماس مان)م بیردەکەوێتەوە کە یەکێک لەسەر مەشقەکانی من بوو. ئەو کردبووەیە خوو تەواوی خێزانەکەی، واتا ژن و شـــەش منداڵەکەی، کۆبکاتەوە. کردبوویە خوو نووسینەکانی لە کـــۆڕی ئەندامانی خێزانەکەیدا بخوێنێتەوە. زۆرم حەز لەم کارەیە. وەک ئەوەیە کە باوک چیرۆک بۆ خێزانەکەی بگێڕێتەوە.

- ئێوە لە تافی لاویدا دەتانویست ببنە شێوەکار. عەشق بۆ شێوەکاری لە ئێوەدا کەی جێی خۆی بە عەشق بە نووسین دا؟

* لە بیست و دووساڵیدا. لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە، حەزم دەکرد ببمە شێوەکار و خێزانەکەشم ئەمەیـــان قبوڵ کردبوو. هەموویان وایان بیردەکردەوە من دەبمە شـــێوەکارێکی بەناوبانگ. بەڵام لە هێکرا وەک بڵێی کتوپڕ پەیم بە شتێک برد- تێگەیشتم جێیەکی کارەکە کەلێکی تێدایە- و وازم لە شێوەکاری هێناو دەستم کرد بە نووسینی یەکەمین رۆمانم.

- کەلێن لە کوێی کارەکەدا هەبوو؟

* ناتوانـــم بڵێم دەلیلی ئـــەم کارەم چییە. لەم دواییانەدا کتێبێکم بڵاوکردەوە بە ناونیشـــانی (ئەستەنبوڵ). نیوەی ئەوە ژیاننامەی منە تا ئەو کاتە، نیوەکەی تریشی وتارێکە لەمەڕ ئەستەنبوڵ

یـــا وردتر بڵێم: وێنەی زەینی منداڵێکە لە ئەســـتەنبوڵ. پێکهاتەیەکە لـــە بیرکردنەوە لەمەڕ وێنەو دیمەنە سەرنج ڕاکێشەکانی شارێک و هەستی منداڵێک لە هەمبەر ئەو شارە و ژیاننامەی تایبەتی ئەو منداڵەیە. دوا ڕســـتەی ئەم کتێبە ئەمەیە: (وتم: حەزناکەم ببمە شێوەکار. دەمەوێ ببمە نووسەر.) ڕوونکردنەوەیـــەک لە ئارادا نییە. هەرچەند ڕەنگە خوێندنەوەی تـــەواوی کتێبەکە ڕوونکردنەوەیەک بداتە دەستەوە.

– خێزانەکەتان لەم بڕیارەتان ڕازیبوون؟

* دایکم بێتاقەت بوو. باوکم هاودڵییەکی زیاتری پیشـــان دەدا، چونکە خۆیشـــی لە تافی لاویدا حەزی دەکرد ببێتە شـــاعیر و شیعری پۆل ڤالێری وەرگێڕابوو بۆ تورکی، بەڵام وەختێ ڕووبەڕووی تەوس و گاڵتەجاری کۆڕی هاوڕێیانانی خۆی ببۆوە، وازی لە شیعر نووسین هێنابوو.

– خێزانەکەتـــان قبوڵـــی کردبـــوو ببیتە شـــێوەکار، بەڵام کۆک نەبوون لەســـەر ئـــەوەی ببیتە ڕۆماننووس؟

* بەڵێ، چونکە وایان بیرنەدەکردەوە هەموو کاتم بۆ شـــێوەکاری تەرخان بکەم. کارو پیشـــەی خێزانیمان ئەندازیاری ڕێگەو بان و تەلارسازی بوو. باوەگەورەم ئەندازیاری ڕێگە و بان و تەلارسازی بوو، لە دروستکردنی هێڵی شەمەندەفەردا پارەیەکی زۆری چنگ کەوتبوو. باوک و مامەکانم ئەم پارەو پوولەیان بەهەدەردا، وەلێ هەموویان چوون بۆ زانکۆی ئەندازیاری، زانکۆی تەکنیکی ئەســـتەنبوڵ. وایـــان چاوەڕوان دەکرد منیش بچمە هەمان زانکۆ و منیش قبوڵم کرد. بەڵام لەوێوە کە هونەرمەندی خێزانەکەمان بووم، هەموو لەســـەر ئەو باوەڕەبوون ببمە ئەندازیاری تەلارســـازی، بە ڕواڵەت وادیار بوو بۆ هەمووان ڕێگەچارەیەکی ڕازیکەربوو. بەم شێوەیە، چووم بۆ ئەو زانکۆیە، بەڵام لە ناوەڕاستی خولی تەلارسازیدا کتوپڕ وازم لە شێوەکاری هێناو کەوتمە ڕۆماننووسین.

– وەختێ بڕیارت دا واز لە شـــێوەکاری بهێنی، یەکەم ڕۆمان لە زەینتاندا شـــێوەی گرتبوو؟ بەم دەلیلە ئەم کارەت کرد؟

* تا ئەو جێیەی بیرم بێت، بەرلەوەی کە بزانم چ شتێک بنووسم، حەزم دەکرد ببمە ڕۆماننووس. لە ڕاســـتیدا، وەختێ بە پراکتیکی کەوتمە نووســـین، دوو ســـێ جار هەڵەم کرد. هێشـــتایش ئەو یاداشـــتانەم هەیە. بەڵام نزیکەی شـــەش مانگ دواتر، دەستم کرد بە نووسینی ڕۆمانێکی گەورە کە دواجار بە ناوی (جەودەت بەگ و کوڕەکانی) بڵاوبۆوە.

– ئەم ڕۆمانە وەرنەگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی؟

* ئەم ڕۆمانە لە بنەماوە چیرۆکێکی درێژی خێزانییە، وەک چیرۆکی فۆرسایت یا بۆدنبرۆکەکانی تۆماس مان، تۆزێ دوای ئەوەی کە لە نووسینی ئەو ڕۆمانە بوومەوە، لەوەی کە وەها ڕۆمانێکی لە مۆد

کەوتووم نووسی بوو، پەشیمان بوومەوە، کۆن بوو هی سەدەی نۆزدە بوو. دەلیلی پەشیمانییەکەم ئەوەبوو کە لە بیست و پێنج یا بیست و شەشساڵیدا وردە وردە بیرم کردەوە کە دەبێت نووسەرێکی مۆدێرن بم. وەختێ دواجار ئەم رۆمانە بڵاوبۆوە- ئەو کات تەمەنم سـی ساڵ بوو- شێوازی نووسینم ئەزموونگەراتر ببوو.

- دەڵێیت حەزتان دەکرد مۆدێرنتر و ئەزموونگەراتر بیت. سەرمەشقێکیشت لە زەینداا هەبوو؟

* ئەوکات، نووسـەرانی گەورە لە روانگەی منەوە تۆڵسـتۆی، دیستۆڤسکی، ستانداڵ یا تۆماس مان نەبوو. پاڵەوانەکانم ڤێرجینیا وۆڵف و ولیام فۆکنەر بوو. ئێسـتا مارسیل پرۆست و ناباکۆفیش دەخەمە سەر ئەو پێرستە.

- رۆمانی ژیانی نوێ بەم شـێوەیە دەسـت پێدەکات: (رۆژێک کتێبێکم خوێندەوەو ژیانم ژێرەو ژوور بوو.) هیچ کتێبێک وەها کاریگەرییەکی لەسەر تۆ داناوە؟

* کاتێ بیست و یەک یا بیست و دوو ساڵ بووم، بە بۆچوونی من رۆمانی (تووڕەبوون و ژاوەژاو)ی (ولیام فۆکنەر) رۆمانێکی زۆر گرنگ بوو. کۆپییەکی چاپی خانەی بڵاوکردنەوەی (پەنگوین)م کڕی. تێگەیشتنی سەخت بوو، بەتایبەت بۆ ئەو ئینگلیزییە لاوازەی من. بەڵام وەرگێرانێکی بێوێنەی ئەم کتێبە بە تورکی هەبوو. لە ئەنجامدا، کۆپییە تورکی و ئینگلیزییەکەم لە تەنیشـت یەکەوە لەسەر مێزەکـەم دامدەناو نیوە پەرەگرافێکم لە یەکیان دەخوێندەوەو دەچوومە لای ئەویتریان. ئەم رۆمانە کاری زۆر تێکردم. ئەوەی لەوە بەجێما دەنگێک بوو کە لە مندا شـێوەی گرت. زۆر زوو دەستم کرد بە نووسین لە زمانی کەسی یەکەمی تاکەوە. زۆربەی کات وەختێ لە بۆتەی کەسێکی تردا رۆدەچم، هەستێکی باشترم هەیە تا وەختێ لە زمانی کەسی سێهەمی تاکەوە دەنووسم.

- وتت چەند ساڵێکی پێچوو تا توانیتان یەکەمین رۆمانتان چاپ بکەن؟

* من لە بیسـت سـاڵیدا لە کۆڕی ئەدەبیدا هاوڕێیەکم نەبوو، ئەندامـی هیچ یەکێ لە گروپە ئەدەبییەکانی ئەستەنبوڵ نەبووم. تەنیا رێگەی چاپی یەکەم کتێبم ئەوەبوو کە بیخەمە پێشبڕکێیەکی ئەدەبییـەوە لە تورکیا بۆ کۆتاییەکی بڵاونەبۆوە. ئەم کارەم کرد و خەڵاتەکەم وەرگرت، کە لە لایەن خانەیەکی بڵاوکردنەوەی گەورەو باوەڕپێکراوەوە دەدرا. ئەوکات، بارودۆخی ئابووری تورکیا خراپبوو. بڵاوکەرەوەکە قبوڵی کرد گرێبەسـتێکم لەگەڵ بکات، بەڵام ئاسـتەنگی بۆ بڵاوکردنەوەی رۆمانەکە دروست دەکرد.

- دووەم رۆمانتان ئاسانتر و خێراتر چاپ بوو؟

* دووەم کتێبم رۆمانێکی سیاسـی بوو. لەو ماوەیەدا کە چاوەڕێی بڵاوبوونەوەی یەکەم رۆمانم بووم، خەریک بووم ئەو رۆمانەم دەنووسـی. نزیکەی دوو سـاڵ و نیو چاوەڕێی چاپی یەکەم رۆمانم

بووم. کتوپڕ شەوێکیان کودەتای سەربازی روویدا. ئەمە ساڵی (١٩٨٠)بوو. بۆ سبەی، بڵاوکەرەوەیەک کە قەراربوو رۆمانی یەکەمم، واتا هەمان رۆمانی جەودەت بەگ و کوڕەکانی، چاپ بکات، وتی نایەوێ چاپی بکات، ســـەرباری ئەوەی کە گرێبەستیشمان هەبوو. تێگەیشتم کە ئەگەر هەمان رۆژ رۆمانی دووەمیشـــم- واتا ئەو رۆمانە سیاســـییە- تەواو بکەم، تا پێنج شەش ساڵی تر ئیمکانی چاپکردنی نابێت، چونکە دەسەڵاتی نیزامی مۆڵەتیان نەدەدا. بە خۆم دەوت: لە بیست و دوو ساڵیدا رامگەیاند کە دەمەوێ ببمە رۆماننووس و حەوت ساڵ نووسیم بەو ئومێدەی شتێک لە تورکیا بڵاوبکەمەوە ... و هیچ شتێ بڵاونەبۆوە. ئێستا نزیکەی سی ساڵم و مەحاڵە بتوانم شتێک بڵاوبکەمەوە. هێشتا مەتنی ئەو رۆمانە سیاسییە ناتەواوە- کە ٢٥٠ لاپەڕەیە- لە چاوی یەکێ لە مێزەکانمدایە.

بێمەودا دوای کودەتای ســـەربازی، لەوێوە کە نەمدەویســـت دارڕێم، دەســـتم کرد بە نووســـینی ســـێهەمین کتێبم کە هەمان رۆمانی (ماڵی بێدەنگی)یە. لە ساڵی(١٩٨٢) کە دواجار یەکەم رۆمانم بڵاوبۆوە، سەرقاڵی نووسینی ئەم رۆمانە بووم. رۆمانی جەودەت بەگ رووبەڕووی پێشوازییەکی باش بۆوە و ماناکەی ئەوەبوو کە دەتوانم ئەو رۆمانەیش چاپ بکەم، کە ئەو کاتە ســـەرقاڵی نووســـینی بووم. بەم شێوەیە کە سێهەمین رۆمانم نووسی، دووەمین رۆمانم بوو کە بڵاودەبۆوە.

– چ شتێک ببووە باعیسی ئەوەی کە رۆمانەکەی تۆ لە دەورانی حکومەتی نیزامیدا قابیلی چاپ نەبێت؟

* کارەکتەرەکانـــی ئەم رۆمانە مارکسیســـتانێکی لاوبوون لە چینـــە باڵاکانی کۆمەڵگە. باوک و دایکانیان دەچوونە هاوینەهاوارەکان و ئەوان لە خانووی خۆش و رازاوەدا دەژیان و مارکسیستبوون بۆ ئەوان ســـەرگەرمی بوو. شـــەڕیان دەکرد، حەسوودییان بە یەکتر دەبرد و پیلانیان دادەنا کە بۆمب فڕێدەنە بەردەم سەرۆک وەزیران.

– مەبەستتان کۆڕی شۆڕشی دەوڵەمەندانە؟

* گەنجانی (های کلاس)چینی باڵا بە خووی خەڵکی دەوڵەمەند کە وایان دەنواند زۆر توندڕەون. من لەم بارەیەوە قەزاوەتی رەوشـــتیم نەدەکرد، بەڵکو بە شێوەیەک ئەم گەنجانەم گرنگ پیشاندەدا. هەمان بیرۆکەی بۆمب فڕێدان بۆ بەردەم سەرۆک وەزیران بەس بوو تا رۆمانەکە یاساغ بێت. ئەوەبوو تەواوم نەکرد. لە لایەکی ترەوە، نووســـەر کاتێ کتێب دەنووسێ، گۆڕانکاری دەکات. ناکرێ دووبارە هەمان کەســـێتی لە خەیاڵیدا دروست بکاتەوە. ناکرێ وەک رابردوو درێژەی بداتێ. هەر کتێبێک کە نووسەر دەینووسێ، پیشاندەری دەورەیەک لە تەواو کۆیی ئەوە. دەتوانی رۆمانەکانی هەر نووسەرێک وەک خاڵـــی وەرچەرخانی کامڵبوونی رۆحی ئەو حســـاب بکەیت. کەواتـــە ناتوانێ بگەڕێتەوە دواوە. وەختێ قابلییەتی فلاشباکی چیرۆک لە ناوچوو، ناتوانی دووبارە دروستی بکەیتەوە.

– کاتێ ســـەرقاڵی ئەزموونکردنی لەگەڵ ئایدیای جیاواز، فۆڕمی رۆمانەکانت چۆن هەڵدەبژێری؟

بە وێنەیەک دەست پێدەکەیت؟ بەیەک  رستەی سەرەتا؟

* فۆرمۆڵەیەکی جێگیر بوونی نییە. بەڵام دەغدەغەی من ئەوەیە کە دوو رۆمان بە شـــێوەیەک نەنووســـم. هەوڵدەدەم هەموو شێک بگۆڕم. بەم دەلیلەیشە کە زۆرێک لە خوێنەرەکانم پێم دەڵێن: ئەم رۆمانەتم پێخۆشـــبوو، حەیف کە ئەوانیتریش بەمجۆرە نانووســـی! یـــا دەڵێن: قەت لەزەتم لە رۆمانەکانت وەرنەدەگرت تا ئەم یەکەیانت نووســـی- بەتایبەت ئەمەم لەمەڕ رۆمانی (کتێبی رەش) بیســـت. راستییەکەی رقم لەم قســـەیەیە. ئەزموونکردن بە فۆرم و شێواز، بە زمان و ئەتمۆسفێر و کارەکتەرەکان و بیرکردنەوە لەمەڕ هەر کتێبێک بە شێوەیەکی جیاواز، هەم سەرگەرمییە، هەم جۆرە تەحەدایەکە. ئەشێ ناوەرۆکی کتێبەکەم لە سەرچاوەی جیاوازەوە بگاتە زەینم. لە رۆمانی (ناوی من سوورە)دا، دەمویست دەربارەی ئارەزووەکانی خۆمەوە بنووسم- ئارەزووی شێوەکاربوون. دەستپێکی کارەکەم هەڵەبوو، دەســـتم کرد بەکتێبێکی نامەئاســـا کە تەوەرەکەی شـــێوەکارێک بوو. دواتر ئەو شـــێوەکارەم گۆڕی بە شـــێوەکاری جیاواز، کە پێکەوە لە گەلەریەکدا کاریان دەکرد. گۆشەی بینین گۆڕا، چونکە ئێســـتا شـــێوەکاری تر دەیانگێڕایەوە. سەرەتا مەبەســـتم بوو لە بارەی شێوەکارێکی هاوچەرخەوە بنووسم، بەڵام دواتر بیرمکردەوە رەنگە ئەم شێوەکارە تورکە زۆر تەقلیدی دەرچێت، زۆر لەژێر کاریگەری خۆرئاوادا بێت. ئەوەبوو کە لە زەماندا گەڕامەوە دواوە تا لەمەڕ مینیاتۆریســـتەکان بنووسم. بەم شێوەیە بوو ناوەرۆکەکەم پەیداکرد.

هەندێـــک ناوەرۆک لە خۆیدا پابەندی تازەگەریەکی دیاریکراو لە فۆرم یا شـــێوەگەلی گێرانەوەی تایبەتـــن. بـــۆ نموونە جارجارێ کە تازە شـــتێکت خوێندۆتەوە یا بینیوتـــە، فیلمێکت بینیوە، یا وتارێکت لە رۆژنامەیەکدا خوێندۆتەوە و بە خۆتان دەڵێیت کە پەتاتەیەک، یا ســـەگێک، یا دارێک ناچاردەکەیت قسە بکات. کە ئایدیاکە گەیشتە زەینتان، دەکەویتە بیری بەردەوامیدانی لە رۆمانداو هەستدەکەیت بێ سێ و دوو تا ئێستا کەس ئەم کارەی نەکردووە.

دوا خاڵ ئەوەی کە من ســـاڵانێک لەمەڕ پرســـەکان بیردەکەمەوە. ئەشـــێ ئایدیا گەلێک بێن بە خەیاڵمدا. لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانمدا قسەیان لە بارەوە دەکەم. بە گشتی دەفتەرێکی یاداشتم هەیە بۆ ئەو رۆمانانەی ئەگەری نووســـینیانم هەیە کە رەنگە زەمانێک بیاننووســـم. جارجارێ شتێک لەم دەفتەرەدا نانووســـم، بەڵام گەر دەفتەرێک بکەمەوە و بکەومە یاداشـــت نووسین، ئەگەری هەیە ئەو رۆمانە بنووســـم. بەمجۆرە، کاتێ خەریکم رۆمانێک تەواو دەکەم، ئەگەری ئەوە هەیە بیروهۆشم لای یەکێ لەم تەرحانە بێت و دوو مانگ دوای ئەوەی رۆمانێکم تەواو کرد، دەســـت دەکەم بە نووســـینی رۆمانێکی تر.

- زۆرێک لە رۆماننووســـان هەرگیز لەبارەی کارێکەوە قســـە ناکەن کە لەبەردەستیاندایە. تۆیش ئەم  بابەتە بە شاراوەیی دەهێڵیتەوە؟

* مـــن هەرگیـــز لەبارەی چیرۆکی رۆمانەکەمەوە قســـە ناکەم. لە بۆنـــە فەرمییەکاندا کاتێ لێم دەپرســـن چی دەنووسیت؟ وەڵامێکی سەرپێیی، یا رســـتەیەکم هەیە: رۆمانێک کە رووداوەکانی لە

تورکیـــای نوێـــدا دەقەومێ. من خوانی دڵم لای چەند نەفەرێک زیاتـــر ئاوەڵاناکەمەوە، ئەویش تەنیا کاتێـــک بزانم زیانێکم پێناگەیەنـــن. لە بارەی فرۆفێڵ و تەکنیکی رۆمانەکانمەوە قســـەیان لەگەڵ دەکەم- بۆ نموونە ئەوەی کە مەبەســـتمە هەورێک ناچار بکەم قسە بکات. حەزدەکەم بزانم خەڵکی چ کاردانەوەیەک بەرامبەر ئەوانە پیشـــان دەدەن. کارێکی منداڵانەیە. کە ئەستەنبوڵم دەنووسی، ئەم کارەم زۆر دەکرد. زەینی من وەک زەینی منداڵێکی عەشـــەقە یاری چکۆلەیە، کە هەوڵدەدات پیشانی باوکی بدات چەند زیرەکە.

– وشەی تەکنیک مانایەکی وێڕایی نەرێنیشی هەیە؟

* نووسەر کارەکەی بە تەکنیک دەست پێدەکات، بەڵام گەر باوەڕی بە بایەخی ئەدەبی و رەوشتی ئەو هەبێت، لە کۆتاییدا ئەم تەکنیکە دەگۆڕێت بە داهێنەری جدی لە ئەدەبدا. دەگۆڕێت بۆ بەیانی ئەدەبی.

– زۆربەی جار رەخنەگرەکان رۆمانەکانی تۆ بە پۆســـت مۆدێرن وەســـف دەکەن. بەڵام بە گومانی من، ئێوە تەکنیکی گێڕانەوەتان زیاتر لە ســـەرچاوە ســـونەتییەکانەوە هەڵدەهێنجن. بۆ نموونە: لە هەزار و یەکشەوەو، زۆرێک لە مەتنە کلاسیکییەکانی ئەدەبیاتی رۆژهەڵاتی نموونە دەهێننەوە.

* ئەم کارە بە کتێبی رەش دەســـتی پێکرد، هەرچەندە پێشـــتر کتێبەکانی بۆرخیس و ئیتالۆ کالڤینۆم خوێندبۆوە. لە ساڵی (١٩٨٥) لەگەڵ هاوسەرەکەم چووین بۆ ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەوێ بۆ یەکەمجار پەیم بە دەوڵەمەندی و فراوانی فەرهەنگی ئەمریکا برد. وەک تورکێکی خەڵکی رۆژهەڵات، کە هەوڵدەدات خۆی لە پایەی نووســـەرێکدا جێگیر بکات، ترسابووم. هەربۆیە گەڕامەوە دواوە، بۆ (رەگەکانم) تێگەیشتم کە دەبێ نەوەکەی من ئەدەبیاتێکی میللی مۆدێرن بخوڵقێنێ.

بۆرخیس و کالڤینۆ منیان ئازاد کرد. مانای ناوەرۆکی ئەدەبیاتی سوونەتی و ئیسلامی لە تورکیا بڕێک کۆنەپەرســـت و بڕێک سیاســـیی بوو و کۆنەپارێزەکان بە چەندەها شـــێوەی کۆن و گەمژانە کەڵکیان لێوەردەگرت کە هەر بیریشم لێنەدەکردەوە بتوانم بەو کەرەستەیە کارێک بکەم.

بەڵام لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێگەیشتم کە دەتوانم بە چوارچێوەی زەینی کالڤینۆیی یا بۆرخیس ئاســـا بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەرچاوانە. ســـەرەتا دەبوو لە نێوان مانای زمنی و ئایینزایی و ئەدەبـــی ئەدەبیاتـــی ئیســـلامی جیاوازییەکی دیاریکـــراو بدۆزمەوە تا بتوانم بە ئاســـانی بەهرە لـــە دەوڵەمەندی یارییەکان، فێڵـــەکان و حیکایەتەکانی وەربگرم. تورکیا ســـوونەتێکی ئاڵۆزی لە ئەدەبیاتێکی زۆر پاڵاوتەو رازاوەی هەیە. بەڵام نووسەرانێک کە باوەڕیان بە پەیماننامەی کۆمەڵایەتی هەیە، ئەدەبیاتی ئێمەیان لە ناوەرۆکی خەلاقییەت خاڵی کردەوە.

نەقڵی زۆر هەیە کە لە جۆرەها سوونەتی زارەکی چیرۆک بێژی- لە چین و هیندستان و ئێران- دووبـــارە دەبێتەوە. بڕیارمدا کەڵک لەوانە وەربگرم شـــوێنیان لە ئەســـتەنبوڵی تازەدا بۆ بکەمەوە. ئـــەم کارە ئەزموونێکە- وەک ئەوەی هەموو شـــتێک وەک پارچەی کاغەزی (کـــۆلاژ)ی دادایییەکان لە

تەنیشت یەکەوە دابنێین، کتێبی ڕەش ئەم تایبەتمەندییەی هەیە. جارجارێ هەموو ئەم سەرچاوانە پێکەوە پەیوەندی چێدەکەن و شتێکی نوێ دێننە بوون. بەم شێوەیە، شوێنی هەموو ئەم چیرۆکە پاکنووسکراوانەم لە ئەستەنبوڵ دانا، یەک تەرحی چیرۆکێکی زانیاری بەخشم بۆ زیادکرد و کتێبی ڕەش لەدایـــک بوو. بەڵام ســـەچاوەی ئەوە هێزی لێوڕێژی فەرهەنگـــی ئەمریکایی و مەیلی من بوو بۆ ئەوەی نووســـەرێکی جدی ئەزموونگەرابم. نەمدەتوانی لە بارەی گرفتەکانی تورکیاوە شـــیکاری کۆمەڵایەتـــی بنووســـم- ئەو گرفتانە دەیانترســـاندم. لە ئەنجامدا، دەبوو هەوڵـــم بدایە کارێکی تر بکەم.

– قەت حەزت لە شیکاری کۆمەڵایەتی نەبووە لە ڕێگەی ئەدەبیاتەوە؟

* نا. کاری من، بە تایبەت لە دەیەی هەشتاکاندا، کاردانەوەیەک بوو بەرامبەر کاری ڕۆماننووسەکانی نەوەی پێشوو. وێڕای ڕێزی زۆرم بۆیان، دەبێ بڵێم کە ناوەرۆکی ڕۆمانەکانیان زۆر لاواز و سنووردار بوو.

– ڕێگە بدە بگەڕێینەوە بۆ بەر لە (کتێبی ڕەش.) چ شتێک سروش بەخشی تۆ بوو وە باعیسی ئەوەبوو قەڵای سپی بنووسی؟ لەم کتێبەدا، بۆ یەکەمین جار سوود لە ناوەرۆکێک وەردەگریت کە لە زۆرینەی ڕۆمانەکانتدا دووبارە دەبێتەوە. ســـاختەکاری لە ناسنامەدا. هەستناکەیت ئەم بیرۆکەیە: کە ببیتە کەسێکی تر بۆچی زۆرجار لە ڕۆمانەکانتدا دەردەکەوێت؟

* ئەم پرسە زۆر تایبەتە. برایەکم هەیە زۆر ئەهلی کێبڕکێ و ڕکەبەرایەتییەو تەنها هەژدە مانگ لـــە من گەورەترە. ئەو بەجۆرێک لە جۆرەکان باوکی من بوو- بە گوزارشـــتێکی تر، باوکی فرۆیدیم بوو. ئەو بوو کە گۆڕا بۆ کەســـێتی شـــاراوەی من و نوێنەری هێز. لە لایەکی ترەوە، هاوڕێیەتییەکی جمـــک بە ڕکەبەرایەتـــی و برایانەمان هەبوو. پەیوەندییەکی زۆر ئاڵـــۆزو پێچاوپێچ بوو. لە ڕۆمانی ئەســـتەنبوڵدا زۆر بە تێروتەســـەلی لەمەڕ ئەم پرسەم نووســـیوە. من کوڕێکی مناڵکارەی تورکی ئاســـایی بووم، باش فتبۆڵێنم دەکرد و حەزم لە جۆرەها یاری و پێشـــبڕکێ بوو. ئەو لە قوتابخانە زۆر ســـەرکەوتوو بوو و لە من باشـــتر بوو. من ئیرەییم بەو دەبرد و ئەویش بە من. ئەو بەرپرس و لۆژیکی تر بوو، پرسی قسە لەگەڵ گەورەکانمان بەدەست ئەو بوو. کاتێ من سەرگەرمی یاری بووم ئەو هەست و نەستی لای یاسا و ڕێساکان بوو. هەمیشە لە حاڵی ڕکەبەریدا بووین. من حەزم دەکرد ئەو بم و لەم جۆرە شـــتانە. ئەم پرسە مۆدێلێکی دروستکرد. چاودێری و حەسوودی- ئەمانە بۆ من ناوەرۆکێکی ڕاستگۆیانەن. هەردەم نیگەرانی ئەوەم کە هێز یا سەرکەوتنی براکەم چەندە کاریگەری لەسەر من داناوە. ئەمە بەشێکی گرنگە لە ڕۆحییەتی من. بە ئاگام لەم پرسە، هەر لەبەر ئەمەیشە لە نێوان خۆم و ئەو هەســـتانەدا مەودا دادەنێم. دەزانم خراپن، هەربۆیە بە ورەو ویســـتی مرۆڤێکی شارستانییەوە زۆرانبازییان لەگەڵدا دەکەم. ناڵێم قوربانی حەسوودیم. بەڵام هەمووکاتێ هەوڵدەدەم لەگەڵ ئەم خەموخەفەتەدا پرســـی تووڕەبوون بخەمە لاوە. دواجاریش ئەم پرســـە دەبێتە ناوەرۆکی

هەموو رۆمانەکانم. بۆ نموونە پەیوەندی زۆروکەمی ســادومازۆخێتی دوو کارەکتەری ســەرەکی لە رۆمانی (قەڵای سپی)دا بەرمەبنای پەیوەندی منە لەگەڵ براکەمدا.

لــە لایەکی تــرەوە، ئەم ناوەرۆکی ســاختەکارییە لــە زیانگەیاندن بە شناســی تورکیا، کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ فەرهەنگی خۆرئاوایی پەرچەکردار دروســت دەکات. دوای نووســینی قەڵای ســپی، تێگەیشتم کە ئەم حەســوودییە- ئەم نیگەرانییە، لە بارەی کاریگەر بوون بە کەسێکی تر- هاوشێوەی پێگەی تورکیایە وەختێ کە خۆرئاوای کردۆتە مۆدێلی خۆی. لەلایەک حەزدەکەیت ببێتە خۆرئاوایی، لە لایەکی تریشــەوە بەوە تۆمەتبار دەکرێیت ئەگەر بە ئەندازەی پێویست رەسەنایەتیت نەبێت. لە لایەک هەوڵدان بۆ دەســت پەیدا کردن بۆ حاڵوباری ئەوروپا و لە لایەکی تریش هەســتی گوناهە بە هۆی لاســاییەوە. هەورازونشــێوی ئەم بارودۆخە هاوشــێوەی پەیوەنــدی براگەلێکە کە رکەبەرایەتی یەکتری دەکەن.

- هەســتەکەیت دواجار رووبەڕووبوونەوەی هەمیشەیی مەیلی خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتی لە تورکیا سەرئەنجام بە شێوەیەکی ئاشتیانە کۆتایی بێت؟

* من کەســێکی گەشــبینم. نابێت تورکیا نیگەرانی هەبوونی دوو رۆح بێت لە دوو فەرهەنگی جیاوازدا، نیگەرانی هەبوونی دوو سروشــت بێت. شیزۆفرینیای هۆش بەهێز دەکات. هەڵبەتە ئەشێ پەیوەندیتان لەگەڵ واقعیەت لە دەســت بدەیت. من رۆماننووســم، هەربۆیە وایدابینم ئەم پرســە هێندەیــش خراپ بێت- نابێ تۆش نیگەرانی ئەم شــیزۆفرینیایە بیت. گــەر زۆریش نیگەران بیت کە نەبادا بەشــێکی جەســتەتان بەشــەکەیتر لەناوبەرێت، رۆحێک زیاترتان بۆ نامێنێتەوە. ئەمە لەوە خراپترە موبتەلای خودی ئەم نەخۆشــییە ببیت. گریمانەکەی من ئەمەیە. هەوڵدەدەم ئەوە لە سیاســەتی تورکیادا بڵاوبکەمەوە، لە نێوان سیاســەتمەدارانی تورکیا کە مەیلیان بۆ خۆرهەڵات یا خۆرئاوا هەیە یا میللیگەران. من رەخنەم لەم روانینە یەکبوون گەرایە هەیە.

- ئەم پرسە لە تورکیا بە چ شێوەیەکە؟

* چەندێــک ئایدیای تورکیای لیبراڵ و دیموکراتیــک زیاتر جێی خۆی دەکاتەوە، تەرزی فکری منیــش زیاتــر قبوڵ دەکرێــت. تەنیا بەم روانینــەوە تورکیا دەتوانێ پەیوەســت بێت بە یەکێتی ئەوروپاوە. ئەمە رەوشــێکە بۆ زۆران لەگەڵ میللی گەرایی، بۆ زۆران لەگەڵ ئەفســانەی ئەمریکا لە دژی ئەوان.

- بەهەرحاڵ، لە رۆمانی ئەســتەنبوڵدا جۆرێک دەزوو بۆ خەیاڵ شــلدەکەیت، کە وەک بڵێی لە خەمی لەدەستچوونی ئیمپراتۆری عوسمانیدا پرسە داریت.

* من بۆ لەدەســتدانی ئیمپراتۆری عوســمانی پرســەدارنیم. من لایەنگــری خۆرئاوایی بوونم. خۆشــحاڵم کە هۆگرێتی بۆ خۆرئــاوا روویدا. رەخنەی من زیاتر لــە لێکدانەوەیەکی دیاریکراوە کە

نوخبەی حوکمڕانان- واتا هەم بیرۆکراسی و هەم تازە دەوڵەمەندان- بۆ خۆرئاوایی بوون هەیانە. ئەوان باوەڕبەخۆبوونی پێویستیان نییە بۆ خەڵقکردنی فەرهەنگێکی میللی دەوڵەمەند بە دروشم و نیشانەی تایبەتی خۆی. هەوڵیان نەداوە فەرهەنگێکی ئەستەنبوڵی دروست بکەن کە پێکهاتەیەکی گونجاو بێت بۆ خۆرهەڵات و خۆرئاوا، تەنیا ڕەگەزە خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتییەکەیان لە تەنیشت یەکترەوە داناوە. هەڵبەت فەرهەنگی دەوڵەمەند و بەهێزی عوسمانی بوونی هەیە، بەڵام وردە وردە کاڵ دەبێتەوە. کارێک کە دەبوو ئەوان بیانکردایە و ڕەنگیشە دەروەستی نەهاتنایە، خەڵقکردنی فەرهەنگێکی بەهێز بوو کە پێکهاتەیەکی- نەک تەقلیدی- لە رابردووی خۆرهەڵاتی و ئێستای خۆرئاوایی بێت. من هەوڵدەدەم وەها کارێک لە کتێبەکانمدا ئەنجام بدەم. ڕەنگە وەچەکانی دواتر ئەم کارە نەکەن و چوونە ناو یەکێتی ئەورووپاوە ناسنامەی تورک لەناونابات، بەڵکو دەیکاتەوەو ئازادی و متمانە بەخۆبوونێکی زیاتریش دەدات بە بە خەڵقکردنی فەرهەنگێکی تازەی تورک. لاساییکردنەوەی کوێرانە لە خۆرئاوا یا لاسایی کوێرانە لە فەرهەنگی کۆنەو مردووی عوسمانی ڕێگەچارە نییە. دەبێ کەڵک لەو فەرهەنگانە وەرگرین و نیگەرانی وابەستەیی زیاد لەڕادە بەیەکێ لەوانەوە نەبین.

- بەڵام ئێوە لە ڕۆمانی ئەستەنبوڵدا بە راستی بە نیگای دەرەکی، نیگای خۆرئاوایی، هۆگریتان بۆ شارەکەی خۆتان هەیە.

* بەڵام لە ناوەرۆکدا ڕوونیدەکەمەوە کە بۆچی ڕۆشنبیرێکی خۆرئاوایی بوو مەیلی بۆ ڕوانینی خۆرئاوایی هەیە- سمبوڵی پێشڤەچوونی ئەستەنبوڵ ڕەفتاری مەیلە بۆ خۆرئاوا. هەمیشە ئەم دووانەییە بوونی هەیە، بە ئاسانی دەتوانی لەگەڵ توورەیی خۆرهەڵاتیدا هەست بە نزیکی بکەیت. هەموو مرۆڤەکان تاوێ خۆرئاوایین و تاوێ خۆرهەڵاتی- هەمیشە پێکهاتەیەکن لەو دووە. من زۆرم حەز لە ئایدیای ڕۆژهەڵاتی (ئیدوارد سەعید)ە، بەڵام هەرگیز تورکیا کۆڵۆنی نەبووەو لەبەر ئەمەیشە خەیاڵپڵاوی لە بارەی تورکیاوە هەرگیز بۆ تورکەکان گرفت نەبووە. خۆرئاوا بە هەمان ئەو شێوەیەی سووکایەتی بە عەرەب یا هیند کردووە بە تورکی نەکردووە. ئەستەنبوڵ دوو ساڵ زیاتر ژێردەستەنەبوو، کەشتییەکانی دوژمن لەم شارەدا نەمانەوە. هەربۆیە، ئەم پرسە زامێکی قووڵی بەسەر ڕۆحی ئەم میللەتەوە جێنەهێشتووە. شتێک کە زامێکی قووڵی جێهێشتووە، لە ناوچوونی ئیمپراتۆری عوسمانی بوو. کەواتە من ئەم نیگەرانییەم نییە و هەستناکەم کە خۆرئاواییەکان بە چاوێکی سووک لێم دەڕوانن. هەرچەند لە تورکیا دوای دامەزراندنی کۆمار، جۆرە بارودۆخێکی ترسناک بوونی هەبوو، چونکە تورکەکان دەیانویست خۆرئاوایی بن، بەڵام نەیانتوانی بە ئەندازەی پێویست بڕۆنە پێش. ئەم پرسە بووە هۆی هەستی ژێردەستی فەرهەنگی کە دەبێ وریای بیت و ئەشێ جارجارێ منیش وەها هەستێکم هەبێت.

لە لایەکی ترەوە، ئەم زامانە بە ئەندازەی زامی میللەتانی تر، کە دووسەد ساڵ ژێردەستەی داگیرکەر و کۆڵۆنی بوون، قووڵ نییە. هێزە خۆرئاواییەکان هەرگیز تورکەکانیان سەرکوت نەکردووە. سەرکوتکردنی تورکەکان بە دەستی خۆیان ئەنجام درابوو، ئێمە مێژووی خۆمان پاککردەوە بەو

دەلیلەی کە واقعی بوو. لەم سەرکوتکردنەدا، جۆرە ئازار قبوڵکردنێک هەیە. بەڵام ئەو خۆرئاواییی بوونە خۆویستە گۆشەگیریشی بەدواوەیە. هێندییەکان لەگەڵ فەرمانڕەوا زاڵمەکانی خۆیان رووبەڕووبوون. تورکەکان بە شێوەیەکی سەیر لە دنیای خۆرئاوا جیابوون، کە لاساییدەکەنەوە. لە دەیەی پەنجاکاندا و تەنانەت لەدەیەی شەستەکانیشدا وەختێ بیانییەک (ئەوروپییەک) لە ئوتێل هێڵتۆنی ئەستەنبوڵ دەمایەوە، هەموو رۆژنامەکان ئاماژەیان پێدەکرد.

– بە بڕوای تۆ، گەنجینەیەکی میراتی رەسەن و نەمر بوونی هەیە یا ئەسڵەن دەبێ بوونی هەبێت؟ ئێمە ئاگامان لە میراتی رەسەن و نەمری خۆرئاوایی هەیە، بەڵام میراتی ناخۆرئاوایی چی؟

* بەڵێ، کۆمەڵێک رەسەن و نەمری تریش هەن. دەبێ بیاندۆزینەوە و پەرەیان پێبدەین، لەگەڵ ئەوانی تر قسەیان لە بارەوە بکەین رەخنەیان لێبگرین و دواتر قبوڵیان بکەین. میرات بە دەستەواژەی رەسەن و نەمری خۆرهەڵاتی لە ئێستادا بارودۆخێکی زۆر ناخۆشیان هەیە. تێکستی بەرز لە هەموو جێیەک هەیە، بەڵام ویســـتێک بۆ گردکردنەوەیان بوونی نییە. لە ئەدەبیاتی دێرینی فارسەوە بیگرە تا هەموو تێکستە هیندی و چینی و ژاپۆنییەکان- دەبێ ئەم تێکستانە بە روانینێکی رەخنەگرانەوە هەڵسەنگێنرێن. بەڕاستی گەنجینەی میراتی رەسەن و نەمر لە دەستی ئوستازە خۆرئاواییەکاندایە. ریشەی دابەشکردنی و پەیوەندی ئەوێیە.

– رۆمـــان بۆتەیەکـــی فەرهەنگی زۆر خۆرئاواییـــە. ئایا لە ئەدەبیاتـــی خۆرهەڵاتیدا جێگایەکی هەیە؟

* رۆمانی مۆدێرن پەیوەندی بە فۆڕمی حەماسییەوە نییە، لە بنەماوە بۆتەیەکی ناخۆرهەڵاتییە. چونکە رۆماننووس کە پەیوەندی بە کۆمەڵگەوە نییە، لە مەیلە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگەدا بەشـــدار نییـــە و فەرهەنگێک کە بیری پێدەکاتەوەو حوکمی پێدەکات لەگـــەڵ فەرهەنگی کۆمەڵگەکەی ئەو جیاوازی هەیە. کاتێ خودئاگایی ئەو لەگەڵ خودئاگایی کۆمەڵگەیەک کە پێیەوە پەیوەســـتە جیاواز بێت، بێگانەیە، گۆشەگیرە. هەروەها دەوڵەمەندی تێکستەکانی ئەو بەهۆی روانینی تەماشاگەرانەی ئەمەوە بێگانەیە.

وەختێ بێکەیتە خوو بەم شێوەیە سەیری دنیا بکەیت و بەمجۆرە لە بارەیەوە بنووسی، ئارەزووی ئەوە دەکەیت لە کۆمەڵگە جیا بیت. ئەمە مۆدێلێکە لە کاتی نووسینی رۆمانی (بەفر)دا لەزەینمدا هەبووە.

– بەفر سیاسیی ترین رۆمانێکە کە تا ئێستا تۆ نووسیبێتت، چۆن بوو کەوتییە بیری نووسینی وەها رۆمانێک؟

* لە ناوەڕاستی دەیەی نەوەدەکان کە وردە وردە خەریکبوو ناوبانگم پەیدا دەکرد، جەنگ دژی پارتیزانە کوردەکان تووند ببوو و نووســـەرە چەپگەرا کۆنـــەکان و لیبراڵە مۆدێرنە تازەکان داوایان

لێدەکــردم کۆمەکیـان بکەم، داواکارییەکانیان بۆ واژۆ بکــەم- وردە وردە چاوەڕوانیان هەبوو کاری سیاسیی ئەنجام بدەم، کە پەیوەندی بەکتێبەکانمەوە نەبوو.

حکومەت زۆر زوو دەستەوداوێنی تیرۆری کەسی بوو دەستی بە هەڵمەتێکی فراوان کرد. کەوتنە تۆمەت هەڵبەســتن بۆ من. دەهری ببووم. دوای ماوەیەک، بە خۆم وت چۆنە رۆمانێکی سیاســیی بنووســم و تەنگژەکانی رۆحی خۆم لەوێدا بپشــکن- ئەوەی کە وابەســتەم بە خێزانێک لە چینی ناوەندی بالاو بەرامبەر کەســانێک کە کرانەوەی سیاســییان نییە هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەم؟ باوەڕم بە هونەری رۆمان هەبوو. سەیرە ئەم باوەڕە مرۆڤ نامۆ دەکات. ئەوەبوو بڕیارم دا رۆمانێکی سیاسیی بنووسم. هەر کە رۆمانی (من ناوم سوور)م تەواوکرد، خۆم بە نووسینی رۆمانی (بەفر)ەوە سەرقاڵ کرد.

- بۆچی شاری چکۆلەی (قارس)ت بۆ شوێنی رووداوەکانی ئەم رۆمانە هەڵبژارد؟

* ئاشکرایە کە شاری قارس یەکێک لە ساردترین و هەژارترین شارەکانی تورکیایە. لە سەرەتای دەیەی هەشتاکاندا، سەرتاسەری پەڕەی یەکەمی یەکێ لە رۆژنامە گرنگەکان لەمەڕ هەژارییەوە بوو لە شــاری قارس. کەسێک حســابی کردبوو کە دەکرێ هەموو شارەکە بە نزیکەی یەک ملیۆن دۆلار بکڕی. وەختێ کە دەمویســت بچم بۆ ئەوێ، بارودۆخی سیاسیی شێوابوو. دانیشتوانی دەوروبەری شــاری قارس زۆرینەی کوردە، بەڵام ئاپۆرای بەشــەکانی ناوەندی شــارەکە پێکهاتەیەکە لە کورد، ئازەر، تورک و خەڵکی جۆراوجۆری تر. پێشتر رووس و ئەڵمانیش لەم شارە هەبوون. لە شاری قارس جیاوازی ئایینزاییش بوونی هەیە، شــیعەو ســووننە. جەنگێک کە حکومەتی تورک دژی پارتیزانە کــوردەکان بەرپێیخســتبوو، وەها توند ببوو کــە مەحاڵ بوو بکرێ وەک گەشــتیار بچیتە ئەوێ. دەمزانی کە ناتوانم وەک رۆماننووس بچم بۆ ئەو شــارە، هەربۆیە داوای مۆڵەتێکی بەســەرکردنەوەم لە سەرنووســەری رۆژنامەیەک کرد بۆ ناوچەکە کە ئاشــنام بوو. ئەو مرۆڤێکی بەدەسەڵاتەو خودی خۆی تەلەفۆنی بۆ ســەرۆکی شارەوانی و بەڕێوەبەری پۆلیس کرد تا ئاگادارییان بکاتەوە لەوەی کە من خەریکم بەرەو شاری قارس دێم.

هەر کە گەیشــتمە شارەکە، چوومە سەردانی سەرۆکی شــارەوانی و تەوقەم لەگەڵ بەڕێوەبەری پۆلیس کرد و رێککەوتین کە لەســەر شــەقامەکان دەســتگیرم نەکەن. راســتییەکەی ئەمەیە کە چەند پۆلیســێک کە هەواڵیان نەبوو من لەوێم، گرتیانم و بردیانم، رەنگە نیازی ئەشکەنجەدانمیان هەبووبێت. بێمەودا ناوی خەڵکی گرنگم دەهێنا- من ســەرۆکی شــارەوانی دەناســم، بەڕێوەبەری پۆلیــس هاوڕێمە... بە کورتی، مرۆڤێکی جێ گومان بووم. تورکیا بە رواڵەت وڵاتێکی ئازادە، بەڵام بە تەقریبی تا ساڵی(١٩٩٩) هەموو بیانییەکان جێگەی گومان بوون. خۆشبەختانە ئێستا کارەکان وردە وردە ئاسانتر دەبن.

زۆربەی مرۆڤ و شــوێنەکانی ئەم رۆمانەی من رەگێکی واقعییان هەیە. بۆ نموونە ئەو رۆژنامە لۆکاڵییەی کە تیراژەکەی ٢٥٢ دانەیە، راستەقینەیە. من بە کامێرایەکی فۆتۆ و کامێرایەکی ڤیدیۆییەوە

بەرەو قارس چووم. وێنەی هەموو شـتێکم دەگرت و دواتر دەگەڕامەوە ئەسـتەنبوڵ و ئەو فیلمانەم بۆ هاوڕێکانم نمایش دەکرد. هەموو وا بیریان دەکردەوە هاوسـەنگی عەقڵم لەدەسـتداوە. هەندێک ڕووداویش هەبوون بەڕاسـتی ڕوویاندا. وەک گفتوگۆ لەگەڵ سەرنووسـەری ئەو ڕۆژنامە بچووکە کە لە ڕۆمانەکەدا باسـی کراوەو بە کا دەڵێت: کە ڕۆژی پێشـوو چی کردووە و کاش لەو دەپرسـێت لەکوێـوە دەزانێ و ئەو ددان بەوەدا دەنێت کە گوێی لە بێ سـیمی پۆلیس گرتووەو هەموو ماوەکە کا لەژێر چاودێری پۆلیسـدا بووە. ئەم پرسە راسـتەقینەیە. چاودێری منیشیان دەکرد. بەرپرسی هەواڵی ناوخۆ منی بردە پشـت کامێرای تیڤییەکەوەو وتی: نووسەرە بەناوبانگەکەی ئێمە سەرقاڵی نووسـینی وتارێکە بۆ ڕۆژنامەی سەرتاسـەری وڵات- ئەم پرسـە گرنگی زۆری هەبوو. هەڵبژاردنی شارەوانییەکان زۆر نزیک بوو و لەبەرئەمەیش خەڵکی قارس دەرگای ماڵەکانیان بە ڕوومدا کردەوە. هەموو دەیانویسـت شتێک بە ڕۆژنامەی سەرتاسـەری بڵێن و حکومەت لە هەژاری خۆیان ئاگادار بکەنـەوە. نەیاندەزانی من خەیاڵێکی وام هەیە کە بیانکەمە بابەتـی ڕۆمانێک. وایان بیردەکردەوە دەمـەوێ لـە وتارێکدا ئاماژە بە قسـەکانیان بکەم. دەبێـت ددان بەوەدا بنێم کە ئـەم کارەم لە ڕوویەکەوە خۆپەرستی و زاڵمانە بوو.

گەرچی بەڕاستیش خەیاڵێکی وام هەبوو وتارێکیش لەم بارەیەوە بنووسم.

چوار سـاڵ تێپەڕی. بەردەوام من دەچوومە قارس و دەگەڕامەوە. کافێیەکی بچووک لەو شـارەدا هەبوو کە جارجارێ لەوێ شـتم دەنووسی و یاداشـتم دەکرد. هاوڕێیەکی وێنەگرم هەبوو و داوەتم کردبـوو لەگەڵمـدا بێت، چونکە قارس لە کاتـی بەفر باریندا زۆر جوانە. ئـەم هاوڕێیەم، هەر بە ڕێکەوت، گفتوگۆیەکی لەو کافێ بچووکە بیسـتبوو. کاتێ من یاداشـتم دەنووسی، خەڵکی پێکەوە قسـەیان دەکرد. دەیانوت ئیتر ئەمە چ وتارێکە؟ سێ سـاڵ تێپەڕی، دەیتوانی لەم ماوەیەدا ڕۆمان بنووسێ. بۆنیانکردبوو کە خەریکی چیم.

- ئەم ڕۆمانە ڕووبەڕووی چ کاردانەوەیەک بوو؟

* لە تورکیا، هەم کۆنسێرڤاتیڤەکان- واتا هەمان ئیسلامگەرا سیاسییەکان- بێتاقەت بوون هەم نامەزهەبییـەکان. نەک تا ئەو رادەیەی کە کتێبەکە یاسـاغ بکەن یا ئازارێک بە من بگەیەنن. بەڵام بێتاقەت بوون و لەم بارەیەوە لە ڕۆژنامە سەرتاسـەرییەکاندا وتاریان نووسی. نامەزهەبییەکان بەو دەلیلە بێتاقەت بوون کە من نووسـیبووم نرخێک کە کەسـێکی نامەزهەبی توندڕەو دەبێ بیدات، ئەوەیـە کە بیـری دەچێتەوە کە دەبێ دیموکراتیش بێت. سـەرچاوەی هێزی لایکـەکان لەتورکیا سـوپایە. ئەم پرسـەیش دیموکراتی تورکیا و فەرهەنگی تۆلێرانس لەناودەبات. کاتێ تا ئەو ڕادەیە سـوپا دەسـت وەرداتە فەرهەنگی سیاسـییەوە، خەڵکی متمانە بەخۆبوونیان لەدەسـت دەدەن و بۆ چارەسـەری هەموو کێشـەو گرفتەکانی خۆیان پشـت بە سوپا دەبەسـتن. دەڵێن: بارودۆخی مەملەکەت و ئابووری زۆر بێمانایە، واچاکە داوا لە سوپا بکەین ڕێکی بخاتەوە. بەڵام نیزامییەکان، لە کاتی ڕێکخسـتنەوەدا، فەرهەنگی تۆلێرانسیشـیان لەبەین برد. ژمارەیەکی زۆر لە گومانلێکراوان

ئەشکەنجەدران، سەد هەزار کەسێک کەوتنە زیندانەوە. ئەمەیش پرسەکە بۆ کودەتایەکی تازە ئامادە دەکات. نزیکـــەی هەر دەســـاڵ جارێک کودەتایەکی تازە روویداوە. هەر بـــەم دەلیلەیش رەخنەم لە لایکەکان گرتبوو. لە خۆیدا، حەزیان بەوە نەبوو کە ئیسلامگەراکانم وەک مرۆڤ وێناکردبوو.

ئیسلامگەرا سیاسییەکانیش لەوە بێتاقەت بوون کە من ئاماژەم بۆ کەسێکی ئیسلامگەراکردبوو کە بەر لە پرۆسەی هاوسەرگیری پەیوەندی سێکسی هەبوو. دەلیلەکەی وەها پرسێکی بێبایەخ بوو. هەمیشە ئیسلامگەراکان گومانیان لێمە چونکە وابەستەنیم بە فەرهەنگی ئەوانەوەو زمان و شێوازی بیرکردنەوەو تەنانەت رەفتاریشـــم لە مرۆڤێکی نامۆ و خۆشگوزەران دەچێت. ئەوانیش گرفتی خۆیان لە بواری نواندندا هەیە. دەپرســـن، ئەســـڵەن ئەو چۆن دەتوانێ لەبارەی ئێمەوە بنووسێت؟ ئەو کە هیچ شتێ لەبارەی ئێمەوە نازانێ. ئەم بابەتەم لە بەشەکانی رۆمانەکەدا باسکردووە.

بـــەڵام نامەوێ ددانی پێدابنێم. من بە ســـەلامەتی دەرچووم. هەمـــووان رۆمانەکەیان خوێندەوە. رەنگە تووڕەش بووبن، بەڵام ئەمە لە نیشـــانەکانی پێگەیشـــتنی شـــێوازی بیرکردنەوەی لیبراڵییە کە من و کتێبەکەمیان بەم شـــێوەیە قبوڵکرد. کاردانەوەی خەڵکی قارسیش جیاوازبوو. هەندێکیان دەیانوت: بەڵێ بارودۆخەکە بەمجۆرەیە. زۆرینەیش، ئاشکرایە میللیگەراکانی تورک، لە ئاماژەی من بۆ ئەرمەنەکان بێتاقەت بوون. بۆ نموونە: ئەو بەرپرسی هەواڵەی تەلەفزیۆن کتێبەکەمی خستبووە کیســـەیەکی رەشـــی نیشانەییەوەو بۆی پۆســـت کردم و لە کۆنفرانســـێکی چاپەمەنیدا وتی کە من ریکلامـــم بۆ ئەرمەنەکان کردووە- کە هەڵبەت قســـەی قۆڕە. ئێمە وەها فەرهەنگێکی میللی کوێر و بەرچاوتەنگمان هەیە.

– رۆمانی بەفر زۆر نائومێدکەر و رەشـــبینانەیە. تاقە کەســـێک کە لە سەرتاســـەری رۆمانەکەدا دەتوانێ گوێ لە قسەی هەمووان بگرێت- واتا کا- لە دواجاردا دەبێتە جێگە نەفرەتی هەمووان.

* رەنگە من لەم رۆمانەدا پێگەی خۆمم وەک رۆماننووسێک لە تورکیا نمایش کردبێت. کا دەزانێ دەکەوێتە بەر نەفرەت، بەڵام حەزدەکات لەگەڵ هەمووان قسە بکات. ئارەزووش بۆ مانەوە لەودا زۆر بەهێزە. کا بەو دەلیلە بەر نەفرەت دەکەوێت کە بە ســـیخوڕی خۆرئاوای دەزانن، ئەمەیش شـــتێکە زۆرجار دەربارەی منیش وتویانە.

منیـــش هاوڕام لەگەڵ تۆدا کە رۆمانەکە نائومێدکەرە. بـــەڵام تەنز رێگەی هەڵاتنە. کاتێ خەڵک پێمدەڵێـــن ئەم کتێبە نائومێدکەرە، دەپرســـم بە بۆچوونی ئێوە پێکەنیناوی نییە؟ واهەســـتەکەم تەنزێکی زۆری تێدایە. لانیکەم من وەها قەسدێکم هەبووە.

– دەربەست بوونی ئێوە بە چیرۆکەکانتانەوە، دەردەسەری بۆ سازکردوون. ئەگەری ئەوەیش هەیە دیسان دەردەسەریتان بۆ ساز بکات و زۆر پەیوەندی سۆزداری تر ببڕێت. ئەمە بەهایەکی زۆرە.

* راســـتە. بەڵام ئەم پەیماننامەیە شـــتێکی زۆر باشـــە. کاتێ لە ســـەفەردام و تەنیا لە پشت مێزەکەمەوە دانەنیشتووم، دوای ماوەیەک وەڕز دەبم. کاتێ لە ژوورێکدا تەنیام و سەرقاڵی داهێنانم،

خۆشـــحاڵم. ئەم پرســـە زیاتر لەوەی کە پەیماننامە بەرامبەر هونەر یا پیشەیەک بێت کە عاشقیم، پەیماننامە بۆ تەنیا بوون لە ژوورێکدایە. من هەمیشـــە ڕەچاوی ئەم ڕەوشـــە دەکەم، لەو باوەڕەدام کارێک کە ئێســـتا ئەنجامی دەدەم، ڕۆژێک چاپدەکرێت و خەیاڵەکانم ئاراستە دەکات. من پێویستم بەوەیە چەندین کاتژمێر لەگەڵ برێک کاغەزی باش و قەڵەم جافێکدا لە پشـــت مێزێکەوە دابنیشم، وەک هەندێک کە بۆ پاراستنی سەلامەتییان پێویستیان بە حەبە. من پابەندی ئەم ڕەوشەم.

– ئەی بۆ کێ دەنووسی؟

* هەرچەندێک تەمەنی نووسەر هەڵکشێ، زیاتر ئەم پرسیارە لە خۆی دەکات. من حەوت ڕۆمانم نووسیوە. حەزدەکەم بەر لە مردن حەوتی تریش بنووسم. بەڵام لە سەرێکەوە ژیانیش کورتە. چۆنە زیاتر لەزەتی لێوەربگرین؟ بەڕاســـتی هەندێکجار ناچارم بە زۆر ئەم کارە بکەم. بۆچی دەنووســـم؟ مانای هەموو ئەمانە چییە؟ یەکەم: هەمان شـــێوە کە وتم، حەزێکە بۆ ئەوەی لە ژوورێکدا تەنیابم. ڕوویەکـــی ئەهلی کێبرکێ و زۆروکـــەم منداڵانە هەیە کە دەیەوێ هەوڵبدات و دیســـان ڕۆمانی باش بنووســـێت. ڕۆژ بە ڕۆژ باوەڕی من بە نەمری نووســـەران کەمتر دەبێت. ئێمە ژمارەیەکی زۆر کەمی ئەو کتێبانە دەخوێنینەوە کە دووســـەد ســـاڵ لەمەوبەر نووســـراون. دووسەد ساڵی تر، ڕەنگە پێنج دانە لەو کتێبانەی ئەمڕۆ نووسراون بخوێنرێنەوە. ئایا من دڵنیام کە سەرقاڵی نووسینی یەکێ لەو پێنج کتێبەم؟ بەڵام ئایا مانای نووســـین ئەمەیە؟ بۆچی دەبێ نیگەرانی ئەوەبم کە دووســـەد ساڵی تر کتێبەکانم دەخوێننەوە یاخود نا؟ نابێ زیاتر نیگەرانی ژیان بم؟ ئایا پێویســـتم بەو دڵخۆشـــییە هەیە کە لە ئایندەدا کتێبەکانم دەخوێندرێنەوە؟ من بیر لە هەموو ئەم شـــتانە دەکەمەوەو دیســـان دەنووســـم. نازانم بۆ، بەڵام هەرگیز خۆم نادەم بە دەستەوە. تەنیا دڵخۆشی ئێمە بۆ لەزەت وەرگرتن لە ژیان ئەمەیە کە باوەڕمان هەبێت لە داهاتوودا کتێبەکانمان کاریگەرییەک جێدەهێڵن.

– ڕۆمانەکانی تۆ لە تورکیادا فرۆشـــیان زۆربوو، بەڵام لە دەرەوە فرۆشـــیان لە ناوخۆی تورکیا زۆرترە و بۆ چل زمان وەرگێڕدراون. لە وەختی نووســـیندا بیـــر لە خوێنەرانێکی فراوانتر ناکەیتەوە لەسەر ئاستی جیهان؟ ئێستا بۆ خوێنەری تر دەنووسیت؟

* من دەزانم ئەوانەی کە بۆیان دەنووسم تایبەت نین بە خوێنەرانی ناوخۆی تورکیاوە. ڕەنگیشە هەمان کات کە دەست دەکەم بە نووسین، بە دوای شەبەنگێکی فراوانتری خوێنەردابم. باوکم لە پاش ملە باســـی هەندێک نووسەری تورکی دەکرد دەیوت: (ئەوانە تەنیا بۆ خوێنەرانی ناوخۆ دەنووسن.) بە ئاگابوون لە خوێنەران، چ خوێنەری ناوخۆ، چ خوێنەری جیهانی، گرفتێکە. من ئیتر ناتوانم خۆم لەم گرفتە بپارێزم. دوو ڕۆمانی ئەم دواییەم لە سەرتاسەری دنیادا بەسەریەکەوە زیاتر لە نیوملیۆن خوێنـــەری هەبـــووە. ناتوانم نکۆڵی بکەم کە ئاگام لە بوونی ئەوانە هەیە. لە لایەکی ترەوە، هەرگیز هەســـتناکەم کە کار بۆ ڕازیکردنی ئـــەوان دەکەم. لەو باوەڕەدام گەر ئـــەم کارەبکەم، خوێنەرەکانم هەســـتی پێدەکەن. هەر لە سەرەتاوە هەوڵمداوە هەرکاتێ هەســـتم بە چاوەڕوانییەکانی خوێنەرێک

کرد، هەڵبژێم. تەنانەت گەر رستەبەندییەکانم- خوێنەر بۆ شتێک ئامادە دەکەم و دواتر سەرسامی دەکەم. رەنگە بەم دەلیلەش بێت کە عاشقی رستەی درێژم.

- زۆرینەی خوێنەرانی تورک لەو باوەڕەدان کە تازەیی نووسینەکانی تۆ تا رادەیەک بە هۆی ئەتمۆسفیری تورکیاوەیە. بە بۆچوونی خۆتان، چ شتێک کاری ئێوە لە تانوپۆی ئەدەبیاتی تورکی جیادەکاتەوە؟

* گرفتێک هەبوو کە هارۆڵد بلۆم ناوی نابوو(دڵە خورپێی کارتێکەر) منیش، وەک هەموو نووسەران، لە تافی لاویدا ئەم گرفتەم هەبوو. کاتێ تەمەنم سی و سی و دوو ساڵ بوو، ئەم بیرە وازی لێنەدەهێنام کە رەنگە زیاد لە رادە لەژێر کاریگەری تۆڵستۆی یا تۆماس ماندا بووبم- لە یەکەمین رۆمانمدا، ئامانجم خوڵقاندنی پەخشانێکی وەها ئارام و ئەشرافی بوو. دواجار گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ئەشێ تەکنیکەکانم وەرگرتبێت، بەڵام ئەم راستییەی کە لەم بەشەی دنیادا کاردەکەم کە ئەوەندە لە ئەوروپاوە دوورە- یا لانیکەم ئەوکاتە دوور دەهاتە بەرچاو- هەوڵدەدەم وەها خوێنەرانێکی جیاواز لە وەها کەشێکی فەرهەنگی و مێژوویی جیاواز بەلای خۆمدا رابکێشم. تازەگەری ئەو گرنتییەم دەداتێ، تەنانەت گەر ئاسانیش بە دەست هاتبێت. بەڵام وەها کارێک، لە خۆیدا، کارێکی سەختیشە، چونکە ئەم جۆرە تەکنیکە بە ئاسانی بۆ وەرگێڕان خۆیان نادەن بەدەستەوە یا سەفەر ناکەن.

تازەگەری فۆرمۆلەیەکی زۆر سادەی هەیە- دوو شت کە پێشتر لە تەنیشت یەکەوە نەبوون، بیانخەیتە تەنیشت یەکەوە. رۆمانی ئەستەنبوڵ بهێنینە بەرچاو، وتارێک لەمەڕ ئەم شارەو بۆچوونی چەند نووسەرێکی بیانی وەک: فلۆبێر، نروال، گوتێ- لە بارەی ئەستەنبوڵەوە و کاریگەری بۆچوونی ئەوان لەسەر هەندێک گروپی نووسەرانی تورک. ژیاننامەیەکی تایبەتیش لەگەڵ ئەم وتارەدا لەبارەی خەلاقییەتی دیمەنی رۆمانتیکی ئەستەنبوڵ بە تێکەڵی دەبینرێت. تا ئەوکاتە کەس ئەم کارەی نەکردبوو. گەر خۆت بخەیتە مەترسییەوە شتێکی تازە دەدۆزیتەوە. من لەبارەی ئەستەنبوڵەوە هەوڵم دا کتێبێکی تازە دابهێنم. نازانم سەرکەوتووە یا نا. کتێبی رەشیش هەروا بوو- دنیایەکی نۆستالیژی پرۆستی بە حیکایەت و چیرۆک و نوکتەی ئیسلامیی تێکەڵ بکەیت. دواتر هەموو ئەوانە لە ئەستنەبوڵدا جێبکەیتەوە و ببینی چی روودەدات.

- ئەستەنبوڵ ئەو هەستە دەداتە خوێنەر کە تۆ هەمیشە زۆر تەنیا بوویت. بێگومان وەک نووسەرێک لە تورکیای مۆدێرنی ئەمڕۆدا تەنیایت. لە دنیایەکدا گەورەبوویت و دەژیت کە لێی جوودایت.

* راستە کە من لە خێزانێکی قەرەباڵغدا گەورەبووم و فێربووم زۆر وابەستەی کۆمەڵگەبم، بەڵام دواتر حەزێکی توند بۆ هەڵاتن لە مندا دروستبوو. روویەکی خۆوێرانکەر لە مندا هەیە و لە نۆبەی تووڕەبوون و ساتی هەڵچووندا دەست بۆ کارگەلێک دەبەم کە پەیوەندیم بە کۆڕی دڵگیری

کۆمەڵگەوە دەپچڕێنێت. لە لاویدا، تێگەیشتم کە کۆمەڵگە خەیاڵەکانم لە بەین دەبات. من پێویستم بە ئازاری تەنیاییە تا خەیاڵەکانم بخاتەکار. ئەوسا خۆشحاڵم. بەڵام لەبەرئەوەی تورکم، دوای ماوەیەک پێویســـتم بە میهرەبانی تەسەلی بەخشی کۆمەڵگە هەیە. ئەستەنبوڵ بووە هۆی ئەوەی نێوانی من و دایکم تێکچووە ئیتر یەکتری نابینین و بە سروشـــتیش براکەم بە دەگمەن دەبینم. پەیوەندیشـــم لەگەڵ خەڵکی تورکیادا، بەهۆی دەربڕینی بیروبۆچوونەکانی ئەم دواییەم، تاریک بووە.

– لەگەڵ ئەم وەسفەدا هەستدەکەیت تا چەند تورکیت؟

* دەبێ بڵێم، من بە تورکی هاتوومە دنیا. لەم بابەتەوە خۆشـــحاڵم. لەســـەر ئاســـتی جیهانی، لەوە تورک تر دەخەملێنرێم کە خۆم هەســـتی پێدەکەم. وەک نووســـەرێکی تورک دەمناسن. کاتێ مارســـیل پرۆست لە بارەی عەشـــقەوە دەنووسێت، لەو باوەڕەداین کە قسە لە بارەی عەشقی رەهاوە دەکات. کاتێکیش من لە بارەی عەشـــقەوە دەنووســـم، بەتایبەت لە سەرەتای کارەکەدا، دەیانوت لە بارەی عەشقی تورکییەوە دەنووسێت. کە وەرگێڕانی رۆمانەکانم دەستی پێکرد، تورکەکان شانازییان بـــەم بابەتـــەوە دەکرد. دەیانوت ئەوە هی ئێمەیە. لە روانگەی ئەوانـــەوە، زیاتر تورک بووم. وەختێ لەسەر ئاستی جیهان دەناسرێی، لەسەر ئاستی جیهانی جەخت لە تورک بوونت دەکەنەوە و ئەوسا تورک بوونتان بۆ خودی تورکەکانیش، کە دووبارە تۆ دەدۆزنەوە، دەردەکەوێت. بۆچوونتان لە بارەی ناســـنامەی میللییەوە دەگۆڕێ بۆ شتێک کە ئەوانیتر بۆ ســـوودی خۆیان بەکاری دەهێنن و خراپ کەڵکی لێوەردەگرن. ئێستا زیاتر لەوەی کە نیگەرانی هونەری من بن، نیگەرانی وێنەیەکن کە لەسەر تورکیا دەدرێتە دنیا. لە تورکیا ئەم پرســـە رۆژ بە رۆژ کێشـــەی زیاتر دروست دەکات. زۆرێک کە رۆمانەکانم ناناســـن، بە هۆی وتارێک کە لە چاپەمەنییە عام پەسەندەکاندا دەیخوێننەوە، وردەوردە نیگەرانی ئەو قســـانە دەبن کە من لە بارەی تورکیاوە بە دنیای دەرەوەی دەڵێم. ئەدەبیات لە چاک و خراپ دروســـتکراوە، لە شـــەیتان و فریشـــتەکان، ئەوان هەموو رۆژێ لە رۆژی بەرێ زیاتر تەنها نیگەرانی شەیتانەکانی منن.

**سەرچاوە:**

wwwDibache.com



# دوو چیرۆکی سادق چووبەك

لە فارسییەوە: مەزهەر ئیبراهیمی

## (1)
## یەحیا

یەحیا یانزە ساڵان بوو، ئەمە یەکەم ڕۆژ بوو ئەیویست ڕۆژنامەی (دەیلی نیووز)[1] بفرۆشێ. لە نووسینگەی ڕۆژنامەکەدا بەرپرسی ڕادەست کردنی ڕۆژنامە و ژمارەیەک منداڵی هاوتەمەن و هاوئیشی خۆی، چەند جار نێوی (دەیلی نیووزیان) دووپات کردەوە و ئەویش خێرا لەبەری کرد. ناوەکە وەکو (دیزی)[2] هاتە پێش چاوی. چەند جار پەیتا پەیتا بە ئاسانی و بەبێ هەڵە لەبەر خۆوە وتی: دەیلی نیووز! دەیلی نیووز! و لە نووسینگە هاتە دەرەوە.

کە گەیشتە کۆڵانەکە، دەستی کرد بە ڕاکردن. هاواری دەکرد: دەیلی نیووز! دەیلی نیووز. سەرنجی هیچکەسی نەدەدا و بە ئیشی خۆوە سەرقاڵ بوو. هەتاوەکوو فرەتر ئەو نێوەی دەگوتەوە و خەڵک ڕۆژنامەیان لێ دەکڕی، زۆرتر شانازی بە خۆ دەکرد و پاش فرۆشتنی چەند دانەش، هەر ناوەکەی لە مێشکدا بوو. بەڵام کاتێ سەرگەرمی دانەوەی پاشماوەی پێنج قەرانی[3] کابرایەک بوو و دە شایی[4] کەمی هێنا و کابرا دە شاییەکەی پێ بەخشی و ئەویش شاگەشکە بوو، ئیتر هەرچەندە تێفکری نێوی ڕۆژنامەکەی بیر نەکەوتەوە.

ترس دایگرت. ســـاتێک وەســـتا و چاوی بڕییە سەر شەقامەکە. دیســـان دەستی بە راکردن کرد. دیســـانەوە بێ ئەوەی دەنـــگ هەڵبێنێ چەند رۆژنامەیەکیان لێ کڕی. بـــەڵام نێوی رۆژنامەکەی بە تەواوی لەبیر چووبوو.

یەحیـــا چاوی دەبڕییە زاری ئەوانەی رۆژنامەیان لێ دەکڕی، بەڵکوو یەکێکیان نێوی رۆژنامەکە بێژێ، بەڵام گشـــتیان بە سیمای خەمبار و بەبێ گرنگیدان بە ئەو و چاولێکردنی، رۆژنامەکەیان لێ وەردەگرت و دەچوون.

بێچارە و پەشـــۆکاو، سەیری دەوروبەری دەکرد بەشـــکوو یەکێک لە هاوڕێ رۆژنامەفرۆشەکانی ببینێ و ناوەکەی لێ بپرســـێ، بەڵام کەســـی نەدیتەوە. چەن جار نیگاری دیزی لەبەرچاویەوە خۆی نواند، بەڵام سەری دەرنەهێنا. لەسەر پیادەڕێی شەقامەکە کۆمەڵێک دیزی بزۆک پرۆڤەیان دەکرد و یەک دوو جار نێوی رۆژنامەکە لە مێشکیداترووسکایەوە و هەر هات بیگرێ، کوژایەوە.

سەری داخستبوو و ئارام ئارام رێی دەکرد. رۆژنامەکانی توند گرتبووە ژێر باڵیەوەو بە خۆیەوەی نووســـاندبوون. لەوەی دەترســـا لەبەر لەبیرچوونەوەی ناوەکە، رۆژنامەکانی لێ بستێنن. ئەیویست بگری، بەڵام فرمێســـکی دەرنەهات. ئەیویســـت نێوی رۆژنامەکە لە رێبواران بپرســـێ، بەڵام شەرمی دەکرد و دەترسا.

لـــە ناکاو ســـیمای گۆڕا و بزە گرتی و پێکەنین لـــە دەم و چاوی هەڵڕژا. توند غاری دا و هاواری کرد:

–پریمووس! پریمووس![٥]

نێوی رۆژنامەکەی دۆزیبووەوە.

## (٢)
## هاوڕێ

«پێکەوەبوونی دوو کەس بەقازانجترە لە تەنیابوونیان و ئاکامی هاوڕێیەتییان خەڵاتێکی چاکە بۆیان، چونکوو ئەگەر یەکیان لە پێ کەوت، ئەوی تر هەڵیدەســـتێنێتەوە، بەڵام هاوار لەو کەســـەی بێکەس بکەوێ، چون کەسی نییە یارمەتی بدات بۆ هەستانەوە.»

(تەورات، ئایەتێن ٩و١٠ی بەشی چوارەمی کتێبی «جامعە»)

دوو گورگی برســـی و ســـەرمابردوو، لە بوولێڵی بەیانیدا لە چیاوە داگەڕان و سەری رێیان بەرەو دەشتایی گرتە بەر. بەفری قورسی چەوسێنەر هەموو شوێنێکی گرتبوو. کرێوە و باپووک[٦] هەواکەی تێکدەدا و کەندولەندی داپۆشیبوو. ئەو دوو گورگە، برسی و شەکەت، لەو بەفرەدا دادەکشان و لەبەر گوشاری برسیەتی لمۆزیان دەخستە نێو بەفرەکە و زمانیان پێدا دەهێنا و بە شەویلگەی لەرزۆکەوە دەیانجاوی.

شوێن پێی ڕەش و قووڵی ڕانەئاسکی پێشوەچوو، وەک سیاوڵە[٧] پڕژابووە سەر بەفرەکە و ئێسک و پروسکی سەر و پێ و پەراسووی کۆچەرە جێماوەکان ڕەشیان دەنواند. ئەو جووتە نەیاندەزانی بۆ کوێ دەڕۆن، تەواو تەپەڕیان بڕابوو[٨].

قەمچی کرێوە و ســـەرما و برسیەتی بەرەو پێشـــی ئەبردن. کرێوە نەدەبڕایەوە. برسیەتی ناخی وشک کردبوون و شەپلاخەی باو بۆران شەویلگەی هەڵدەلەرزاندن. لێک دەکەوتن و لێک دەبوونەوەو دەکەوتنە کەند و لەو شەپۆلی بەفر و تۆفەدا سەرگەردان بوون و چۆلەکەش دوایی نەدەهات.

هەر ڕۆیشـــتن هەتا گەیشتنە هێشـــکارە بییەکی سووتاو کە پەنجە ئێسک ئاساکانی بۆ هاوار و شـــینی خۆ، ڕووەو ئاســـمان هەڵێنابوو. لاقی یەکیان لە بەفر داچەقی و جەستەی سەر قاچی بێهێز لەرزی و پێچی خوارد و قورس و قۆڵبەستکراو بە بەفرەکەوە نووسا. هاوڕێکەی بە پەلە و دڵبڕۆکیوە هاتە لای و شوێن پێیەکی قایمی لەسەر بەردێکی بن بەفر دۆزیەوە و چاوی لەو ئاواڵە پەککەوتەیەی هەڵنەگرت.

ترس هەموو گیانی هاوڕێی کلۆڵی داگرت، بە دەم وەنەوزەوە هەموو هێزی لە چاوە بێ سۆماکانیدا کۆکردەوە و نیگای لەو هەڤاڵە چنۆکەی هەڵنەگرت. هێزی تاقە هەنگاوێک بەرەوپێشچوونی نەبوو. لە پڕ نیگای لەرزی و گوڕی ڕوانینی هاوڕێی، چۆکی بە چاوانی دادا. ئەژنۆی چەمایەوە و بەلاداکەوت.

ئەوەی بە پێوە بوو، بە تەماحەوە لە ڕوخساری هاوڕێی ڕاما، ڕوخسارێ کە سەردەمێک هێلانەی نیگا بوو و هەنووکە کەوتۆتە سەر زەوینی بەفرپۆشیو. هەڤاڵی بە خوێن تینوو مرخی لێ خۆش کرد و لوورەیەکی برسیی لەرزۆکی دەنێو کەڵبەکانیەوە دەردا.

ئەوەی لە پێیان کەوتبوو، هەوڵی دا بۆ هەســـتانەوە. تووکی لەشی لە ژێر ئاردی بەفرا شنیایەوە و بە دەم لەرزەوە زۆرتر بۆ قووڵایی بەفر داکشا. دەمی داچەقی و سۆمای چاوی کوژایەوە.

ئەوەی بە پێوە بوو، دەمی وشـــکی ئاوەڵا کرد و کەڵبەی بە ڕژدی ژەنگ لێدراوی، چەقاندە ناقی هاوڕێی کلۆڵدا و خوێنی بەستراوی دەمارەکانی هەڵمژی و بەفری سپی بەتاڵی وشک بوو بە بەفری خوێناوی پڕی گەش.

## کورتەیەک دەربارەی سادقی چووبەک

سادقی چووبەک، لە ساڵی ١٢٩٥ی هەتاوی لە شاری «بووشەهر»، لە شارەکانی باشووری ئێران، چاوی بە ژیان هەڵێناوە و لە ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی (١٩٨٨ی زایینی) کۆچی دوایی کردووە.

جێدەســـتی ئەم نووسەرە لە بەرهەمی نووسەرانی هاوچەرخ و دوای خۆشیەوە دیارە و بەڕای رەخنەگران، چووبەک لەگەڵ ســـادقی هیدایەتدا، لە پێکهێنەرانی چیرۆکی نوێی فارســـین. لە زۆربەی بەرهەمەکانی ئەم چیرۆکنووســـەدا، دزێوی دۆخـــی کۆمەڵگا و دیاردە ناحەزەکانی، لەبەرچـــاوی خوێنەر زەق دەبێتەوە، بۆیە هەندێک لە رەخنەگران بە نووسەرێکی رەشبینی ناو دەبن. بەڵام لەڕاستیدا روانگەی چووبەک ئاوڕدانەوەیەکە لـــە واقیعی ئەو کۆمەڵگایـــەی تیا ژیاوە، هەروەک چۆن لە چیرۆکەکانی هیدایەتدا ئەم راســـتیانە رەنگیان داوەتەوە.

لەم نووسەرە پایە بەرزەی ئێران ئەم کۆمەڵە چیرۆکانە بڵاوبۆتەوە: (انتری کە لوگیش مردە بود، خیمە شـــب بازی، روز اول قبر، چراغ اخر و...) هەروەها رۆمانە بەناوبانگەکەی بە نێوی (ســـنگ صبور) و چەن بەرهەمێکی تر.

## پەراوێزەکان:

١-رۆژنامەیەکی ئینگلیزی چاپی تاران.

٢-دیزەک، دیزەی چێشت لێنان، جۆرە خواردنێکیشە.

٣-ریال، پارەی ئێرانی کە کەمتر لە تمەنە.

٤-شاهی، بێ نرخترین پارەی ئێران لە سەردەمی پاشایەتی.

٥-پریمـــووس جۆرە چرا و رووناکیدەرێکی قەدیمییە کە کورد پەرەمێزی پێ دەگوت، رەنگە نووســـەر بەم مانایەی هێنابێت.

٦-بەفر و با پێکەوە.

٧-رەشکە، تۆمێکی رەشە بە ناندا دەیکەن.

٨-هێز لێ بڕان.

## سەرچاوە:

انتری کە لوگیش مردە بود و داستان های دیگر / صادق چوبک، بە انتخاب کاوە گوهرین. تهران: انتشارات نگاە، ١٣٨٣.

# بۆ خۆم کرد بە هوزار

ولفکانك هیلدز هایمر
لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵلا

ولفکانـــک هیلدز هایمر لە هامبۆرگ – ئەڵمانیا لە ســـاڵی ١٩١٦دا لەدایک بووە، هونەرمەندێکی سەربەخۆیە، شـــانۆکار و چیرۆکنووسە، وەک وەرگێڕێک و وەرگێڕێکی خێرا لە دادگاکانی نۆرمبرگدا کاریکردوە. ڕۆمان و کورتەچیرۆک دەنوسێت.

لەبەر ئەوەی بڕوام زۆر پێی بوو، خۆم کرد بە هوزار. لەبەرئەوەیش کە هیچ فاکتەر و پێویستیەکی گرنـــگ بۆ ئەم جـــۆرە کارە لە چوارچێوەی ئاســـاییدا نییە، بڕوام بەوەیە چیرۆکـــی ئەم گۆڕانە لە مرۆڤەوە

بۆ هوزار، شایانی قسە لەسەرکردنە.

باوکم پسپۆری بواری زیندەوەرزانی بوو، ئەو بڕوای وابوو زانیارییە زۆرەکانی سەر وشکاوەکیەکان، نەک ورد نین بەڵکو هەڵەیشـــن، بۆیە بۆ ئەو مەبەســـتە ژیانی خۆی بۆ نووسینی چەند بەرگێک لە توێژینەوە بۆ ئەو بوارە تەرخان کرد. توێژینەوەکان لەنێو پسپۆڕانی بوارەکەدا دەنگی دایەوە.

هەرچەنـــدە لـــە ماڵەکەماندا گەلێک بـــۆق و قورڕناویلکە هەن کە ژیان و قۆناغی گەشـــەکردنیان شایەنی توێژینەوەیە. بەڵام من هەرگیز حەزم لە زانستی زیندەوەرزانی نەکردوە.

دایکم پێش ئەوەی شـــوو بکات ئەکتەر بووە، لە شانۆی زفیکاوی دەوڵەتیدا ڕۆڵی ((ئۆلڤیلیا)) ی دیوە و ســـەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوە. هەرگیز نەیتوانی ئەو پەیوەندییە قەشەنگە دیارە وەلابنێت. لەبەرئەوە ناوی (لابرتس) ی لێنام. هەرچەندە کەمێک سەیر بوو بەڵام ناوێکی خۆش بوو. لەگەڵ ئەوەشدا من سوپاسی دەکەم کە ناوی (بولونیۆس ) یان (کلدنشتیرن) ی لێنەنام –بێگومان

ئێستا ئەوەم بەلاوە گرنگ نییە.

کاتێک تەمەنم پێنج ساڵ بوو، باوک و دایکم سندوقێکی ئەفسوناویان دامێ.

پێش ئەوەی خوێندنەوە و نووسـین بزانـم، فێربووم چۆن کاری ئەفسـوناوی منداڵانە ئەنجام بدەم. بەهۆی ئەو کەرەسـتانەی لەناو سـندوقەکەدا بوون، توانیم ئاوێکی پاک و بێگەرد بگۆڕم بۆ ئاوێکی سور، پاشان دووبارە بیکەمەوە بە ئاوێکی پاک و بێگەرد، یان هێلکەیەکی ڕەق بکەم بە دوو لەتەوە بەئاسانی سەرەوژێر هەڵیگێڕمەوە ( بەشەکەی تری دیار نەمێنێت بێئەوەی هیچ ئاسەوارێک جێبێڵێت). یان دەستەسرێک ڕەنگەکەی بگۆڕم بەهۆی ڕاکێشانی لە ئەڵقەیەکەوە ....بەکورتی، هیچ شتێک لەناو شتومەکەکەدا نەبوو- وەک حاڵی زۆربەی یارییەکان — شتە ڕاستەقینەکان بچووکتر دەردەکەون.

لەوەدەچێت داهێنەری ئەم یاریە مەبەسـتی بووبێت کە بەها فێرکارییەکەی بشـارێتەوە و وا لە منداڵ بکات سـود لە شـتەکان نەبینێت. ئەم تاقیکردنەوەیە کاریگەریەکی یەکلاکەرەوەی لەسـەر گەشەسـەندنی ئاییندەم هەبوو، لەبواری چێژ وەرگرتن لە گۆڕینی شـتێکی بێکەڵک بۆ شتێکی تر، هەرئەوەیشە فێری کردم لەو زانستەدا بەدوای بەختەوەریدا بگەڕێم کە هیچ مەبەستێکی دیاریکراوی لێنایەتەدی، بەدڵنیاییەوە پێش ئەوەی بگۆڕێم ئەو بەختەوەریەم نەدۆزیەوە.

لەسـەرو هەموو ئەمانەشەوە خواسـت و ئاواتم زیادی کرد، ئیدی سندوقە ئەفسوناویەکە بەشی نەدەکردم . هاوکات فێری خوێندنەوە بووم ، لەسەر بەرگی سندوقەکە ئەم زاراوە بێذرخەم خوێندەوە ((جادوگەرە بچووکەکە)) تائێستاش ئەو ئێوارەیەم لەیادە کە چووم بۆ تاقیگەکەی باوکم و پرسیارم لێکرد، ئاخۆ دەتوانم وانە لە ئەفسوندا بخوێنم، باوکم تاسەر ئێسقان لە جیهانی وشکاوەکیدا سەرقاڵ بوو، بۆیە بە وریییەوە سـەیری کردم. من لەسـەر پرسـیارکردن پێم داگرت، بۆیە ئەویش خێرا ملی کەچ کرد، ئەو هەسـتەم بیرناچێتەوە کە باوکم واتێگەیشـتبێت من مەبەستم ئەو وانانە بووە کە لە پیانۆدا دەمخوێند. چونکە پاش ئەوە چەند جارێک پرسیاری لێکردم ئاخۆ دەتوانم کۆپلەکەی سیرنی ((تود)) بژەنم، پێموت بەڵێ چونکە دڵنیا بووم کە ناتوانم ئەوە بسەلمێنم.

چەند وانەیەکم لەسـەر دەسـتی جادوگەرێک خوێند، کە لە زۆر ئاهەنگی جۆراوجۆری شارەکەدا دەرکەوتبوو، وەک بیسـتبووم ئەو سەرکەوتنێکی گەورەی لە لەندەن و پاریس بەدەستهێنابوو. پاش ساڵانێکی کەم — هاوکات لە قوتابخانەیەکی باڵا بووم — بەهرەکانم زۆر پەرەی سەند تا ئەو ڕادەیەی کە توانیم کەروێشکێک لە کڵاوێکی قوتەوە دەربێنم.

لەیادمە کە یەکەم نمایشـم لەبەردەم باوکم و خزمە نزیکەکانمدا پێشـکەش کرد. دایک و باوکم زۆر شـانازیان بەو بەهرانەمەوە دەکرد، وەک خۆیان دەڵێن کە لەکاتی بێئیشیدا بەدەستم هێنابوون ... بیریان لەوە کردەوە کە من دەتوانم لە ئاییندەدا ڕاهێنانیان لەسـەر بکەم، لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا مۆسـیقا بژەنم، لەکاتێکدا من بەکۆششەوە لە پیشەکەمدا کارم دەکرد (بێئەوەی ئەوان هیچ بیرۆکەیەکی ڕاسـتەقینەی دیاریکراویان دەربارەی هەبێت)، بەڵام من چەند پلانێکی ترم هەبوو.

دەستـــتم بە ئەزموونە تایبەتەکانم کرد و بەسەر مامۆستاکەمدا سەرکەوتم، خوێندنی ئەکادمیشیم پشتگوێ نەخست، زۆرم خوێندەوە، لەگەڵ هاوڕێکانی قوتابخانەمدا کە چاودێری سیمای پێشکەوتن و گۆڕانیانم دەکرد، کەوتمە گەڕان، هاوڕێیەکم کە لە منداڵیدا شەمەندەفەرێکی کارەباییان بە دیاری پێشـــکەش کردبوو، خۆی بۆ پیشـــەیەک ئامادە دەکرد کە پەیوەندی بە هێڵی ئاســـنینەوە هەبوو، هاوڕێیەکی تر کە بەو بووکە شووشە سەربازانەی لەتەنەکە دروست کراو بوون یاری دەکرد، بڕیاریدا ببێتە ئەفســـەر لە ســـوپادا. بەمشـــێوەیە، هێزی کار بەهۆی کاریگەرییە دێرینەکانەوە ڕێکدەخرا، هەرکەسێک وابەستە ببوو بە پیشەکەیەوە یان بە جۆرێکی تر پیشەکەی وابەستەی ئەو ببوو، بەڵام من بڕیارمدا ژیانی خۆم لەسەر چەند بنەمایەکی دی ڕێکبخەم.

لێرەدا دەتوانم بڵێم کە من نەگەیشـــتبومە ئەو بڕیارەی لە ســـاڵی دوایـــدا دام، چونکە من حەز دەکەم لە دیدی کەسانی تردا لەشێوەی کەسێکی ڕەفتار سەیر یان نامۆدا دەربکەوم. بەڵام زیادبوونی هۆشیاریم وایلێکردم نەتوانم پیشەیەکی بورجوازی تەقلیدی هەڵبژێرم بێ چوونە ناو ژیانی کەسانی ترەوە . پیشـــەی بیرۆکراتیم وەک پیشـــەیەکی بێڕەوشـــت هاتە بەرچاو. بەڵام لەچەند پیشەیەکی تر تەکیمەوە، کە پەســـەندتر و مرۆڤایەتی تربوون، بۆ من وەک پزیشـــکێک کار بکەم بتوانێت ژیانی مرۆڤ ڕزگار بکات،  ئەو خۆهەڵقورتاندنە کارێکە کە جێی ڕاز و گومانە، لەوانەیە ئەو کەسەی ژیانیم ڕزگار کردوە زۆر هیچ و پوچ بێت و سەدان کەسی ستەملێکراو بەپەرۆشەوە حەز بکەن ژیانی کۆتایی پێبێت.

کاتێک درکم بەمە کرد، هاوکات لە شتێکی تریش تێگەیشتم، بە دیاریکراوی ئەمەیە: دانانی شتە کاتیەکان تەنها شـــتن کە هەســـتی پێبکەین. بۆیە بڕوا هێنان بەوەی کە ئەنجامگیری و مەعریفەت پەیـــدا کردن تەنیا لە ڕێگەی ئەزموونەوە دەبێت، ئەوە بۆچوونێکی هەڵە و گەمژانەیە، بۆیە بڕیارمدا ژیانم لە بۆشاییدا بەبێ بیرکردنەوە بەسەر بەرم.

دوو کیســـەڵم هەبوو، لەســـەر قەنەفەکە دادەنیشـــتم، چاودێری باڵندەکانم دەکرد بەسەرمەوە، هەروەها دوو کیسەڵەکە کە لەخوارەوەمدا بوون.

وازم لە جادوو هێنا، چونکە هونەرەکەم گەیشتبووە ئەوپەڕی پێشکەوتن. هەستم کرد کە دەتوانم خەڵکی بکەم بە ئاژەڵ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو توانایەم بەکار نەهێنا چونکە لەو باوەڕەدابووم ئەو جۆرە خۆهەڵقورتاندنە لە ژیانی کەسێکی تر، مەحاڵە پاساوی بۆ بهێنرێتەوە .

لـــەو کاتەدا ئارەزوویەک بەرۆکی گرتم کە ببم بە باڵندە . لەســـەرەتادا نەمویســـت جڵەو بۆ ئەو ئارەزووە شل بکەم، چونکە تا ڕادەیەک مانای شکست هێنانە، من هێشتا چێژم لە ئامادەگی باڵندە نەبینیبوو، کە ئارەزووی شتێکی دوورتر لە مەم دەکرد، بەهەرحاڵ هەستەکانم بەم ئارەزووە شلوێ بوون.

من لەوە لاواز  تربووم کە بتوانم یاری بە پراکتیزە کردنی بیرۆکەکە بکەم، بە دڵنیاییەوە شانازیم بە وەدیهێنانی حەزەکەمەوە دەکرد، ئەگەر هەستم بکردایە بەختەوەرم دەکات.

خێـــرا ئەو هەلە هاتە پێشـــەوە، ئێـــوارەی ڕۆژێک، لەکاتێکـــدا لە باخچەکەدا دانیشـــتبووم  و

چاودێریی کیسەڵەکەمم دەکرد، بەڕێز فیرهانی هاوڕێم سەردانی کردم، کە سەرنووسەر بوو لە ڕۆژنامەیەکدا (یەکێک ئامێرێکی چاپکەری دابوویە کاتێک مێرد منداڵ بوو). لەسەر قەنەفەکە دانیشت و دەستی بە گلەیی و گازندە کرد، سەرەتا لە خوێنەرە قین لەدڵەکان، پاشان ڕۆژنامەنووسە ناچوست و کارامەکان. هیچم نەگوت، ئاسایی سکاڵاکەران شایستەی ئەوەن کە قسەیان پێنەبڕیت. لەکۆتاییدا وتی: (دۆزیمەوە) لەکاتێکدا یەکێک لە کیسەڵەکان لەژێر قەنەفەکەوە خشەی هات، وتی (کوڕەکە، خۆزگە کیسەڵێک بوومایە). ئەمە دوا وشەی بوو، چونکە من دارێکی ئەفسوناویم بەرزکردەوە و کردم بەکیسەڵ. پیشەی ڕۆژنامەنووسیی بەڕێز فیرهان کۆتایی هات، بەڵام لەوانەیە ژیانی دوورو درێژتر بووبێت چونکە کیسەڵ تەمەنی درێژە. سەرکەوتنێکی مەزن بوو بۆ من، بێجگە لەوەش، کیسەڵەکانم بوون بە سێ کیسەڵ ( تەنها بۆ مەبەستی تۆمار کردن دڵنیات دەکەمەوە دوانەکەی ترم وەک خۆیان کرییبوو). پێش ئەوەی خودی خۆم بگۆڕێم، جارێکی دی هونەرەکەم پراکتیزە کرد.هەر کە ئەم ڕووداوە دێتەوە یادم هەست بە چزەی دڵەڕاوکێ دەکەم، چونکە دڵنیا نەبووم بتوانم بە ڕێکوپێکی لەگەڵ شتەکاندا مامەڵە بکەم.

لە ئێوارەیەکی مانگی حوزەیراندا — کە ڕۆژم لە لادێدا بەسەر بردبوو — لە باخچەی ئوتێلێکدا دانیشتبووم، پەرداخێک لەشەربەتی سێوم دەخواردەوە. بە تەنیاییم ئاسوودە بووم. لەناکاودا دەستە کیژێک دەرکەوتن کە لە پێنج کەس پێکهاتبوون، هاتن لەسەر مێزێکی نزیکمەوە دانیشتن. کیژەکان شۆخ و شەنگ وجوان بوون، بەڵام لە بێزارکردنیان تووڕە بووم ، پەستتر بووم کاتێک کە دەستیان بە گۆرانی چڕین کرد، ،یەکێکیان ماندۆلینی دەژەنی، لە سەرەتا ئەم گۆرانییەیان وت:

(پێویستە لەسەرم ، پێویستە لەسەرم شارەکە جێبێڵم:)

پاشان :

(ئاخ ، گەر چۆلەکە بوومایە

و دوو باڵم هەبوایە

بەرەو ئامێزت دەفڕیم)

ئەم گۆرانیە بەلای منەوە گۆرانیەکی بێ مانا بوو، چونکە سروشتیە کە باڵندە دوو باڵی هەبێت. وانییە؟ بەڵام لێرەدا دەربڕینێک هەیە کە ئارەزووی بوونە بە باڵندە، ئەمە هانی دام گۆرانی بێژەکان بکەم بە پۆلێک لە چۆلەکە، پاش ئەوەی گۆرانیەکە کۆتایی هات. بەرەو مێزەکەیان ڕۆیشتم و دارە ئەفسوناویەکەم جولاند، بۆ ساتێک وامدەزانی کە تیمێکی پێنج کەسی بەڕێوە دەبەم —بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند، چونکە پێنج چۆلەکە زریقە زریقکەرەکە فڕین و دوور کەوتنەوە.

بێجگە لە پەرداخەکان کە نیوەی شەرابی سێویان تیا مابووەوە، لەگەڵ دوو بابۆڵەی کەمێک خوراو، ماندۆلینەکە لەسەر زەوی کەوتبوو، ئەو شتانەی کە پێش چەند چرکەیەکی کەم دەیانسەلماند کە پێنج کیژی تەواو زیندوو بوون.

کە ئەم دیمەنە بەربادەم بینی. کەمێک پەشیمان بوومەوە، چونکە وا بەبیرمدا هات لەوانەیە

گۆرانی چڕین بەشێوەیەکی تەواو و ئاشکرا ئارەزووی بوون بە باڵندەی دەرنەبڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا زاراوەی ( گـــەر باڵنـــدە بوومایە ) بـــە تەواوی ئارەزووی بوون بە باڵنـــدە دەرنابڕێت، کەچی ئەمە ناوەرۆکی سروشـــتی ئەو گۆرانیە بوو ( ئەگەر قسە لەسەر ناوەرۆکی گۆرانیەکی وەک ئەمە بکەیت) وا هەســـتم کرد کە من بەشێوەیەکی سۆزدارانە هەڵسوکەوتم کردوە و لەژێر کاریگەریی تووڕەبووندا بووە .

(بێگومان ئەمەش پاســـاوە ) بیرم کردەوە کە ئەمە شایســـتەی من نییـــە، لەبەرئەوە بڕیارم دا گۆڕانەکەم لەوە زیاتر دوابخەم. دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە کە ترس لە ســـزای کارەکانم، یان ترس لە هەر ســـزایەکی تاوان بێت، ئەو دوانەن هانم دەدەن کە شێوەیەکی تر وەربگرم. (من دەتوانم پیاوانی پۆلیس لەکاتی دەستگیرکردنمدا بکەم بە بووکە سەماکەرە لەشێوەی سەگە ڕاویەکانی ڕێویدا) ئەوە بـــۆ دڵنیا بوونـــە، لەبەر هۆیە تەکنیکیەکانە، من تەنها ئەو ئاشـــتییە پیس نەبووە دەدۆزمەوە کە پێویســـتمە بۆ ئەوەی چێژی تەواو لە شتەکان ببینم، ئەو ئاشـــتیەی ئارەزوو پیسی نەکردووە، لە شوێنێکدا سەگ دەوەڕێت، منداڵێک هاوار دەکات، کیژۆڵەیەک گۆرانی دەچڕێت.

من هەر لەخۆمەوە شـــێوەی هوزارم هەڵنەبژاردوە، من حەز دەکەم ببمە باڵندە چونکە بیرۆکەی توانینی فڕینم لە درەختێکەوە بۆ یەکێکی دیکە زۆر پەرۆشی کردبووم، بێجگە لەوەیش من دەمەوێت بجریوێنم چونکە حەزم لە مۆسیقایە .

بیرۆکەیەکم بۆ هات کە خۆم هەڵقورتێنمە نێو ژیانی کەسێکەوە دەیەوێت بنوێت و بێزاری بکەم. بەڵام من ئێســـتا مرۆڤ نیم. وازم لە بیرۆکە مرۆییەکانم و بایەخ پێدانەکانم هێنا. ئێســـتا ڕەوشتم ڕەوشتی هوزارە .

لە ئەیلولی ســـاڵی ڕابردودا. چوومە ژووری نوســـتنەکەمەوە . پەنجەرەکەم کردەوەو ئەفسونەکەم کۆکردەوە بۆ دوور فڕیم. پاش ئەوە هەرگیز پەشیمان نەبووم.

ئێستا مانگی مایسە، خۆر لەئاوابووندایە پاش کەمێکی تر تاریکیش دادێت، دەست بە گۆرانیەکەم دەکەم، یان وەک مرۆڤ دەڵێت، گۆرانیەکەم دەچڕم.

## سەرچاوە:

کۆمەڵە چیرۆکی زوجة کوکول




# نامە بۆ میلنا

فرانز كافكا
لە فارسییەوە: رەووف بێگەرد

**مران، ٤ ژوین ١٩٢٠- هەینی**

پێش هەموو شــتێک، میلنا، ئەو ئاپارتمانەی رۆژی یەکشەممە دەربارەی نوسیبووت چۆنە؟ گەورە و خاڵیە؟ ئایا تۆ تەنیایت؟ شــەوو رۆژ؟بە ڕاســتیی ئەمە مایەی خەم و ناخۆشیمە کە تۆ لەوێ لەیەک شــەموانێکی قەشەنگدا، بە تەنیا بەرانبەر ”کەســێکی نەناس“ دابنیشیت کە سەرو چاوی لە کاغەزی لەسەر نووســراو دەچێت. من زۆر چاکترم، هەرچەندە ژوورەکەی من بچووکە، بەڵام میلنای ڕاستەقینە کە ڕۆژانی یەک شەموان بە ئاشکرا لە ئێوە هەڵدێت لێرە لای منە. باوەڕم پێ بکە ژیان لەگەڵیدا گەلێک خۆشە.

ســکاڵات لە بێ سوودی کردووە. ڕۆژانی پێشــوو جیاواز بوو ڕۆژانی تریش هەر جیاوازیان دەبێت، ڕســتەیەک (نازانم هی کێیە) تۆی شــڵەژاندوە، بەڵام تێکڕا ئەم ڕســتەیە گەلێک ڕوون و ئاشــکرایە، پێشتریش زۆر جار بە هەمان مانا رستەی دی وتراوەو بیری لێکراوەتەوە، کەواتە ڕاستیەک لەو بارەیەوە هەیە کە مرۆڤ بە دەست شەیتانەکانی خۆیەوە مەینەتی و ئازار دەچێژێت بێ ئەوەی بیری لێ کاتەوە کوێرانە تۆڵە لە هاوڕەگەزەکانی خۆی دەکاتەوە.

لە هەڵوێســتێکی لەم بابەتەدا تۆ دەتەوێت بە تەواویی فریادڕەس بیت، ئەگەر تەواو سەرنەکەوتیت ئەوا خۆت بەبێ کەڵک دەزانیت. کێ بۆی هەیە کفری وا بکات؟ تا ئێستا کەس بەو ئامانجە نەگەیشتووە، تەنانەت مەسیحیش. مەسیح تەنیا ئەوەی پێ دەکرا کە بڵێت: (دوام بکەون) پاشان ئەم وتە مەزنە (کە بە داخەوە من بە هەڵە گواســتوومەتەوە) بە دوایدا دێت: ”بە قســەم بکەن بۆ ئەوەی بزانن ئەمە قسەی مرۆڤ نیە و هی خودایە“ مەســیح شــەیتانی تەنیا لە دەروونی ئەوانەدا دەردەکرد کە دوای دەکەوتن. ئەمەیش نەک بۆ هەمیشــە، وازی لە شــەیتان دەرکــردن بهێنایە بێکەڵک دەبــوو. ئەمە تاقە خاڵێکە پێشکەشتی دەکەم. مەسیحیش کەوتە داوی دوو دڵیەوە.

**مران، ٤ ژوین ١٩٢٠ – هەینی**

ئەمڕۆ سەرلە ئێوارە، بە ڕاستیی بۆ یەکەمین جار پیاسەیەکی تاڕادەیەک درێژم کرد. جاران یان لەگەڵ خەڵکی تردا دەگەڕام یان زۆر جار لە ماڵێ دەحەسامەوە. ئێرە چ گوندێکی قەشەنگە. میلنا، ئەگەر تۆی لێ بوویتایە ئەم گوندە دەبوە بەهەشت. ئاه، خۆزگا تۆ لە پاڵ ئەم ڕا لاواز و بیرکۆڵەدا بوویتایە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر بڵێم بیرم کردوویت درۆم کردووە. چونکە بەو ئەندازەیەی کە من لێرەم تۆیش لێرەیت. تەنانەت ئامادەگیی تۆ لێرە لە خودی من زیاترە. ئەم نوکتەیە کامڵ و لە هەمان کاتدا زۆر بە دەردوژانە. من گاڵتە ناکەم. هەندێک جار وا بیر دەکەمەوە کە تۆ لەبەرئەوەی لێرەیت خەمم لێ دەخۆیت. لە خۆت دەپرسیت: "ئەو لە کوێیە؟" ئاخر ئەی ئەو نەینووسیوە کە لە مران دەژی.

-ف-

ئایا ئەو دوو نامەیەی لە وەڵامی نامەکەتدا بۆم نووسیت پێت گەیشتووە؟

**مران، ٢٩ی مەی ١٩٢٠**

خاتوو میلنای ئازیز، ئەو ڕۆژەی لەگەڵ تۆداو لەگەڵ کارگەلێکی ناجۆردا خێرا دەگوزەرێت زۆر کورتە. بە زەحمەت چرکەساتێک دەستگیر دەبێت بۆ ئەوەی نامە بۆ میلنای ڕاستەقینە بنووسیت، لەبەرئەوەی ئەو میلنایەی زۆر ڕاستەقینە ترە تەواوی ڕۆژەکە لێرە بوە. لەم ژوورەدا، لە باڵکۆنەکە و لە نێو هەورەکاندا. لە دوانامەتدا ئەم هەموو شادی و بێ خەمی و ئاسوودەییەت لە کوێوە هێناوە؟ ئایا هیچ گۆڕاوە؟ یان من خۆم دەخەڵەتێنم، یان لەوانەیە ئەم هەموو پارچە پەخشانانە بێت ئەو وێنایە دەسازێنن؟ یان ڕەنگە جلەوی خۆت و کاروبارەکانی ئەوێت بە چاکی گرتبێت، ئەی چیە؟

نامەکەت لە نامەی دادوەرێک دەچێت لە کاتی حوکمداندا، من زۆر بە جیدی ئەمە دەڵێم. سەرکۆنە و ڕەخنەکانت ڕاست و دروستن، تۆ لەو بارەیەوە ڕاست دەکەیت، لەسەر هەقیت، بەڵام نەک هەقی تەواو، ئەوەندە لەسەر هەقیت کە پێشتر بۆم دەربڕیویت، ئەمە روونە، ئەگەر من بەو ڕادە توند و وابەستەییەی لە نامەکەدا نووسیومە شێرزە بووبم، نەمدەتوانی لەسەر کورسیەکەم پاڵ بکەوم و ڕۆژی دوایی سەرەڕای هەموو تەگەرەیەک لە ژوورەکەتدا ئامادەدەبووم، ئەمە محەکی یەکدڵی و تەباییە. بێجگە لەوە تەنانەت ئەم ڕستەیەی دواییش هەر قسەیە، یان بانگەوازن بۆ ئەو هەستە شاراوەو ڕەگاژوە، بەڵام ئەم هەستە خامۆشە و سەری داوەتە دەست ڕێکەوت.

چۆنە تۆ لەو جۆرە کەسە پێکەنین هێنەرو هەرزەوێژانەی کە باست کردوون بێزار نابیت. (تۆ ئەوانت بە عەشق و لەملاوە بە فریودەر وەسف کردووە) -لەوانە ئەو کەسەی کە ئەو پرسیارەو گەلێک شتی تری پرسیبوو – لەم لایەنەوە دوا بڕیار لای تۆیە، بەردەوام ئەوە ژنە کە دوا جار بڕیار دەدات. (ئەفسانەی پاریس[1] تا رادەیەک ئەم رایەی بە نهێنی هێشتۆتەوە. بەڵام تەنانەت پاریسیش تەنیا لەو بارەیەوە داوەریی دەکات کە سەرئەنجام بڕیاری کام لە ژنە خوداکان چاکترە) نابێت ئەم گاڵتەجاڕیانە کاریگەریان هەبێت. گاڵتەجاڕیەکی لەم بابەتە کە جارێک پێکەنین هێن و تاوێک باش و جیدی دەبن زۆرن. ئایا ئەمە ئەو ئومێدەیە کە تۆ بەو کەسانەوە دەبەستێتەوە؟ کێ دەتوانێت بڵێت چی لە هەستی شاراوەی دادوەرێک دەزانێت؟ بەڵام من وای بۆ دەچم کە تۆ چاوپۆشی لە هەڵەی ئەو کەسانە دەکەیت، دەیانقۆزیتەوە، هاوڕێیەتیان دەکەیت، لە چوارچێوەی ئەو عەشقەوە خەڵاتی خانەدانی و ڕەسەنایەتیان

پێ دەبەخشــیت. ئەو قەشــمەرانە هیچ نین بێجگە لە زیگزاک ڕۆیشــتنی سەگ نەبێت، لە کاتێکدا کە خاوەن ســەگ ڕاســت بەرەو پێشــەوە دەڕوات نەک وەک ســەگ بە پێچ و پەنا. بەڵکوو بەوردیی بەرەو ئامانجێک هەنگاو دەنێت کە لە کۆتایی شــەقامەکەدایە. بەڵام مەبەســتێک لەم خۆشویســتنەی تۆدا هەیە. من زۆر بڕوام پێیەتی (هەرچەندە لەو بارەیەوە ناتوانم پرســیار نەکەم یان پێم ســەیر نەبێت) من تەنیا لەســەر لایەنێک پێداگریی دەکەم، ئەم مەســەلەیە دەمباتەوە بۆ قســەیەک کە جارێکیان لە یەکێک لە کارمەندی ئیدارەکەمم بیســت چەند ســاڵێک لەمەوبەر زۆر جار لە ڕووباری مولداو[٢] سواری بەلەم دەبووم، بەرەو ژوور سەوڵم لێ دەدا و پاشان لەسەر پشت ڕادەکشام، خۆم دەدایە دەست تەوژمی ڕووبارەکــە و بە ژێر پردەکەدا تێدەپەڕیم، لەبەرئەوەی لە ڕادەبەدەر لەڕ و لاواز بووم لەوانەیە دیمەنەکە لەســەر پردەکەوە زۆر پێکەنیناوی دیار بووبێت. ئەو کارمەندە کە جارێکیان منی بەو حاڵەوە لەســەر پردەکەوە دیبو، لە کاتێکدا تەواو جەختی لەســەر ئەوە دەکرد کە تەنیا بۆ گاڵتەیە، بەڵام لای خۆیەوە بەم جۆرە کورت و پوختی کردبۆوە. دیمەنەکە لە هاتنی ڕۆژی حساب (قیامەت) دەچێت کە تابووتەکان کرابوونەوە بەڵام مردووەکە هێشتا بێ جووڵە ڕاکشا بوو.

من بۆ گەڕانێکی کورت چووم (ئەو گەڕانە دوور و درێژە نا کە پێشــتر باســی کراو ئیدی هەرگیز رووی نەدا) نزیکەی ســێ ڕۆژە ئەوەندە شــەکەتم (ئەم شەکەتیە زۆر ناخۆش نیە) هێزم نیە و توانای ئەنجــام دانــی چ کارێکم نەماوە تەنانەت نووســینیش. مــن تەنیا نامە و وتارەکانــم[٣] چەند جارێک خوێندەوە. بەبڕوای من ئەو جۆرە پەخشانە بێگومان پەخشانێک نیە لە خۆیەوە بۆ خۆی بێت، بەڵکوو تا ڕادەیەک خەســڵەتی کەســێکە لە کاتی بەڕێگا ڕۆیشتندا، ڕێگایەکە کەسەکە بە شادی و خۆشیەکی زۆرەوە دەیبڕێت و بەردەوامە لەســەر ڕۆیشــتن، سەرئەنجام لە چرکەســاتێکی هۆشیاریدا دەرکی ئەوە دەکات کە هیچ پێشکەوتنێکی بەدەست نەهێناوە بێجگە لەوەی ئەو بە سادەیی بە وێڵگەیەکدا گوزەری کردووە، تەنیا لە جاران بە پەرۆشــتر، تەنیا لە جاران حەپەســاوتر و ســەر لێ شــێواوتر. بەهەرحاڵ، نووسەری ئەو پەخشانە نووسەرێکی ئاسایی نیە، کە خوێندمەوە بەو ڕادەیە بڕوام بە نووسەریت هێنا کە بڕوام بە شەخســی خۆت بوو. من لە زمانی چیکدا (هەرچەند زانیاریەکی ســنووردارم هەیە) تەنیا شــارەزای ئاهەنگی زمانێکی ترم کە لەم پەخشانە دەچێت. ئەویش زمانی بوزنا نیمکوڤایە[٤]، وا ئێستا ئەم پەخشــانە ئاهەنگێکی ترە کە لە باری مەبەســت وروژاندن، شــیرینی و لەوانەیش زیاتر هۆشــی ڕووناکبینێکی دەربەســت و پەخشانێکی ناوازەیە. تۆ بڵێی ئەم بەرهەمە بەرئەنجامی ئەزموونی ساڵانی ڕابوردوو بێت؟ ئایا تۆ بەردەوام دەتنووســی؟ بێگومان تۆ دەڵێیت کە من بە شێوەیەکی گاڵتە ئامێز و لایەنگرانەو خۆشەویستی زۆرمەوە قسە دەکەم و ئەگەر وایش بڵێیت بە ڕاستیی هەقی خۆتە. هەڵبەتە من تووشی پێشداوەریی هاتووم، بەڵام نەک لەبەر ئەو شتەی چی لە وتارەکانەوە فێربووم (کە هەندێک جار کاریگەریی خراپی زمانی ڕۆژنامە نووسی تووشی بێ ئاهەنگی و نەگونجانی دەکات) بەڵکوو بەهۆی ئەو شتە تازانەوە کە لە وتارەکاندا بۆم دەرکەوتۆتەوە. تۆ بە ئاسانی دەتوانیت حوکم لەسەر بابەتەکەی من بدەیت. لەســەر کەم و کووڕیەکانی. بەڵام بەو ڕێگایەی کە من خەڵەتابم و ئەو دوو بڕگە شــێواوە بەهەی تۆ بزانم.

حەزدەکەم ئەوانەی تۆ کە لە ڕۆژنامەکانم کردۆتەوە لای خۆم بهێڵمەوە. خۆزگا بمتوانیایە پیشــانی خوشــکمم بدانایە. بەڵام لەبەرئەوەی پێویســتت پێیــان هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی کە یاداشــتت تیا تۆمارکردوون، لەگەڵ نامەکانمدا زوو بۆتیان ڕەوانە دەکەم.

من لای خۆمەوە وێنایەکی ترم بۆ مێردەکەت هەبوو، لەناو ئەوانەدا کە لە قاوەخانەکەدان مێردەکەت

ئەمین تر، تێگەیشـــتوتر، ئارامتـــر و تاڕادەیەکی زۆریش دیدێکی باوکانەی هەیـــە. هەرچەندە وا دێتە بەرچاو کە بن بڕبێت و ڕەخنە قبوول نەکات. هەڵبەتە نەک تا ئەو ڕادەیەی لەگەڵ ئەو ئاکارانەدا ناکۆک بن کە پێشتر باسم کردن. من بەردەوام ڕێزم لێ گرتووە، بەڵام هیچ کاتێک نە دەرفەت و نە توانای ئەوەم نەبـــوە چاکتر بیناســـم و لەبارەیەوە قووڵ ببمەوە. لێ هاوڕێـــکان بەتایبەتی ماکس برود بە ڕێزەوە لە هاوسەرەکەت دەڕوانن، من هەر کاتێک بیرم لەو کردبێتەوە لە ڕوانگەی ئەو ڕێزلێنانەوە بووە. بەتایبەتی جارێکیان تایبەتمەندیەکی ئەو سەرنجی منی ڕاکێشا، لە قاوەخانەکاندا بەردەوام بۆ تەلەفوون بانگیان دەکرد، دیار بوو دەســـتی یەکێک لە ناواندا بوو کە لە باتی نووســـتن لە پاڵ تەلەفووندا دادەنیشـــێ و وەنەوزدەدات، سەری دەخاتە سەر دەستی کورسیەکە و زوو زوو بۆ تەلەفوون بۆ کردنی لە شوێنەکەی ڕادەپەڕێت. بۆیە ئەم مەسەلەیە باس دەکەم تا بزانیت کە زۆر باش لێی تێگەیشتووم.

**فرانتسکاکەت**

تۆ دەڵێی چی؟ ئایا تا ڕۆژی یەک شەممە نامەیەکم پێ دەگات؟ دەشێت بگات؟ بەڵام ئەم ئارەزووی نامە نووســـینە بێجگە لە شـــێتی چی تر نیە. ئایا تەنیا نامەیەک بەس نیە؟ ئایا تەنیا جارێک زانین کافی نیە؟ ســـەد جار دەڵێم یەک جار بەســـە. بەڵام مرۆڤ پاڵ دەداتەوەو نامەکان دەخواتەوە، گوێ بە هیچ نادات بێجگە لەوەی نایەوێت دەست لەو چێژ وەرگرتنە هەڵبگرێت. میلنا! مامۆستا ئەم خاڵە روون بکەرەوە.

## ئاماژە:

١-پاریـــس کوڕی شـــازادەکانی تەڕوادەبوو، واتا پریام (باوک) و هکوب (دایـــک)ی بوو. پێش لەدایکبوونی پاریس دایکی خەوی دی کە دارێکی ئاگرینی بووە. وا خەوەکەیان بۆ لێکدایەوە کە ئەو منداڵەی دەیبێت شاری تەڕوادە تووشی گێچەڵێک دەکات، بۆیە پاریسیان لە چیای Ida داناو گورگێک شیری دەدایە. شوانێک پاریسی دۆزیـــەوەو بردی بۆ ناو خێڵەکـــەی. لەو کاتەدا لە نێوان خواکانی ئەڵپا، یانی هەرا، ئافرودەیت، ئاتنا لەســـەر سێوی ئاڵتوونی ناکۆکیەک دروست بوو، زیوس فەرمانی دەرکرد پاریس کە پیاو بوو ئەرکی دادوەری لە ئەستۆ بگرێت و خۆی کێ هەڵدەبژێرێ ســـێوەکەی بداتێ. کافکا لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو رووداوە دەکات. خواکانی ئاڵپ بۆ سەرنجڕاکێشـــانی پاریس هەریەکە و هێزێکیان پێ بەخشـــی. هەرا ســـەروەت و سامانی دایە، ئاتنا ئەقڵ و ئافرودەیت جوانترین ژنی پێ بەخشی. پاریس سێوی زێڕینی بە ئافرودەیت بەخشی.

لە دیدی کافکاوە هەرچەندە پاریس کە پیاو بوو و داوەریەکەی لە ئەســـتۆدا بوو، بەڵام ئەوە ژنان بوون کە داوەریی ئەویان دەست نیشان کرد.

٢-moldau رووبارێکە ٢٧٠ مەتر پانە لە بوهیما کە چیکۆسلۆفاکیای کۆنە.

٣-مەبەست وتارەکانی میلنایە.

٤-خاتوو (Bozena nemcova)١٨٢٠-١٨٦٢ نووسەرێکی چیکیە.

## سەرچاوە:

نامەهایی بە میلنا

وەرگێڕانی بۆ فارسی: سیاوەش جمادی

# تیرۆرکردنی غەسان کەنەفانی


غەسان کەنەفانی

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

کاتژمێر دەو پێنج خولەکی ســـەرلەبەیانی ڕۆژی شەممە، ٨ی تەموزی ساڵی ١٩٧٢، هونەرمەندو بیرمەندی تێکۆشەری فەلەستینی «غەسان کەنەفانی» دەرگای ئۆتۆمۆبێلەکەی دەکاتەوە کە لەبەردەم خانووەکەی لە ناوچەی (حازمیەی) بێروت وەســـتابوو، لەبەردەم دەرگای دووەمی ئۆتۆمۆبێلەکەیدا، (واتە دەرگای لای ســـەکن-و-)، «لەمیس حســـێن نجم»کچی خوشکەکەی کە تەمەنی ١٨ ساڵ بوو، ڕاوەستابوو. «لمیس» پێداگری لەسەر ئەوە کردووە دەبێ لەگەڵ «غەسان کەنەفانی» خاڵیدا بڕوات بۆ نوســـینگەی گۆڤاری (الهدف) کە خاڵی سەرنوسەری بووە، دوای ئەوە هەردوکیان پێکەوە دەبێ بڕۆن بۆ بازاڕ تاکو «لمیس» چی پێویستی هەیە بیکڕێت.

«غەسـان کەنەفانـی» هەر هێنـدەی مەکینەی ئۆتۆمۆبیلەکـەی دەخاتەگـەڕ، ئۆتۆمۆبیلەکە تەقینەوەیەکی گـەورە دەتەقێتەوەو دەنگێکی بەرزی لێوەدێتو ئاگری تێبەردەبێ. تەقینەوەکە لەو شـوێنەی ئۆتۆمۆبێلەکە تێیدا ڕاوەستابوو، چاڵێکی گەورەی دروستکرد. هەروەها پەنجەرەکانی ئەو باڵەخانەیەش وردوخاش بوون کە «غەسان کەنەفانی»و هاوسەرە دانیمارکیەکەی «ئانی»و هەردوو منداڵەکەی «فایز»ی ١٠ ساڵو «لەیلا»ی ٦ سـاڵی تێدا نیشـتەجێ بوون. «فایزە»ی خوشکی «غەسان کەنەفانی»و منداڵەکانی کە دانیشتوی کوێت بوون، بە سەردان هاتبوون بۆ لای «غەسان کەنەفانی»و لەگەڵ ئەواندا لە هەمان خانودا نیشتەجێ بوون. «لمیس» یەکێک بوو لە منداڵەکانی خوشکەکەیو لە ڕوداوی تەقینەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەدا گیانی لەدەستدا.

ئاژانسەکانی هەواڵ کە بەخێرایی گەشتە شوێنی ڕوداوەکە، ڕایانگەیاند لێکۆڵەرەوەکان لە شوێنی تەقینەوەکە پارچە کاغەزێکیان دۆزیوەتەوەو وێنەی ئەستێرەی داودی شەش لای لەسەرە کە دروشمی ئیسـرائیلەو لەسەر پارچە کاغەزەکە ئەم پەرەگرافە نوسراوە: (لەگەڵ ڕێزی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە کۆبنهاگن)، ئاماژەکردن بـە کۆبنهاگن، تایبەتەو مانای گاڵتەپێکردن دەگەیەنێت، گاڵتەپێکردن بە هاوسـەرگیری «غەسان کەنەفانی» لەگەڵ کچێکی دانیمارکی. ئەوانەی ئەو تاوانەیان ئەنجامداوە ویسـتویانە بڵێن: کۆبنهاگنی پایتەختی دانیمارک کە «ئانی» وەک ژنو هاودەم داوە بە «غەسـان کەنەفانی»، هەر ئەویشـە فەرمانی مردنی بۆ «غەسـان کەنەفانی» دەرکـردووەو کۆتایی بەژیانی هێناوە.

لە ئەنجامی ئەو تەقینەوەیەدا، لاشـەی «غەسـان کەنەفانی» بووە کوتی ورد وردو لە دەرەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەیو بەوناوەدا پەرتو بڵاوبووەوە، بەشـی هەرە زۆری لاشەی «غەسان کەنەفانی» کەوتە ناو باخچەی تەنیشـت ڕوداوەکە، هەروەها پیاوانی ئاسـایش دەستێکی «غەسان کەنەفانی»یان لە سەربانی خانویەکی تەنیشت ڕوداوەکە دۆزییەوە.

لێکۆڵینەوە ئاشکرای کرد تەقینەوەکە لە ئەنجامی دانانی بڕێکی زۆری تی ئێن تی بووە کە نزیکەی پێنج کیلۆگرام بووە، جگە لەوە قومبەلەیەکی پلاسـتیکی بەسـتراوە بـە گرژزی ئۆتۆمۆبێلەکەوە، ئەمـەش بۆ ئەوەی هـەر هێندەی مەکینەی ئۆتۆمۆبێلەکە کەوتەگـەڕ، قومبەلەکەو تی ئێن تییەکە پێکەوە بتەقنەوە. شـارەزایەک لە بواری تەقەمەنیدا کە لێکۆڵینەوەی لە ڕوداوەکە دەکرد، وتی گەر ئۆتۆمۆبێلەکە لەناو گەراجی ئەو باڵەخانەیەدا بووایە کە «غەسان کەنەفانی» تێیدا نیشتەجێ بوو، ئەوا بڕی تی ئێن تییەکە بەس بوو بۆ ئەوەی هەموو باڵەخانەکە بە تەواوی بڕوخێنێت.

هۆکاری ڕوکەشـی ئـەم تاوانە، ئەو چالاکییـە فیدائییە بوو کە ماوەیەک بـەر لە تیرۆرکردنی «غەسـان کەنەفانی» لە فڕۆکەخانەی (اللد)و لەناوەوەی ئیسرائیل ڕویدا، ئەم چالاکییە ژمارەیەک لە یابانییەکان بەشـداریان تێداکردو بووە هۆی کوژرانی هەندێ لە ئیسـرائیلیەکان. بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، بەرپرسیارەتی ئەم چالاکییەی گرتە ئەستۆی خۆی. «غەسان کەنەفانی» یەکێک بوو لە سـەرکردە ناسـراوەکانی ئەو بەرەیە، هەروەها سەرنوسەری گۆڤاری (الهدف) بوو کە زمانحاڵی بەرەی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بوو.

ئیسـرائیل وەک پیشـەی هەموجارێکی، هەوڵیدا زۆر بە توندیو دڵڕەقانە وەڵامی ئەو چالاکییە بداتەوەو ئەو دروشمە ناسراوەی زایۆنیزم بسەلمێنێت کە دەڵێ: (هەر جولەکەیەک بە سەد عەرەب). لێرەوە جولەکەکان هێرشێکی گەورەیان کردە سەر خواروی لوبنان، پاشان تاوانی کوشتنی «غەسان کەنەفانی»یان ئەنجامدا. «غەسـان کەنەفانی» یەکێک بوو لە هەرە درەوشـاوەترین سـمبولەکانی فەلەسـتین کە لە هەڵوێستو نوسـینە جۆراوجۆرەکانیدا، بە گڕوتینێکی بەهێزەوە، گوزارشتی لە زەرورەتـی ڕزگارکردنی فەلسـتین لە دەسـت زایۆنیـزم دەکرد، بە ڕێگای چەکـداری نەک بە هیچ ڕێگایەکـی دیکە. ئەو لە هەندێ لە نوسـینەکانیدا دەڵێ: (ئەگەر پیاو بیت ئەوا لە چاوتروکانێکدا دەگەیتە عەکا، بەڵام ئەگەر تەنها پەناهەندە بیت، ئەوا نە تۆو تەنانەت نە نەوەکانیشت نایبینن).

سـەبارەت بە ڕوداوی تیرۆرکردنی «غەسـان کەنەفانی»، هاوڕێو دراوسـێکەی «مضر الدادا» کە دانیشـتوی هەمان باڵەخانەیە دەڵێت: (لە شـەوی پێش ڕوداوەکەدا لـە بەلەکۆنەی ماڵەکەیدا ڕاوەسـتابوو، دوو تارمایی بینیوە لە تەنیشـت ئەو خانوەوە دەهاتنو دەچوون کە غەسان کەنەفانی تێدابوو، سـەگەکەم بە توندی دەسـتیکرد بە وەڕین، من پێموابوو ئەو دوو دزە هاتوون (کەپەکانی ئۆتۆمۆبێلەکـە) بدزن، هاوارم لێکردنو ئەوانیش دوورکەوتنەوە)، پاشـان ئەم هاوڕێو دراوسـێیەی «غەسان کەنەفانی» بەردەوام دەبێتو دەڵێ: (من چەند دڵتەنگو خەمبارم، چۆن لەو چرکەساتەدا غەسان کەنەفانی-م بە خەیاڵدا نەهاتووە).

ئەم قسـانەی دراوسـێکەی «غەسان کەنەفانی» بە ڕوونو ئاشـکرایی دەریدەخەن ئەو تاوانەی ئیسرائیل پلانی بۆ داناوە، سیخوڕەکانی ناوەوە جێبەجێیان کردووە، ئەو سیخوڕانەی بە ئازادی لەناو شـاری بێروتدا هاتوچۆیان کردووە. ئاشکرایە «غەسان کەنەفانی» ماوەیەک پێش تیرۆرکردنی، لە ڕێگەی تەلەفۆنو نوسینەوە چەندین هەڕەشەی کوشتنی لێکراوە، وەلێ مەسەلەکەی بەلاوە گرنگ نەبوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو زۆربەی سەرکردەکانی بەرەی ڕزگاریخوازی فەلەستین، لەبەرچاو دیارنەمانو لە ماڵەکانی خۆیان، کە بەشـێوەیەکی باش پارێزرابوو، دوورکەوتنەوە. «غەسان کەنەفانی» بەوەندە وازیهێنـا کە تەنها دەمانچەیەک هەڵگرێت، ئەو پێیوابوو شـەڕکردنی لەگەڵ دوژمنەکەی ڕووبەڕوو دەبێتو پلانێکی چەپەڵی لە تاریکی بۆ کێشراودا تیانابێت. بەڵام «غەسان کەنەفانی» لە وەرگرتنی ئەم هەڵوێسـتەیدا خەتای نییە، چونکە ڕوداوی تەقینەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەی، یەکەم جۆری ڕوداوی تەقینەوەی ئۆتۆمۆبێلە. لەو سـەردەمەدا دیـاردەی تەقاندنەوەی ئۆتۆمۆبێلی بۆمبڕێژکراو لە لوبنان بڵاونەببووەوە، وەک ئەوەی ئێسـتا بڵاوبووەتەوە. ئەسـتەم بوو «غەسان کەنەفانی» خۆی لەو شتە نادیارە بپارێزێت کە هیچ فیکرێکی لەبارەوە نەبوو.

سـەرەڕای ئەوە ئەو کارەی «غەسـان کەنەفانی» جێبەجێی دەکـرد، دەرفەتی ئەوەی پێنەدەدا خۆی بشـارێتەوەو خۆی ونبکات. کاری سـەرەکی ئەو ڕۆژنامەو نوسـین بوو، بەدیاریکراوی کاری ڕۆژنامەوانییەکەی وایدەخوازی ڕۆژانە بڕوات بۆ شوێنی کارکردنی لە گۆڤاری (الهدف) کە سەرنوسەری بوو. ئەو نەیدەتوانی ئەو کارەی لە بارەگایەکی نهێنییەوە هەڵسوڕێنێت، کاری ئاشکراو هاتنوچون بە ئاشکرایی، قەدەرێکی نوسراوبوو بۆ «غەسان کەنەفانی»، ئەمە جگە لەوەی ئەو ئاشکراییە بەشێک

بوو لە سروشـــتی خۆی. «غەســـان کەنەفانی» هونەرمەندێکی دڵ گەرمو عەقڵ گەرم بوو، حەزی لە ڕوبەڕووبونـــەوەو گفتوگۆو تێکەڵبونی بەشـــێوەیەکی بەرفراوان بە خەڵک بوو. خاوەنی کاراکتەرێکی سەرنجڕاکێشو خۆشەویست بوو. لەبەر هەموو ئەوانە، بەشی زۆری کاتەکانی شەووڕۆژی بە ژمارەیەک لە ئازیزانو خۆشەویســـتانی دەورەدرابوو. لێرەوە ئەم جـــۆرە کارەکتەرە زەحمەت بوو بتوانێت خۆی بشارێتەوەو بە نهێنی بمێنێتەوە، لەبەرچاو ونببێت یان بە دزیو وریاییەوە هەڵسوکەوت بکات.

ســـاڵی ١٩٥٩ هەلی ئەوەم بۆ ڕەخســـا «غەســـان کەنەفانی» لە چاخانەی (هاڤانا)ی ناسراو لە دیمەشق ببینم، «غەسان کەنەفانی» لەو کاتەدا لە کوێت هەم وانەی دەگوتەوەو هەم لە ڕۆژنامەشدا کاری دەکرد، «غەســـان کەنەفانی» لەو ساتەوەختەدا هێشتا ئەو ناوبانگەی بەدەستنەهێنابوو کە دواتر بەدەســـتیدەهێنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا لە ناوەندی ڕۆشـــنبیرانو ئەدیباندا ناسرابوو. من کاتێ لە هاوینی ئەو ســـاڵەدا بۆ یەکەمجار ئەوم بینی، تەمەنم ٢٥ ســـاڵ بوو، ئەویش تەمەنی تەنها ٢٣ ســـاڵ بوو، لەیەکەم بینینمدا هەســـتمکرد کارەکتەرێکی چالاکو زیرەکو ڕۆشـــنبیرو بلیمەتە. ئـــەو گەرچی تەمەنی کەم بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشـــدا ژمارەیەکی زۆر لە گەنجانی ئەدەبدۆســـتو تێکۆشـــەرە سیاســـییەکانی لەدەوری کۆببونەوە، ئەو تێکۆشەرە سیاســـیانەی بە شوێن ڕێگایەکی ئیشـــکردندا دەگەڕان، تاکو بتوانن لێیەوە بەشـــداریو هاوکاری ڕزگارکردنـــی نەتەوەکەیان بکەن لە هەموو بارودۆخێکی خراپی چەوساندنەوەو لە ئیمپریالیزم.

دوای ئەوە «غەسان کەنەفانی»م زۆر بینی، لەنێوان منو ئەودا هاوڕێیەتیەکی تۆکمەو پتەو دروست بوو، تا ڕۆژی کوشتنەکەی بەردەوامبوو. بیرمە کاتێ ساڵی ١٩٦٣ بۆ یەکەمجار سەردانی بێروتم کردو لە ئوتێلێک دابەزیم، ئەو یەکەم کەس بوو لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا پەیوەندی پێوەکردم، من پێموابوو ئەو بۆ ئەوەی بمبینێ، بەیانی دێت بۆلام، بەڵام لە تەلەفۆنەکەداو بە شێوازە یەکلایکەرەوەکەی خۆی پێـــی وتم: (لە ئوتێلەکە چاوەڕوانم بکە، هەر ئێســـتا دەگەمە لات)، پـــاش ماوەیەکی کورت هاتو بردمـــی بـــۆ ماڵەوەیان. لە ماڵەوە هۆڵێکم بینی وەک ئەوەی هۆڵی وانە وتنەوەی یەکێک لە زانکۆکان بێت، ژمارەیەک لە ئەدیبو بیرمەندو ڕۆژنامەنوســـانو مامۆســـتایانی زانکۆو چالاکوانە سیاسییەکان ئامادەبوون. «غەســـان کەنەفانی» لەنێو ئەو ئاپۆرە گەورەیەدا، چەقی گفتوگۆو مشتومڕەکان بوو، ئەو بزوێنەری فیکرو بیروڕا جیاوازجیاوازەکان بوو. ئیدی زۆربەی بینینەکانی دیکەمان، لەنێو ئەو کەشـــوهەوا پڕ لە هاوڕێیو خۆشەویستانیدا بوو، لەنێو ئەو کەســـانەدا بوو کە کاراکتەری «غەسان کەنەفانی» پڕ جۆشو خرۆش، ڕایکێشابوونە ناو چوارچێوە مرۆڤایەتیەکەیەوە.

«غەسان کەنەفانی» هەر لە گەنجییەوە، دووچاری نەخۆشی شەکرە ببوو، پلەی نەخۆشییەکەی ئاســـایی یان کەم نەبوو، بگرە تا ئاســـتێکی زۆر بەرزبوو. ئەم مەســـەلەیە لە کاراکتەری «غەسان کەنەفانی»دا سەیر بوو، چونکە ئەو نەخۆشییە قورسە پێویستی بەوە بوو «غەسان کەنەفانی» لە هەڵسانو دانیشتنو جووڵەو چالاکیدا، پەیڕەوی سیستمێکی ورد بکات، ئەو دەبێ زیاتر دوورەپەرێزو گۆشـــەگیربێت، نەک بەردەوام لە جووڵەو کارکردندا بێت. وەلێ «غەســـان کەنەفانی» ڕازینەدەبوو خۆی ڕادەســـتی نەخۆشییەکەی بکات، بگرە شـــێلگیرانە ڕوبەڕووی دەوەستاو تەحەدای دەکرد. ئەو

بەدرێژایی ژیانیو بێ ویســـتی خۆی، پزیشـــکی خۆی بوو، هەموو ڕۆژێ دەرزیەکی (ئەنســـۆلینی) لەخۆیـــدەداو بێ ئـــەو دەرزییە نەیدەتوانی بژی. ئەگەر ئەو دەرزییـــەی لەخۆی نەدایە، دەبورایەوەو تاکو دەرزیەکەی لێنەدرایە چاکنەدەبووەوەو نەدەهاتەوە هۆش خۆی. «غەســـان کەنەفانی» سەبارەت بەم نەخۆشـــییەی وتویەتی کە دەزانێ بەهۆی ئەم نەخۆشـــییەوە لە تەمەنێکی زودا دەمرێت، بۆیە بەوپەڕی توانایەوە کاردەکات، تاکو گوزارشـــت لەو فیکرو هەســـتو سۆزە زۆرانە بکات کە لەناو دڵو عەقڵیدایەو دەیانەوێت بێنەدەرەوە، ئەو لەم بارەیەوە دەڵێ: (هەمیشە هەست بە ماندوبونو شەکەتی دەکەم، وەلێ ناڕۆم بخەوم، چونکە هەستێکی پەنهان هەیە پێم دەڵێ ئەوانەی ئێستا دەخەون، ئیدی هەرگیزاو هەرگیز ناتوانن هەستنەوە).

وەلـــێ نەخۆشـــییەکەی وایلێنەکرد ببێتە کەســـێکی بێزار یان ڕەشـــبین، وەک ئـــەوەی لای ئەو کەســـانە ڕودەدات کە دوچاری نەخۆشییەکی بێچارەسەر دەبن. بگرە تەواو بە پێچەوانەوە، «غەسان کەنەفانـــی» ئامێزی بۆ ژیان والآکردبوو، ژیانی زۆر خۆشدەویســـت. لـــە کارەکتەریدا هیچ حەزێکی بۆ گۆشـــەگیریو دوورەپەرێزیو بێزاری نەبوو. ژیانی «غەســـان کەنەفانی» ژیانێکی ئاسانو سادە نەبوو، بگرە ژیانێکی ســـەختو دژوار بوو. لە ٩ی نیســـانی ســـاڵی ١٩٣٦ لە (عـــەکا) لەدایکبووە، چەند ڕۆژێک دوای لەدایکبونی، شۆڕشـــی فەلەســـتینی کە بە شۆڕشـــی ساڵی ١٩٣٦ ناسراوە بەرپا دەبێت. دەتوانین شۆڕشی ساڵی ١٩٣٦ بە (یەکەم ڕاپەڕینی فەلەستینیەکان) ناوبنێین. ئەم شۆڕشە وێنەیەکی زیندوی ئەو ڕاپەڕینەیە کە هەنووکە لە غەزەو بەرەی ڕۆژئاوادا لەئارادایە. شۆڕشـــی ١٩٣٦ دژ بـــە ئینگلیز بەرپاکرا، چونکە لە پابەندبوونیان بەرامبەر بە فەلەســـتینیەکان پاشـــگەزبونەوەو دەرگاکانیـــان لەبەردەم کۆچبەرە جولەکەکاندا کردەوە. ئینگلیـــزەکان چەندین جار بەڵێنی ئەوەیان دابوو کۆچکردنی جوولەکەکان کەمکەنەوەو سنورداری بکەن، بەڵام هەرگیز پابەندی ئەو بەڵێنانەیان نەبوون. بگرە پابەندبونی ڕاســـتەقینەیان کارکردن بوو بۆ دروستکردنی نیشتیمانێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکە لەسەر خاکی فەلستین، وەک ئەوەی لە بەڵێنامەی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز «بەلفۆر» لە ســـاڵی ١٩١٧دا هاتووە. ئینگلیزەکان سووربوون لەسەر ئەوەی دەوڵەتێکی جوولەکە، لەسەر لاشەی عەرەبی فەلەســـتینی دروســـت بکرێت، لەلای ئینگلیزەکان بەرژەوەندییـــە دوورو گرێدراوەکەیان بە جولەکەکانەوە، گرنگتربوو لە بەرژەوەندیان بە عەرەبی فەلەســـتینەوە. لێرەوە شۆڕشی ساڵی ١٩٣٦ هەڵگیرســـا کە قوربانییەکی گەورەی پێشکەش کردو بە توندی دەســـەڵاتی ئینتیدابی بەریتانیای هەژاند، ئەگەرچی دەرئەنجامە کۆتاییەکانی شـــۆڕش نەیتوانی ئامانجـــە تەواوەتیەکانی عەرەب لەو کاتوســـاتەدا، بەدەســـتبێنێت. ئەمەش بە هۆی ئەو پیلانە بەرفراوانەوە بوو کە لە هەموو هێزەکانو لە هەموو لایەکەوە دژ بەم شۆڕشە ڕێکدەخرا.

ئالەم ســـاڵەدا کە بە توندوتیژیو شۆڕشـــی سەرتاسەری تاوی ســـەندبوو، «غەسان کەنەفانی» لـــە عەکا لەدایکدەبێتو پاشـــان دەگوازێتەوە بۆ یافا، خوێندنی ســـەرەتایی لـــە قوتابخانەیەک لە قوتابخانەکانی (الارســـالیات)ی فەرەنسی تەواو دەکات. ساڵی ١٩٤٨، واتە ئەو ساڵەی ئیسرائیل بە شـــێوەیەکی فەرمی دروستبوو، «غەسان کەنەفانی» لەگەڵ خێزانەکەی کە لە دایکو باوکیو حەوت

برا پێکهاتبوو، دەڕۆن بۆ ناوچەی سەیدا لە باشوری لوبنان. دواتر خێزانەکە دەڕوات بۆ دیمەشق، «غەسان کەنەفانی» لە خوێندنەکەی لە قوتابخانەیەکی ئێواران بەردەوامدەبێت تا لە ساڵی ١٩٥٤ بڕوانامەی ناوەندی وەردەگرێت. لەکاتی خوێندنیداو بۆ ئەوەی یارمەتی بژێوی خێزانەکەی بدات، لە هەندێ لە کارگەکانو چاپخانەکاندا کاریکردووە، هەروەها لە چادرگەی پەناهەندەکاندا وانەی وتووەتەوە. ژیانی لەم قۆناغەدا تابڵێی سەختو دژوار بووە، ڕەنگە ئەم قۆناغەی ژیانی هۆکاری نەخۆشییە زووەکەی بووبێت. «غەسان کەنەفانی» ساڵی ١٩٥٦ بە مەبەستی ئیشکردن گواستیەوە بۆ کوێت، لەوێ کاری وانەوتنەوەو ڕۆژنامەوانی ئەنجامداوە، تاکو ساڵی ١٩٦٠ لە کوێت ماوەتەوە. پاشان لە بێروت دەگیرسێتەوەو لە گۆڤاری (الحریه)و ڕۆژنامەی (الانوار)و (المحرر) کاردەکات. دواتر گۆڤاری (الهدف) دادەمەزرێنێتو تاکو ڕۆژی تیرۆرکردنەکەی سەرنوسەری بوو.

«غەسان کەنەفانی» خانمی دانیمارکی «ئانی» هێنا، ئەم خانمە هاتبوو بۆ سوریا تاکو بارودۆخی پەناهەندەکان بەسەربکاتەوە، لەوێ «غەسان کەنەفانی» دەناسێتو داوای لێدەکات بۆ زانینی بارودۆخی ڕاستەقینەی پەناهەندەکان لەناو خێوەتگاکاندا یارمەتی بدات، «غەسان کەنەفانی» پێی دەڵێ: (پێویستە یەکەمجار کێشەی فەلەستین بناسیت، پەناهەندەکانی ناو خێوەتگاکان، کۆمەڵێ ئاژەڵ نین لە باخچەیەکدا تەنها بۆ تەماشاکردن دانرابن، بەڵکو ئەوانە بەرهەمو سیمبولن بۆ کێشەیەکی گەورەتر، بۆیە ناکرێت لە بارودۆخی پەناهەندەکان تێبگەیت، بەبێ تێگەشتن لە کێشە بنەڕەتییەکە).

«ئانی» پەرۆشی کێشەی فەلەستین بوو، بە شێوەیەکی ورد لێیتێگەشتبوو. کاتێ «غەسان کەنەفانی» پێشنیاری هاوسەرگیری خستەبەردەمی، یەکسەر ڕازیبوو. «ئانی» دوای ئەوەی بووە هاوسەری «غەسان کەنەفانی» ڕۆڵێکی باشی گێڕا لە بانگەشەکردن بۆ کێشەی فەلەستین لە ئەوروپای ڕۆژئاواو بەتایبەتی لە دانیمارک. «ئانی» لە زووەوە دەیویست لە ڕێگەی ئەوروپاوە، دەستی بگاتە ئەدەبی بەرگری عەرەبی لە خاکی فەلەستینی داگیرکراو. ئەمە یارمەتی «غەسان کەنەفانی» دا یەکەم کتێبی عەرەبی بەرگری لە فەلستینی داگیرکراو) بڵاوبکاتەوە، ئەم کتێبە ساڵی ١٩٦٦ دەرکەوت، لە یەکەمین لاپەڕەکانیدا، ئاماژە بە ناوەکانی «مەحمود دەروێش»و «سەمیح قاسم»و «تۆفیق زیاد»و ئەدیبەکانی دیکە کراوە، ئەوانەی تاکو ئەو ساتەوەختە لە جیهانی عەرەبیدا نەناسرابوون.

«غەسان کەنەفانی» لەناوەڕاستی شەتەکانی سەدەی بیستەمدا، دوچاری ئەزمونێکی سۆزداری توند بوو، لایەنی دووەمی ئەم ئەزمونە سۆزدارییە، خانمێکی ئەدیبی ناسراوە، نامەوێ ئاماژە بە ناوی بدەم، چونکە ئەو هەنوکە بووەتە هاوسەری کەسێکی دیکەو منداڵی هەیە. ئەم ئەزمونە سۆزدارییە توندە هێندەی نەمابوو «غەسان کەنەفانی» وێڵو سەرگەردان بکات، بەڵام «غەسان کەنەفانی» بە هێمنیو ئازاییەوە ڕوبەڕووی ئەم ئەزمونە سەختو دژوارە بووەوە، تاکو بە سەلامەتی کۆتاییپێهات. من ئاماژەم بەم ئەزمونە نەدەدا، گەر ئەو کاریگەریە ئەدەبییەی لە ژیانی «غەسان کەنەفانی»دا بەجێنەهێشتایە. «غەسان کەنەفانی» سەبارەت بەو ئەزمونەی دەیان وتاری ویژدانی

پڕ جۆشوخرۆشو پڕ ڕاستگۆیی، لە پاشکۆی هەفتانەی ڕۆژنامەی (الانوار)ی لوبنانیدا نوسیوە.

«غەسـان کەنەفانی» ئەو نوسـینە ویژدانیانەی لەژێر ناوێکی خواسـتراودا دەنوسی، بە ناوی «فارس فارس»ەوە دەینوسی. ئەم نوسینە جوانانە کە وەسفی هەستوسۆزە گڕگرتووەکەیو ویژدانە عاشقەکەی دەکات، ئەوەندەی من ئاگاداربم، تاکو ئێستا کەسێک نەهاتووە لەکتێبێکدا کۆیانبکاتەوە، گەرچی شایەنی ئەوەن لەکتێبێکدا کۆبکرێنەوە. ئەو نوسینانە نمونەی جۆرێکە لە ئەدەبی زاتی کە پڕە لە جوانیو ڕاستگۆیی، ئەوە نمونەیەکە لە ئەدەبی «غەسان کەنەفانی»دا ناسراو نییە. «غەسان کەنەفانی» لە ئەدەبەکەیدا پەرۆشـی (بابەتیبوون) بووە، واتە دوورکەوتنەوە لە ئەزمونە کەسییە ڕاسـتەوخۆکانو خۆتەرخانکردن بۆ کێشەی فەلەستین بە هەموو لایەنە جیاوازەکانییەوە. ئەو خۆی بۆ گوزارشتکردن لە هەستوسۆزە تایبەتەکانی تەرخان نەکردبوو، تەنها لەو چەند بەشە ویژدانییەدا نەبێت کە ئاماژەمان پێدا.

گەرچی «غەسان کەنەفانی» هەوڵدەدا ئەوە ڕەتبکاتەوە کە شیعری نوسیوە یان بایەخی بە شیعر داوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ئەم بەشە ویژدانییانە لەلایەکی دیکەوە، ئەو شاعیریەتە ئاشکرادەکەن کە لە دڵو دەروونو بەهرە ئەدەبییەکەیدا پەنهانبووە. «غەسان کەنەفانی» لەمبارەیەوە دەڵێ: (من شـیعرم خۆشدەوێ، شیعر دڵخۆشم دەکاتو دەمهەژێنێت، بەڵام هەوڵمنەداوە ببمە شاعیر تەنها ئەو کاتە نەبێت کە منداڵ بوومو شیعرێکی دڵداریم نوسیو لەبیرم نەماوە، بەڵام هەستدەکەم شیعرێکی ترسناک بوو، چونکە ئەو کچەی لەدەستدام کە بۆم خوێندەوەو بۆ ئەوم نوسیبوو).

لەگەڵ ئەم دانپیانانەی «غەسـان کەنەفانی»، کەچی ڕۆحی شـیعر، لەو بەشە ویژدانیانەی بە نـاوی «فارس فارس»و لە میانەی ئەزمونە سـۆزدارییە توندەکەی کە لە شەسـتەکانی سـەدەی بیستەمدا تێیدا ژیا، زۆر بە ڕوونو ئاشکرایی دیارە. «غەسان کەنەفانی» کاراکتەرێکی پڕ بەرهەمی جۆراوجۆر بوو، بەشێوەیەکی بەرچاو بەرهەمەکانی زۆربوون، ڕۆژنامەنوسێکی چالاکو سەرکەوتوبوو، وتارو کورتە چیرۆکو شـانۆنامەی دەنوسـی، توانی ببێتە نوسەری ڕۆمانو لە پێشەوەی ڕۆماننوسە عەرەبـەکان بێت. ڕەنگە بە هۆی بەهرەکەیو ڕاسـتگۆیی تێڕوانینەکانـیو قووڵی بیرکردنەوەی، تا ڕۆژی ئەمڕۆش، لەلایەنی بەهاو گرنگییەوە، یەکەم ڕۆماننوسی فەلەستینی بێت.

«غەسـان کەنەفانی» سەرەڕای هەموو ئەوانە، وێنەکێشـیش بووە، ڕەنگە زۆرکەس نەزانن ئەو بە پەرەموچەکەی زۆربەی کارە ئەدەبییەکانی خۆی وێنەکێشـاوە. هەر ئەو بوو گەورە هونەرمەندی فەلەسـتینی «ناجی العلی» پێشـکەش بە ژیانی ڕۆشـنبیریو ڕۆژنامەگەری نیشتیمانی عەرەبی کرد. ئەمەش لە ڕێگەی لاپەڕەکانی گۆڤاری (الحریە)وە بوو کە «غەسـان کەنەفانی» لە سـەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمدا سەرپەرشتی دەرچوونی دەکرد. وێنەکانی «ناجی العلی» لە گۆڤاری (الحریە) بە هاندانو پشتگیریکردنی «غەسان کەنەفانی»، سەرەتای دەستپێکردنو ناسینی «ناجی العلی» بوو، تاکو گەشتە لووتکەی سەرکەوتن. وەلێ مەسەلەکە دواجار لە ساڵی ١٩٨٧و لە لەندەن بە تیرۆرکردنی «ناجی العلی» کۆتاییهات، بەمەش «ناجی العلی» لەگەڵ «غەسـان کەنەفانی»دا لە هەمان چارەنوسو لە هەمان تراژیدیای کۆتاییدا هاوبەشن.

سـەبارەت بە فرەیی «غەسـان کەنەفانی» لە بەرهەمدا، لە ڕۆژنامەوە بۆ وێنەکێشان بۆ کورتە چیرۆک بۆ ڕۆمان بۆ شـانۆ، لەم بارەیەوە «غەسان کەنەفانی» گەواهیدنامەیەکی بایەخدار دەنوسێو تێیـدا دەڵێ: (ئامۆژگاری هاوڕێکانم تابێت زیاددەبێت بەوەی ئەوەندە بایەخ بە کاری ڕۆژنامەوانی نـەدەم، چونکـە کاری ڕۆژنامەوانی لە دواجـارد–وەک ئەوەی ئەوان دەڵێن– توانـا هونەریەکەم بۆ نوسینی چیرۆک لەناودەبات. بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە دەڵێم من لەم لۆژیکە تێناگەم، ئەمە هەمان ئەو لۆژیکی ئامۆژگاریکردنەیە کە لە قوتابخانەی ناوەندی گوێم لێدەبوو: (واز لە نوسـین بێنەو بایەخ بە تەندروستیت بدە)، ئایا من بە ڕاستی مافی هەڵبژاردنم هەبوو لەنێوان قوتابخانەو سیاسەت یان لەنێوان نوسینو تەندروستی، تاکو ئێستا مافی هەڵبژاردنم لەنێوان ڕۆژنامەو چیرۆکدا هەبێت...من دەمەوێت شتێک بڵێم، هەندێجار دەتوانم بە نوسینی هەواڵی سەرەکی لە ڕۆژنامەی (الغد)دا بیڵێم، هەندێجاری دیکە بە نوسـینی سـەروتار یان بە داڕشـتنی هەواڵێکی بچوک لە لاپەڕەی کۆمەڵگادا دەیڵێـم. بەڵام هەندێجاری دیکە هەیە ئەوەی دەمەوێـت بیڵێم، تەنها دەتوانم لە ڕێگەی چیرۆکەوە بیڵێم. ئەو هەڵبژاردنەی قسـەی لەسەر دەکەن، لای من بوونی نییە. ئەمە یەکێک لە مامۆستاکانمم بیردەهێنێتەوە کە زمانی عەرەبی پێدەوتین، ئەو مامۆسـتایە لەسـەرەتای هەموو ساڵێدا داوای لە قوتابییەکانی دەکرد بابەتێکی داڕشـتن بنوسن، بابەتی باش لای ئەم مامۆستایە ئەمەبوو: کامیان بە باش دەزانی، ژیانی لادێ یان ژیانی شـار؟ مامۆسـتاکە ئاگاداری ئەوە نەبوو بەشـی هەرە زۆری قوتابییەکان لە خێوەتگادا دەژیان، نە لە گوندو نە لە شار نەدەژیان).

ئەمە بوو «غەسـان کەنەفانی» سـەبارەت بە فرەیی لە چالاکییە فیکریو هونەریەکانیدا وتی، «غەسـان کەنەفانی» لێرەدا ڕاستگۆیە لە لێکدانەوەی هەڵوێستی. چونکە ئەو خاوەنی کێشەیەکی گەورەو زیندوو دەوڵەمەندە بە ڕووداوە ڕۆژانەییە بەردەوامەکانی. کێشەکەی کە گوزارشتی لێدەکردو خۆی بە بەشـێک لەو کێشـەیەو بە بەرهەمی ئەو کێشەیە دادەنا، کێشـەیەکی زهنی پەتی نەبوو، تاکو لەپێناو گوزارشـتکردن لێی بە شـێوازێکی دیاریکراو یان لە تەنها شێوەیەکی هونەریدا، خۆی قەتیسبکات. کێشەکە لای «غەسان کەنەفانی»کێشەیەکی سەرەکیو بنەڕەتی بوو، بەڵام ئامرازەکانی گوزارشـتکردن لەو کێشە، جۆراجۆرو هەمەڕەنگ بوو. ئەوەی لەم بوارەدا بەسودبێت، گونجاوو باشە. «غەسـان کەنەفانی» وەک سـەرکردەیەک وابوو لە جەنگێکی سـەربازیی گەورەدا، بۆ سەرکەوتن لە جەنگەکەیداو بەدیهێنانی تەواوی ئامانجەکانی، هەموو چەکێکی ئاسـمانیو دەریاییو وشـکانی بەکاردەهێنا.

بەدڵنیاییەوە ئەم فرە ڕەنگییە گەورەیە لە چالاکییە فیکریو هونەرییەکانی «غەسان کەنەفانی»دا، هەندێکجـار بووەتە هۆی پەلەکـردنو کرچوکاڵی لە هەندێ لە بەرهەمـە ئەدەبییەکانیدا. کۆمەڵێ لـە ڕەخنەگـران تێبینی ئەوەیان کـردووە، بەتایبەتی لە کۆمەڵە چیرۆکی (دەربـارەی پیاوەکانو تفەنگـەکان) کە سـاڵی ١٩٦٨ لە بێروت بڵاوکراوەتەوە. وەلێ هەر تێبینییەک سـەبارەت بە لاوازی هەندێ لە بەرهەمەکانی «غەسان کەنەفانی» هەبێت، هیچ شتێک لە حەقیقەتی سەرەکی ناگۆڕێت، ئەو حەقیقەتەش ئەمەیە: بەشی زۆری بەرهەمە ئەدەبییەکانی «غەسان کەنەفانی» پڕە لە قووڵیو

بەهرەی ڕاســـتەقینەو ڕەسەن، ئەمە جگە لە پابەندبونە ڕاســـتگۆکەی بە گوزارشتکردن لە کێشەی فەلەستینو تراژیدیای مرۆڤی فەلەستینی لە خێوەتگاکانو لە خاکی داگیرکراوو لە مەنفا کە مرۆڤە فەلەســـتینیەکان لە بارودۆخێکی ســـەختو ناهەموارداو دوور لە خاکو نیشـــتیمانەکەیان، بەشوێن پەیداکردنی بژێوی ژیاندا دەگەڕێن.

لە ئەدەبی «غەسان کەنەفانی»دا سێ ڕۆمانی سەرەکی هەیە کە بە شاکارەکانی ڕۆمانی عەرەبی هاوچەرخ دادەنرێنو بریتین لـــە: (پیاوانی خۆر)، (ئەوەی بۆتان ماوەتەوە)، (گەڕانەوە بۆ حەیفا). لەم ڕۆمانانەدا بەهرەی «غەسان کەنەفانی» بۆ دروستکردنی کارەکتەرو هەڵوێستو کەشوهەوایەکی خەیاڵی، زۆر زیندوو جوان دەردەکەوێت. «غەســـان کەنەفانی» هەر لەم ڕۆمانانەدا چارەســـەرێکی نایاب بۆ دوو کێشـــەی ســـەرەکی دەخاتەڕوو، کێشـــەی یەکەم بریتییە لە پابەندبوون بە کێشەی گشـــتییەوە، بـــێ قوربانیدان بە جوانی هونەرو سەرنجڕاکێشـــانەکانی. کێشـــەی دووەم بریتییە لە خولقاندنـــی کارلێکێکی زیندوو لەنێوان ڕیالیزمو ســـیمبولیزمدا. ئەگەر ڕۆمانە نایابەکەی (پیاوانی خۆر) وەک نمونەیەک لەســـەر بەدیهێنانی هاوســـەنگییەکی ڕاســـت لەنێوان کێشەو هونەرو لەنێوان واقیـــعو ســـیمبول وەربگرین، ئەوا هەموو ئـــەو لایەنە وردانە دەدۆزینەوە کە پێویســـتە لە کارێکی هونەری سەرکەوتودا هەبێت. ڕۆمانەکە وێنەیەکی ڕاستگۆو دڵڕەقانەو بریندارکەری واقعی فەلەستین پیشاندەدات، هەروەها وێنەیەکی وردی نەهامەتیو کارەساتەکان پیشاندەدات.

بە شـــێوەیەکی ڕەمزی جوانو نایاب ئاماژە بۆ ئەوە دەکات چارەنوسی فەلەستین ناگۆڕدرێت گەر مرۆڤە فەلەســـتینییەکان خۆیان رادەســـتی ئێشوئازارەکانیان کردو ڕاهاتن لەسەر ئەوەی لەگەڵیدا بژین یان لەگەڵیدا هەڵبکەن. ئەگەر فەلەســـتینیەکان، ئەوانەی لە ڕۆمانی (پیاوانی خۆر) ئاماژەیان پێکراوەو لەناو تانکی ئۆتۆمۆبێلێکدانو دەیانەوێ بچنە ناو کوێت، ئەو فەلەســـتینیانە نەکێشن بە دیواری تانکییەکەداو خۆیان ئاشـــکرا نەکەنو ڕازی نەبن بەوەی لە گەرماداو لەناو تانکییەکەدا بمرن بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکەن، مەحاڵە ڕزگاریان ببێت.

ڕۆمانەکە بەسەرهاتی سێ فەلەستینی دەگێڕێتەوە، ئەم سێ فەلەستینیە لەبەر ئەوەی ڤیزەی چونە ژورەوەیان بۆ کوێت پێ نییە، لە ترسی ئەوەی لەسەر سنور ڕێگریان لێنەکرێت، هەوڵدەدەن خۆیان لەناو تانکی ئۆتۆمۆبێلێکدا بشـــارنەوەو لە بەسرەوە بچنە ناو کوێت. ئەو سێ فەلەستینیە خەونیان بەوەوە دەبینی بڕۆن لە کوێت ئیشـــیان دەســـتکەوێت تاکو پێی بژینو یارمەتی خێزانەکانیشـــیان بدەن کە لە دوای خۆیانەوەو لە خێوەتگاکاندا بەجێیانهێشـــتوون. بەڵام شـــۆفێری ئۆتۆمۆبێلەکە لە ڕایکردنو تەواوکردنی ڕێوڕەســـمی چونەژورەوەی سەر سنور لەکاتو ساتی خۆیدا دوادەکەوێت، بۆیە هەرسێ فەلەستینیەکە لەبەر شاڵاوی گەرمای ناو تانکییەکە دەسوتێن. شۆفێری ئۆتۆمۆبێلەکە کاتێ بە کارەســـاتەکە دەزانێ هـــاوار دەکات: (بۆچی لەدەرگای تانکییەکەیان نـــەداوە؟ بۆچی؟ بۆچی؟). ئەمە هەمان هاواری «غەســـان کەنەفانی»یە کە لە هەموو ئەدەبەکەیدا هەیەو سســـتیو بێدەنگی ڕەتدەکاتـــەوە، بە هەموو هێزییـــەوەو لەپێناو ڕزگاربوونو ســـەرفرازیدا، داوای هاتنەدەنگو لێدانی دەرگای هەموو تانکییەکان دەکات.

گرنگترین کارەکانی «غەسان کەنەفانی» لە کورتە چیرۆکدا، بریتییە لە هەردوو کۆمەڵەی: (مردنی قەرەوێڵەی ژمارە ١٣) ساڵی ١٩٦٢ بڵاوکراوەتەوە، (خاکی پرتەقاڵی خەمبار) ساڵی ١٩٦٣ بڵاوکراوەتەوە. هەرچی بواری شانۆیە، ئەوا چەندین کاری هەیە، گرنگترینیان شانۆگەری (دەرگا)یە کە دەوروبەری ساڵی ١٩٦٤ بڵاوکراوەتەوە لەگەڵ شانۆگەری (کڵاوی پێغەمبەر) کە ساڵی ١٩٦٧ نوسیویەتی، بەڵام تەنها دوای شەهیدبونی بڵاوکرایەوە. گرنگترین لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەتی لەسەر شیعر لە خاکی داگیرکراودا، لەگەڵ کتێبەکەی دەربارەی ئەدەبی زایۆنیزم، بەپێی زانیاری من لە کتێبخانەی عەرەبیدا ئەوە یەکەم کتێبە لەو بوارەدا.

«غەسان کەنەفانی» کاراکتەرێکی مرۆڤانەو ئەدەبی تابلێی قووڵو چالاک بوو. ئەو گەرچی ژیانێکی کورت ژیاو لە ٣٦ ساڵ تێپەڕی نەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ژیانە کورتەی بە ئێشوئازارو خۆشییەوە، بە تێکۆشانو داهێنانەوە بردەسەر. کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر سەردەمەکەی هەبوو، ئەم کاریگەرییەی لە ڕێگەی کارە هونەرییەکانییەوە، بۆ سەدەکانی دیکەو نەوە تازەکان بەردەوام دەبێت.

## سەرچاوە:

کتێبی عباقرە ومجانین، نوسینی رجاء النقاش، لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی ئەهرام بۆ وەرگێڕانو بڵاوکردنەوە، قاهیرە.



# وێستگەکانی سەردەم

• **چایخانەکانی پاریس.. لانکەی بزوتنەوە ئەدەبییەکان لە جیهاندا**

لە عەرەبییەوە: ڕەهەند

• **لامارتین.. لە سیاسەتەوە بۆ ئەدەب**

لە عەرەبییەوە: سەردەم

• **خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی ئیسلامی بەجیهانیکراو**

لەئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

• **پاشان ڕیشم تاشی.. ئەزمونی نامۆ بوونم لە گروپە ئیسلامییەکان**

لە عەرەبییەوە: سەردەم

• **لەگەڵ تۆڵستۆیدا**

لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

# چایخانەکانی پاریس..
# لانکەی بزوتنەوە ئەدەبییەکان لە جیهاندا

لە عەرەبییەوە: ڕەهەند

ئەو ڕۆژگارە بەسەرچوو، «ئەندرێ بریتۆن» لە چاخانەکانی پاریسدا دانیشێتو بەیاننامەکانی دەربکاتو هەوادارانیشی لە دەوری کۆببنەوە. یان «جان پۆل سارتەر» لەگەڵ هاوڕێکەی «سیمۆن دی بۆڤار» لەسەر مێزێکی بچوک لە چاخانەی (فلۆر) یان (دی ماگۆ) دانیشنو کتێبەکانیان دەربارەی وجودیەتو ڕەگەزەکەی دی بنوسن. هەندێ لەو چاخانانە نەماونو هەندێکی دیکەیان لەبەرامبەر ڕۆژگاردا خۆی ڕاگرتووە. ساڵی ٢٠٠٩ لە پاریس، داخستنی نزیکەی دوو هەزار چاخانەی بەخۆیەوەبینی. لەکاتێکدا کۆی چاخانەکانی پاریس لە ساڵی ١٩٦٠ دووسەد هەزار چاخانە بووە، کەچی ئێستا ئەو ژمارەیە پاشەکشەی کردووەو تەنها سی هەزار چاخانە ماونەتەوە.

ڕەنگە یەکێک لە سیما دیارەکانی پایتەخی فەرەنسا، بڵاوبونەوەیەکی چڕی ئەو چاخانانە بێت کە لەسەر شەقامو کوچەو کۆڵانە جیاواز جیاوازەکانیدا بڵاوبونەتەوە. ئەمەش زیندویەتیەک بەو شارە دەدات کە لە سەرجەم شارەکانی دیکەی جیادەکاتەوە. چاخانە دیمەنێک لە دیمەنە دانەبڕاوەکانی پاریسو لە ژیانی پاریسییەکانو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیانو کەلتوورو مێژویان پێکدەهێنێت، چونکە چاخانە هەر لە سەدەی هەژدەهەمەوە، لەگەڵ پێشکەوتنە سیاسیو فیکریو کۆمەڵایەتیەکانیاندا هەڵیکردووە. هەر چاخانەیەک لەم گەڕەک یان لەو گەڕەکی پاریس، سەربوردەی تایبەتی خۆی هەیە کە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە جۆرو کەسێتی ئەوانەی سەردانی دەکەن. چاخانەی (لوبرۆکوب) کە یەکەم چاخانەیە، لە سەدەی هەژدەهەمو لە پایتەختدا کراوەتەوە، لەدایکبوونی ئاقارە ئایدۆلۆژییە تازەکانی بەخۆیەوەبینیوە، لەلایەن فەیلەسوفەکانی (سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە)وەک بنکەیەک

بەکارهاتووە، نمونەی ئەو فەیلەسوفانە «ڤۆڵتێر»، «جان جاک ڕۆسۆ»، «مۆنتسکیۆ». هەمان ئەم چاخانەیە لەدایکبوونی شۆڕشـــی فەرەنسی بەخۆیەوە بینیوە. چونکە وەک بارەگایەک بۆ کۆبونەوەی باوکانی ئەم شۆڕشە، لەپێش هەموویانەوە «ڕۆبسپێر»و «دانتۆن» بەکارهاتووە.

## هەڕەشە

ســـەدەی نۆزدە، بە ســـەدەی زێڕینی چاخانەکانی پاریس دادەنرێـــت، چونکە چاخانەکان ببونە ســـەرچاوەی وەحی بۆ ئەو وێنەکێشو نوسەرە گەورانەی ڕوویان تێدەکردن، چاخانەکان لە تابلۆکانی «پۆل سیزان»و «دەقەکانی «بەلزاک»و «جیرارد»و «نیرفال» بەنەمری ماونەتەوە. ئەو چاخانانەی دەکەونە گەڕەکی (مۆنبرناس)ەوە، لانکەی لەدایکبوونی بزوتنەوەی سوریالیبیەت بوون کە «ئەندرێ بریتۆن»ی نوسەر، یەکێکە لە سیمبولە سەرەکییەکانی. دوای جەنگی جیهانی دووەم، ئەو چاخانانەی دەکەونە گەڕەکی (سان جێرمان)ەوە، لەگەڵ «جان پۆل سارتەر» لەدایکبوونی بزوتنەوەی وجودییان بەخۆیانـــەوە بینی. چاخانەکانـــی پاریس، هەریەکەیـــان بەپێی هەڵکەوتەی شـــوێنەکەی، پێگەو کەشوهەوایەکی تایبەتی هەیە، کە لەوانی دیکەی جیادەکاتەوەو گوزراشت لە ڕابردووی خۆی دەکات. پانتایی چاخانەکان بەشـــێوەیەکە تێیدا دەوڵەمەندو ڕۆشـــنبیرانو سیاسییەکانو خەڵکانی سادەو هـــەژار، تێکەڵ بەیەک دەبن. هەرچەنـــدە خاوەن چاخانەکان، هەوڵێکـــی زۆر دەدەن چاخانەکانیان پارێـــزگاری لە ئەرکە ڕۆشـــنبیریو کۆمەڵایەتیەکـــەی بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا پێدەچێت ئەو چاخانانە لەژێر هەڕەشەی لەناوچونداین.

## چاخانە ئەدەبییەکان.. ئەدیبەکان دەردەکەن

نوســـەری کۆچکردوی میسر «ئەلبێر قیســـری» بە خەمبارییەوە پێی وتم: (دەبینیت چاخانەی فلۆر چۆن گۆڕاوەو بووەتە شـــوێنێکی قەرەباڵغ بە گەشتیارە ساویلکەکان، ئەوانەی دێنو سەردانی پێشـــانگای جلوبەرگی ئامادە دەکەن لە بۆرت دی ڤێرســـای). ئەم چاخانانـــە ڕۆژگارێک پڕ بوون لەگفتوگۆو مشتومڕو دەرکەوتنو هەڵکشانی ڕەوتە فیکریەکانی وەک وجودیەتو سوریالیزمو دادائیزمو ئەوانی دیکە. نوســـەری ئیســـپانی «فێرناندۆ ئارابال» دەڵێ: (چیتر ناڕۆین بۆ ســـەردانی چاخانە ئەدەبییەکانو لەگەڵ هاوڕێکانمان قســـەوباس لەســـەر ئەوەی نوســـیومانە ناکەیـــن، چونکە ژیانی ســـەردەم چیتر ڕێگای ئەوەمان پێنادات. ئێمە دەستنوسی کتێبەکانمان دەنێرین بۆ بڵاوکەرەوەکان، ئەوانیش مافەکانمان لە ڕێگەی چەکی بانکی یاخود لە ڕێگەی پۆســـتەوە بۆ دەنرێن، مەســـەلەکەش بەوە کۆتایی پێدێت).

«هنـــری جێمس» ئاوا باس لە چاخانەکانی پاریـــس دەکات: (لێرە مرۆڤ دەتوانێت بۆ چەندین کاتژمێر بە ئارامی دانیشێت، بێ ئەوەی شاگردەکە بێزاری بکات، لێرە بەیانیان دەتوانی بخوێنیتەوەو

بنوسیت، لە نیوەڕۆدا کارەکانت ئەنجامبدەیتو لە شەویشدا لەگەڵ هاوڕێکانتدا پێبکەنیتو گفتۆگۆ بکەیـــت). ڕەنگە هۆکاری بوونی چاخانەکانی پاریـــس، بەتایبەتی چاخانە ئەدەبییەکان، بگەڕێتەوە بۆ شـــەقامو شۆســـتە پانو فراوانەکانی پاریس. پاریس لەسەر ئەو بنەمایە دروستکراوە، ئەمەش لە ئەوروپادا دەگمەنە.

## زاراوەو بۆن

چاخانـــەکان تەنها جێگایەک نیـــن، بەڵکو لە تێکەڵەیەک لە بۆنـــی جۆراوجۆریش پێکهاتوون. «تۆماس وۆڵف» بیری لەوە دەکردەوە ئەو بۆنانەی لە چاخانەکانی پاریسەوە دەردەچن، کە چەندین بۆنی توندو قورس بوون، تێکەڵ بەیەکتر بکات. بۆنی خواردنەوەکان، بۆنی توتنی فەرەنســـی کۆن، ئەو بۆنانەی لە پلە گۆشتە سورکراوەکانەوە دەردەچوون، بۆنی قاوەی ڕەشی پاریسیو بۆنی ئافرەتو شەراب. بەڵێ، ناکرێ بەبێ ئەم بۆنانە، وێنای چاخانەکانی پاریس بکەین، هەروەها بەبێ بیستی ئەو زاراوانەی لەنێوان ئەوانەی سەردانی چاخانەکان دەکەن لەگەڵ شاگردەکاندا دێتەئارا: (قاوەیەکی نوار، قاوەیەکی ئێکسبریس، قاوەیەکی سیریە، قاوەی کرێم، شوکولاتە، ڤان ڕوج، ڤان بلان،...هتد).

چاخانـــەکان بە تەنها (نیرگەلە) پێشـــکەش ناکـــەن، بگرە پێویســـتییەکانی ژیانیش لە قاوەو جگەرەو خانوی ئیسراحەتکردنو ڕۆژنامەو تەلەفۆن پێشکەش دەکەن، بێگومان ئەمەی دواییان پێش ئەوەی مۆبایل بێتەئاراوە. بەمجۆرە چاخانە ئەدەبییەکان تەنها هەڵگری ئەو ناوانەن کە لە پێناویدا میوانەکان دێنو ســـەردانی دەکـــەن، تاکو خەون بە زەمەنی بەســـەرچووەوە ببینن. کەس ناتوانێت بچێتـــە چاخانەی (لافلۆر)و (دی ماگۆ)و (کلۆســـری دی لیلا)و (کافـــێ دی دۆم)و ئەوانی دیکەوە، بەبـــێ ئەوەی هەســـت بە حەنین بۆ زەمەنی ڕابردوو نەکات. چونکـــە چاخانەکان بە بەردەوام خۆیان نۆژەنناکەنەوە، تاکو لەگەڵ ئەو ســـەردەمەی تێیدا دەژین بگونجێن. ڕاستر ئەوە ڕۆحی چاخانەکانە کە ناگۆڕدرێت، چونکە ئەوانەی ســـەردانیان کردووە، ڕۆحێکیان بەو شـــوێنە بەخشـــیوە کە پێیەوە نوساوەو لێینابێتەوە.

پاریس پڕە لە چاخانە، بەڵام چاخانە ئەدەبییەکان سنوردارن، ڕەنگە بە گواستنەوەی ناوەندەکانی پاریس، ئەم نەخشـــەیە ئێستا گۆڕابێت. ئەو شوێنانەی ئەدیبو هونەرمەندەکان سەردانیان دەکردن، بریتیبـــوون لە چاخانەکانو چێشـــتخانەکانو بارەکانو یانەکانی شـــەوانە. زۆرجار ئەمەی دواییان پەیوەســـتبوو بە تیاترۆخانەو شوێنی ســـەماکردنەوەو بەناوبانگترینیان لە سەدەی چواردەهەمو لە پاریس دەرکەوت، لە ناوچەی هونەرمەندەکان لە گردی (مۆنمارتر)ی بەناوبانگ. لە چاخانەی (ئەسینا) هـــەر یەکە لە هونەرمەندان «دیگا»و «ڕێنورا»و «بیکاســـۆ» ئامادەدەبوون، ئەو هونەرمەندانە لە حەفتاکانو هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، لەو چاخانەیەدا قسەوباسیان لەسەر هونەر کردووە.

تائێستاش هەندێ لەو چاخانە ئەدەبییانە ماونەتەوەو هەندێکی دیکەیان بۆ هەتاهەتایە نەماون. چاخانەش ژیانی خۆی هەیە، لەدایکدەبێتو گەشـــەدەکاتو پاشان دەمرێ. بارودۆخ گۆڕانی بەسەردا

هاتووەو چیتر چاخانەکان وەک ســـەردەمانی ڕابردوو، ڕوادە دڵســـۆزەکانی نەماوە. بۆ نمونە «پۆل ڤێرلین» یەکێک بووە لە میوانە هەرە دڵســـۆزەکانی چاخانەکەی، ئێستا ئەدیبەکان ئاوابوونو ئەم دڵســـۆزییە نابێتە باعیســـی ئەوەی لە چاخانەکاندا کۆیان بکاتەوە. ئەدیبـــەکان ئاوابوونو لەگەڵ ئاوابونیاندا ڕۆحی ئەو چاخانانەش ڕۆشـــت کە ســـەردانیان دەکردنو تێیـــدا جێگا پەنجەی خۆیان جێدەهێشـــت. لەم چاخانانـــە تەنها دیکۆرە خەمبارە کۆنەکانیان ماونەتـــەوە: ئاوێنە جوانەکانیان، کۆڵەکەو تاقەکانیان ماونەتەوە کە ئاماژەن بۆ زەمەنی بەسەرچوو.

«گیۆم لینیر»و هاوڕێکانی، لە چاخانەی (فلۆر) بەیەکدەگەشتن، چونکە لە هەموو شوێنەکانی دیکە کەمتر جاڕسکەربوو، هەروەها هەریەکە لە «گیۆم لینیر»و «ڕۆفییر ویبلی»و «سالمون» ئەو چاخانەیان کردبووە هۆڵێک بۆ نوســـین. لەو کاتەوە «گیۆم لینیر» لەو چاخانەیەدا نوســـینگەیەکی بۆ خۆی دروســـتکردبوو، تێیـــدا بۆ چەند کاتژمێرێکی دیاریکراو، پێشـــوازی لە میوانەکانی دەکرد. «فرانســـیس کارلۆ» ســـەبارەت بەم چاخانـــە ئەدەبییە دەڵێ: (گیۆم بێ هیـــچ ڕکابەرێک گەورەی چاخانەکـــە بوو، چونکە ئەم شـــاعیرە چاخانەکەی کردبووە مەملەکەتی خـــۆی). هەر لەم بارەیەوە «ڤیلێپ سۆلر» دەڵێ (ئەو وەک پاشای سەر عەرش دادەنیشت).

ئەم شـــاعیرە، وەک ئەوەی «جیرار جۆرج لۆمبز» باســـی دەکات، هەر بەهۆی ئەم چاخانەیەوە، توانی لە ســـاڵی ١٩١٧ «ئەندرێ بریتۆن» بناســـێتو دەڵێ: (کاتێ تریستان تزارا گەشتە پاریس، هـــاوڕێ دادائیەکانی، هێنایـــە ئەم چاخانەیە کە تێیدا گیۆم ژیاو هەر لەوێشـــدا کۆچی دوایی کرد. ئەندرێ مالرۆ-ش دەهات بۆ ئەم چاخانەیە تاکو شـــەرابی (برنۆ)ی بەستوو ببات. ئەم چاخانەیە لە ســـاڵی ١٩٣٠ جارێکیتر زیندویەتی خۆی بەدەســـتهێنایەوە، ئەویش ئەو کاتە بوو کە «باسکاڵ»ی فەیلەســـوف ســـەردانی دەکرد). هەر لەم چاخانەیەدا «ســـیمۆن دی بۆڤار» کتێبە بەناوبانگەکەی (ڕەگەزەکەی دی) نوســـیدنی. هەروەها «جان پۆل ســـارتەر» کە لە ئۆتێل (لی لویزیان) دابەزیبوو، ئەم چاخانەیەی کردبووە نوســـینگەیەک بۆ خۆی، ئەمـــەش دوای ئەوەی چاخانەی (ئەلموبرناس)ی بەجێهێشـــت، چونکە نازییەکان وردە وردە لەو چاخانەیەدا کۆدەبونـــەوە. ئەم چاخانەیە چاخانەی شاعیر»جاک برێڤەر»و گروپەکەی بوو، کە کردبویانە ماڵو سێ بەشی هۆڵەکەیان داگیرکردبوو.

دانـــەری کتێبی (چاخانە ئەدەبییەکان لە قاهیرەوە بۆ پاریس) دەڵێ: (ئەنگلۆساکســـۆنییەکان بەوەفابـــوون بۆ ئەم چاخانەیە. هەر یەک لەئارنســـت هیمنگوایو ترۆمان کابـــۆتو لۆرانس داریل، چاخانەی (دۆماگۆ)یان وەک ماڵێک بۆ خۆیان هەڵبژارد، هەروەها بیکاسۆو جۆرج بەتایو جیاکۆمیتیو ئارسۆر ئەدامۆفو دالی، ئەوانیش کردبویانە ماڵێک بۆ خۆیان).

## ناوەندی بیرکردنەوە لە پاریس

چاخانەی (دۆماگۆ) تەنها ئەو کاتە ڕۆحی کرا بەبەردا کە ئەو دەستەیەی هەڵدەستان بە دەرکردنی گۆڤاری شیعرو پەخشان، چاخانەی (ئەلموبرناس)یان بەجێهێشتو گەشتە ئەم چاخانەیە. ڕۆژگاری

مەزنـــی ئەم چاخانەیە، تەنها دوای جەنگ دەســـتپێدەکات. ســـوریالییەکان یەکەم کەس بوون ئەم چاخانەیـــان گرتەخۆ، پێدەچێت دامەزراندنی دەزگاکانـــی بڵاوکردنەوە لەو گەڕەکەدا، زیندویەتی بەم چاخانەیـــە بەخشـــیبێت، وەک دەزگای (مێرکۆ دی فرانس)و دەزگای (گراســـییە)و لەگەڵ چەندین دەزگای دیکەی بڵاوکردنەوەدا کە تا ئێســـتاش هەر ماون. دوای ئـــەوەی «ئەندرێ بریتۆن» گۆڤارە بەناوبانگەکەی (لیتراتۆر)ی بڵاوکردەوە، ئیدی سوریالییەکان سەردانی ئەم چاخانەیەیان دەکرد.

سەبارەت چوونی سوریالییەکان بۆ ئەم چاخانەیە، «جان فلانر» دەنوسێتو دەڵێ: (سوریالییەکان مێـــزی خۆیـــان هەبوو، بەرامبەر بە دەرگاکە، لەم مێزەوە دەیانتوانـــی بە ئارەزوی خۆیان، جوێن بە هەموو ئەو کەســـە تازانە بدەن کە وەک ئەوان بیریان نەدەکردەوە. یاخود دەیانتوانی بەدەنگی بەرز، نیەتی خۆیان دەربڕن، بەوەی دەیانەوێ لە هەموو ئەو ڕۆژنامەنوسانە بدەن کە لە یەکێک لە ڕۆژنامە نەیارەکانی ســـوریالی دەیانوســـیو ناوی ئەمانی هێناوە یان نـــاوی نەهێناون). «جیمس جۆیس» دەموچاوێکی ناســـراوی چاخانەکە بوو، لەوێ ئەو شاعیرە ئەڵمانیانەی دەبینی کە دوورخرابونەوەو لەمەنفا بوون، لەوانە «برێخت»و «ئانا ســـیگرز»و «ســـتیڤان زفایـــج»و «ماکس برۆد»ی هاوڕێ گیانی بەگیانییەکەی «کافکا».

چاخانەی (دۆماگۆ) لە میانەی دەیەی سییەکاندا، تاڕادەیەک، شا دەماری سەرەکی ژیانی فیکری بووە لە پاریس. «فیلیۆن» لەم بارەیەوە دەڵێ: (جان پۆل سارتە لەگەڵ سیمۆن دی بۆڤار، سەعات دەی بەیانـــی دەهاتن بۆ چاخانەی دۆماگۆ، لەســـەر دوو مێزی بچوک کە لە تەنیشـــت یەکەوەبوون دادەنیشتنو بۆ ماوەی دوو کاتژمێر، بەبێ ڕاوەستان دەیانوسیو جگەرە لە دوای جگەرەیان دادەگیرسان. ئەوان دەیانتوانی بێ کێشـــەو بە دڵنیاییەوە لەوێ کاربکـــەن، چونکە خەڵکانی خۆتێهەڵقورتێن لە چاخانەی فلۆر بەشوێنیاندا دەگەڕان).

«کلۆد مۆریاک» دەنوسێ: (بەڕاستی ئەوە دیمەنێکی جوانە، ببینیت مامۆستا کۆنەکە «ئەندرێ بریتۆن» بە ویقارەوە ســـەبیلەکەی لەســـەر شۆســـتەی چاخانەکە دەکێشـــێتو بە پانزە کەس لە شـــوێنکەوتووە پیرەکان دەورەدراوە. پاشان شانۆکار «ئەنتوان ئارتۆ» کە لە گروپی سوریالییەکان کۆنتربوو، بەدەنگێکی کز سەلامێک دەکات، «بریتۆن»یش بە شێوەیەکی گەورە بۆی دەچەمێتەوە. دەکرێ سەبارەت بەم چاخانە ئەدەبیانە، سەدان بەسەرهاتو چیرۆک بگێڕدرێنەوە، هەروەها بەشێکی زۆری یەکتربینینەکان لەم چاخانانەدا ڕوویدەدا، بۆ نمونە یەکتربینینی بیکاسۆو دورا مار).

## لیب..بەسەرهاتێکی دیکە

ســـاڵی ١٨٧٧ چاخانەی (لیب) واژۆکردنی (بەیاننامەی پێنج)ی بەخۆوەبینی کە دژ بە ڕۆمانی (زەوی) ئەمیل زۆلا بوو. ڕاســـتی مەســـەلەکە ئەوەیە ژیانی چاخانەکانی پاریس، هیچ نییە جگە لە درێژکراوەی ژیانی ماڵ یان شوقە نەبێت، لەم بارەیەوە «جان پۆل سارتەر» دەڵێ: (کاتێ مامۆستا بووم، پارەی تەواوم نەبوو، لەبەر ئەوە لە ئوتێلدا دەژیام. بۆیە منیش وەک هەموو فەرەنســـییەکانی

دیکە، هەمو ڕۆژەکەی خۆم لە چاخانەکاندا بەسەردەبرد).

بەم شـــێوەیە چاخانەکان، بەلای هەندێ لە نوسەرو ئەدیبەکانەوە، ئەوانەیان لەیەککاتدا، نوسینو نانخواردنو پێشوازیکردن لە میوانەکانیان لەوێدا ئەنجامدەدا، بۆ ئەوانە چاخانەکان وەک جۆرێک لە نوســـینگە یان فەرمانگەی لێهاتبوو. لەبەرامبەر نرخی یەک کوپ قاوەدا، چاخانەکە ڕۆژێکی گەرمی، لە سەرماو سۆڵەی پاریس بۆ دابیندەکردن. «سیمۆن دی بۆڤار» لە کاتی جەنگی دووەمی جیهاندا دەڵێ: (هەســـتمدەکرد بوومەتە بەشـــێک لە خێزانی چاخانەکە، هەر ئەمەش بوو مرۆڤی دەپاراست لەوەی ئەعسابی تێکبچێتو لەدەستیبدات).

نوسەرێکی فەرەنسی یان بیانی نادۆزیتەوە، لەپاریس ژیابێتو یەکێک لە کارە ئەدەبییەکانی لە چاخانەکاندا نەنوســـیبێت. «ســـیمۆن دی بۆڤار» لە چاخانەی (سیلیکت) لە مۆنبرناس دەینوسی. «ئارنســـت هیمنگوای» کورتە چیرۆکەکانی لە چاخانەی (گلۆسری دی لیلا) نوسیوە. بەم شێوەیە هەر نوسەرێک پەیمانێکی دڵسۆزانەی لەگەڵ ئەو چاخانەیەدا دەبەست کە سەردانی دەکردو جۆرێک لە تەماهی لەگەڵ چاخانەکەدا دروســـتدەکرد. بگرە شوناسی خۆیپێدەبەخشی، ئەگەر ئەو گوزارشتە ڕاستبێت.

## سەرچاوە:

مسارات البیان، ٢٠١٠/٦/٢٦

# لامارتین.. لە سیاسەتەوە بۆ ئەدەب



**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

شـــاعیری بەناوبانگ — ئەلفونس دو لامارتین- ســـەر بە خێزانێکی ئوروســـتوکراتی فەرەنسیە، کە لەو ســـەردەمەدا (ســـەدەکانی ١٨-١٩) لە چینە هەرە باڵاکانی کۆمەڵگای ئەوسابووە. لە ناو ئەو خێزانەدا و بە چاودێریی دایکی ژیاوەو لە کۆشـــکی — میلی-دا پێگەیشتووە. تاقە داواکاریی دایکی وەک لامارتین خۆی دەیڵێت، ئەوە بوە کە کوڕەکەی ڕاست و دروست دەربچێت.

دوای ئەوەی لامارتین لە پەیمانگایەکی یەسووعیدا خوێندن تەواو دەکات، بۆ گەشت و حەسانەوە — وەک زوربەی کوڕە دەوڵەمەندەکان — زۆر وڵات دەگەڕێت. ســاڵی ١٨١١ چوو بۆ ئیتالیا و تا ساڵ ١٨١٤ لەوێ مایەوە. واتا تا کەوتنی رژێمی ئیمپراتۆری فەرەنسا بە سەرۆکایەتی ناپلیون بۆناپارت و گەڕانەوەی لویسی هەژدەیەم بۆ سەر حوکم. پاش ئەوە لامارتین خۆی بۆ ئەدەب و شیعر تەرخان کرد. ســاڵی ١٨٢٠ یەکەم دیوانی شیعریی خۆی بە ناوی (ڕامانە شیعریەکان) بڵاوکردەوە، ئەوسا تەمەنی ٣١ ساڵ بوو. ئەم دیوانە شیعریە، (کە یەکەم بەرهەمی داهێنانی بوو) لە شەوو ڕۆژێکدا لامارتینی هێند بەناوبانگ کرد کە ئاماژەی بۆ دەکرا. دوای ســێ ســاڵ دووەم دیوانە شیعری بەناوی (تێڕامانە شــیعریە تازەکان) نووسی و چەند کتێبێکی تریشی بڵاوکردەوە، لەوانە: «مەرگی سوکرات» و «دوا سروودی دۆزەخی هارولدی منداڵ».

دوای ئەوەی لامارتین سەفەری خۆرهەڵاتی کرد و بەتایبەتی شاری قودسی لە فەلەستین بینی کە لانکەی مەسیح و پیرۆزیەکانی ئاینەکەیەتی، گەڕایەوە بۆ ئەوروپا و بوو بە کارمەندێکی سەفارەتی فەرەنسا لە شاری فلورەنسای ئیتالیا. دوای چەند چیرۆکێکی خۆشەویستیی سەرنەکەوتوو کچێکی ئینگلیزی هێنا. لە ناو چیرۆکەکاندا قەسیدەی (دەریاچە) بوەتە سروش کە لە شیعری فەرەنسیدا بەناوبانگترین قەسیدەی رۆمانسیە.

پاشان لامارتین کەوتە ناو ژیانی سیاسیەوەو بوو بە پەرلەمانتار. بە وتارە شیعریەکانی کە پڕ بوون لە گیانی بەزەیی بەرانبەر بە خەڵکانی هەژار، هاوڕێکانی سەرسام کرد. لامارتین وتاربێژێکی پلەیەک بوو. لە دوای قەســیدە بەناوبانگەکەی «دەریاچە»وە چەنــد کتێبێکی گرنگی بڵاوکردەوە، لەوانە: «گەشــتێک بەرەو خۆرهەڵات ١٨٣٥» «جوسلین ١٨٣٦» «کەوتنی فریشتە ١٨٣٨» سەردانەوانديی شــیعریی ١٨٣٩» و هی تریش. کتێبێکی جوانیشی لەســەر مێژووی شۆڕشی فەرەنسا نووسی کە هێشتا لە سەرەتادا بوو. ئەوەی جێی سەرنجدانە لامارتینی خانەدان و ئورستوکراتی، بوو بە یەکێک لە هەوادارانی شۆڕشــی فەرەنســا کە چینەکەی خۆی و ئیمتیازە زۆرەکانی پاکۆدا. لامارتین یەکێک بوو لەوانەی بە سەختی دژی فەرمانڕەواییە کۆنەپەرستەکەی شا لوییس فیلیپ بوو. یەکێکیش بوو لە ســەرکردەکانی شۆڕشــە میلییە بەناوبانگەکەی ساڵی ١٨٤٨. پاشان بوو بە ئەندامی حکوومەتە کاتیەکەی فەرەنســا. بۆ ماوەیەکی کەمیش بوو بە وەزیری دەرەوە. لەو کەســە هەرە دیارانە بوو کە بانگەشەی بۆ نەهێشتنی یاسای کۆیلایەتی دەکرد کە لەو کاتەدا ڕەشەکانیان پێ دەچەوساندەوە.

کە لە ســاڵی ١٨٥٢ لە ڕێگای کۆدەتایەکی ســەربازیەوە ناپلیۆنی سێهەم هاتە سەر حوکم، ئیتر ژیانی سیاسیی لامارتین کەوتە لێژیی. دوای ئەوەی دەسەڵات کەوتە دەستی کاسۆلیکە کۆنەپەرستە ڕاست ڕەوەکان، لامارتین بە تەواویی لە سیاسەت کەوت.. کەوتە تەریکیی و زۆربەی کاتی بۆ ئەدەب و نووســین تەرخان کرد، بەڵام ڕاستەوخۆ رووبەڕووی دەسەڵاتە دیکتاتۆریەکە نەبووەوە وەک فیکتۆر هیگۆ کردی. لەبەرئەوەی ســزای ڕووبەڕوو بوونەوە و دژوەستانی دیکتاتۆریەت یان کوشتن بوو یان زیندان و دوورخســتنەوە، بۆیە لامارتین بێدەنگی هەڵبژارد و بەرەنگاریەکی نهێنی و ناچالاکەوانەی دەکرد.

لامارتین دوا ساڵانی تەمەنی خۆی زۆر ناخۆش بەسەر برد، ناچار شەوو رۆژ کاری بۆ دابین کردنی بژێویی ئاسـایی رۆژانـەی دەکرد. ئەو دەوڵەمەند نەبوو، چونکە وەک زۆر کەس پایەی دەسـەڵاتی بۆ دەوڵەمەند بوون بەکارنەهێنا. لە نامەیەکیدا کە بۆ ڤیکتۆر هیگۆی نوسـیووە خەمی ئەوەیەتی کە دەترسـێت دەست بەسەر ماڵ و کتێبخانە و شـت و مەکەکانیدا بگرن چونکە ناتوانێت لیستی حسێبەکانی بدات.

سـاڵی ١٨٦٧ لە ژێر فشـاری ناچاریدا خەلاتێکی لـە دەوڵەت وەرگـرت. رووناکبیرە چەپەکان سـەرکۆنەیان کرد و وایشـیان دایەقەڵەم کە ئەوە رێکەوتنە لەگەڵ ناپلیۆنی سـێیەمی دیکتاتۆر و سـتەمکاردا. بەڵام ئاخۆ لامارتین هیچ چارێکی تری هەبوو؟ ئاخۆ دەیانەوێت لەسـەر شـەقامەکان بمرێت لە کاتێکدا کە یەکێک بوو لە ناودارترین کەسایەتی ئەوسای فەرەنسا؟

لامارتین وەک ئەنجام، دوای دوو سـاڵ بەخەم و ئازارەوە کۆچی دوایی کرد. خێزانەکەی نەیهێشت بە رێورەسـمی نیشـتمانی تەرمەکەی بنێژن. لە ترسی ئەوەی نەک دەسەڵات بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاربهێنێت. ئەی کارنامە شیعری و فیکریەکانی لامارتین کامانەن؟

بێگومان یەکەمین دیوانە شـیعریەکەی «ڕامانە شـیعریەکان» دامەزراندنی قۆناغی شـیعریی (ڕۆمانسـی) بوو لە فەرەنسـادا، ئەوە کۆتایی بە قۆناغی کلاسـیکی هێنا. چونکە ئەو دیوانە لە قووڵاییەوە سـەرچاوەی گرتبوو، قووڵایی دڵێکی پڕ لە هەست. لە ساڵی ١٨٣٢ ئەم شاعیرە گەورەیە گەشتی بەرەو خۆرهەڵاتی عەرەبی کرد، لە کتێبێکی ناوداریدا بە ناوی ( گەشتێک بەرەو خۆرهەڵات) یاداشت و رۆژانەکانی خۆی تۆمارکرد. ئەم کتێبە گرنگترین گەشتی خۆرهەڵاتناسیە لە دنیادا. لامارتین لە شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٨٣٢ گەیشتە وڵاتی شام، ئەمە یەکەمین گەشتی بوو بەرەو خۆرهەڵات، یەکەمجار لە بەیروت گیرسـایەوە، ژنەکەی و جولیای کچی و پزیشـکە تایبەتیەکەی لەگەڵیابوون. ئەم شاعیرە فەرەنسیە گەورەیە لە یاداشتەکانیدا دەربارەی بەیروت نووسیویەتی: «بەیروت لە شارە پڕ لە دانیشـتوەکانی سـوریایە، دێرینەکان پێیان وتوە (بیریت) لە سەردەمی ئاگوستۆسدا بوە بە کۆلۆنیایەکی ڕۆمانی. داگیرکەرە ڕۆمانیەکە ناوی ناوە جولیافیلکس «بەختەوەر» ئەم نازناوەی بۆیە وەرگرتووە چونکە خاکی بەپیت و شوێنەکەی مەزن و کەش و هەوایەکی خۆشی هەبووە».

لامارتین تەنیا بە بەیروت دڵی ئاوی نەخواردۆتەوە، سـەری لە گەلێک شـاری تری شـام داوە. دیمەشق و حەڵەب و قوودس لە وێستگە سەرەکیەکانی گەشتەکەی بووە. گەلێک سەرنج و یادەوەری لەسـەر دیمەشـق نووسیوە کە لە مانگی نیسـانی ١٨٣٣ بینیویەتی، ئەم شـارە بە جۆرێک دڵی بردوەو شـاعیریەتەکەی جووڵاندوە کە وەسـفێکی زۆر ناوازەی شارەکە دەکات، شارێک پڕ لە ڕامان و جوانی و فەلسـەفە و زیندوویەتی و درەوشـانەوە. کە باس لە دیمەشـق و دانیشـتوان و داب و نەریتییان دەکات. گەلێک سەرسامە بە رەوشت بەرزی خەڵکی دیمەشق و بەخشندەیی و هاوکاری و گونجانی دانیشتوانی لەگەڵ یەکتردا. لەم لایەنەوە لامارتین دەڵێت: «لەسەر زەویدا جێگایەکی وەک بەهەشتەکەی دیمەشـق دەست ناکەوێت، دەشتێکی فراوان و بەپیت، حەوت لقی رووباری شین کە ئاودێریی ناوچەکە دەکەن. چیا سەرکەشەکانی دەوروبەری ئەو دەریاچە دڵڕفێنانەی ئاسمان بەسەر

شەپۆلەکانیەوە دەدرەوشێتەوە.

شـــوێنی جوگرافی، باشــیی کەش و هەوا، هەموو ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە دیمەشـــق یەکێکە لەو شـــارە بەراییانەی کە مۆڤ دروســـتی کردون. لەبارەی مێژووی دیمەشقەوە دەڵێت: یەکێکە لەو شـــارە بەراییانەی مرۆڤی تیا نیشـــتەجێ بووە، جێگای بژێویەکی سروشـــتی (مرۆڤی سەرگەردانی سەردەمە کۆنەکانە. ئەو شارەی خوا بە پەنجەی خۆی لەسەر زەوی نووسیویەتی. پایتەختێکە وەک قوستەنتەنیە بەهای خۆی هەیە، ئەو دوانە دوو تاقە شارن کە لە خۆوە نەخراونەتە سەر نەخشەی ئیمپراتۆریەت، بەڵکوو ســـەلماوێکی بەڵگەنەویســـتە کە تایبەتمەندیی خۆیان هەیە لەوەدا کە لە جێگای شیاوی خۆیاندان.

لامارتین کە لەگەڵ کاروانێکدا دەگاتە شارەکە بەم جۆرە باسی دیمەشق دەکات: «چوومە پێشێ و لە دەلاقەی تاوێرێکەوە تەماشای ئاسۆیەکی ئەوەندە جوان و سەرسوورهێنم کرد کە پێشتر مرۆڤ دیمەنی وای نەیدیوە، ئەوە دیمەشق و بیابانە بێ کۆتاییەکەیەتی».

لامارتین لە دیدی خۆیەوە باســـی سیحری شارەکە دەکات، ئەو دیوارە زەرد و ڕەشە مەڕمەڕیانەی دەوری شـــاریان داوە. ئەو قەڵا لە ژمارە نەهاتوانەی ســـەخت گیریان کردووە. شـــارەکە دارستانێک منارەی جیاواز و حەوت لق رووبار و جۆگەلەی بێ ئەژماری تێدایە. تا چاو بڕ بکات بێستانی بەردارە. چوار سەد هەزار کەسی تیا دەژی. چاو فریای ئەوە ناکەوێت جوانیەکان بگۆڕێت.

لامارتین ســـەری لە شاری حەڵەبیش داوەو بە شـــارێکی جوان و پێشکەوتوو ناوزەدی کردوە. لە ڕوانگەی ئەوەوە حەڵەب ئەســـینای ئاسیایە. مەترانیەتی سریانی ئەرتودوکسی پێشانگای ئەلفونس دولامارتین و گەشـــتەکەی خۆرهەڵاتی لە حەڵەب کردەوە. لە پێشـــانگاکەدا چاپی یەکەمی کتێبەکە و دیوانە شـــیعرەکەی تیابوو. هەروەها وێنە و باری ســـەرنجە هونەریەکانی ئەو شوێنانەی دیدەنیی کردوون و شـــیعر یان بیری فەلســـەفیانەی جیاوازی بۆ نووســـیون. هەروەها لەم دواییەدا کتێبی (گەشـــتێک بەرەو خۆرهەڵات ١٨٣٢-١٨٣٣ لەلایەن باســـکاری سووری حسەین عیسمەت و باسکاری فەرەنسی ئولیفیە سالمون لە حەڵەب چاپ کراوە.

## سەرچاوە:

ئەلبەیان – مسارات – ٢٠١٠/٧/٢٤

# خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی ئیسلامی بەجیهانیكراو

لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

یەکێک لە بیرمەندە جیهانیەکان کە گرنگی بە ئیسلامیزم دەدات بیرمەندی فەرەنسی ئۆلیڤەر ڕوایە . ئەم بیرمەندە بەدیدێکی نوێوە ئیش لەسەر ئیسلامی سیاسی دەکات و وەک دیاردەیەک تێی دەڕوانێت کە پێویستی بە قسە لەسەرکردنە نەک شەڕکردن لەگەڵیدا. ئەو وا لە ئیسلامی سیاسی دەڕوانێت کە وەک هەر تاکێکی تری ئەم کۆمەڵگەیە بوونیان هەیە و تەنانەت بەجۆرێک لە جۆرەکان بەجیهانیکراون. واتە ئەوەی ئەوان دەیانەوێت شتێک نیە لە دەرەوەی جیهان بەڵکو ئەوان کوڕی کۆمەڵگە جیاوازەکانن و خەونیان هەیە و بەشێکن لە جیهان.

لە ساڵی ٢٠٠٦ دوای چەندین ساڵ کارکردن لە بواری ئیسلامی سیاسیدا، ئۆلیڤەر ڕوا کتێبێکی نایابی بەناونیشانی ئیسلامی بەجیهانیکراو بڵاوکردەوە، کە تێڕوانینێکی تەواو جیاوازە لە بواری ئیسلامی سیاسیدا.

بەگوێرەی تەفسیری ئۆلیڤەر ڕوا پرۆژەکانی ئیسلامی هەنووکەیی بەشێوەیەکی بەرچاو دابڕاوە لە هەرێمێکی دیاریکراو و بەشێکە لە دەرئەنجامی شکستی بنیادنانی دەوڵەتی ئیسلامی. ئەمە بەو مانایە دێت کە ئارەزوویەک هەیە بۆ زیاتر و زیاتر هەنگاونان بەرەو بەئیسلامکردنی تاکەکان لە سیاقێکی گلۆباڵ و ئۆممەیەکی لەکەلتورخراو. بەتێڕوانینی ئۆلیڤەر ڕوا ئەو بزوتنەوانە لە فۆرمی ڕادیکاڵ و سیاسیدا خۆیان دەردەخەن. ئیسلام لەو ستایەڵانە نییە وەک ئەوەی لە ئاینەکانی تردا بوونی هەیە خۆی لەبەردەم بەتاکگەرایدا ببینێتەوە . ئیسلام هەمیشە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ کەلتورێکی دیاریکراودا نەبووە، بەڵگەش بۆ ئەوە گەشەکردن و بوونی ژمارەیەکی زۆری موسوڵمانە

لە خۆرئاوا کە پێناسەی خۆیان وەک ئیسلام دەکەن، بەڵام هەرگیزیش پێناسەی خۆیان وەک موسوڵمانی وڵاتەکەی خیان ناکەن، نمونە نمونەی ئیسلامبوونی دایک و باوانیان.

لای ئۆلیڤەر ڕوا فۆرمی نوێی ئاینداری بەشێوەیەکی فراوان جیاوازە لە کۆمەڵگە و کەلتورە تەقلیدیەکان بەجۆرێک کە جیاوازە لە کۆمەڵگە موسوڵمانەکان و بەتەواوی شێوازێکی نوێیە لە ئاینداری و جیاواز لەو وڵاتە موسوڵمانانەی کە لەسەر بنەمای زاراوەگەلی «ئێوە و ئێمە» دابەشکراون. ئەوان وا خۆیان دەبینن کە دووبارە لەدایکبوونەتەوە و دەیانەوێت هێلێکی ڕوون لەنێوان کارەکتەری خۆرئاوا و ئەوانەی لە پشتی ئەوانەوەن بکێشن، بەو مانایەی کە باوەڕدارە ڕاستەقینەکان وەک کەمینەیەک خۆیان لەو کۆمەڵگایانەدا دەبیننەوە کە بەجیهانیکراون. کاتێک ئەو کۆمەڵگایانە دەیانەوێت بەتەنها ئۆرگەنایزەی خۆیان بکەن لە بواری ئاییندا، ئەوا بەشێوەیەکی فراوان دادەبڕێن لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان و تەنانەت مەسەلە سیاسییەکانیش: ئەوە کۆمەکمان دەکات بۆئەوەی ببینین کە هەردوو سەلەفیزمی سەردەم لە ئیسلامدا و زۆرێک لەو بزوتنەوانەی هەڵگری ئینجیلن لە کریستیاندا هەرگیز گرنگی بە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان نادەن (بەجیاواز لە بزوتنەوە ئیسلامیەکانی وەک ئیخوان لە ساڵی ١٩٤٠ بۆ ١٩٥٠ و حیزبولا لە لوبنان یان بزوتنەوە مەسیحیە «سیۆلۆجیە لیبراڵەکان» لە ساڵی ١٩٦٠ەکاندا). کاتێک ئەوان سەرگەرمی سیاسەت دەبن، ئەوا گرنگی بە مەسەلە یاساییەکان دەدەن (لەباربردن، هاوسەرگیریکردن، شەریعە و زیناکردن... هتد).

ئیسلامیستەکان کار لەسەر دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەن و فەندەمێنتالیزمە نوێیەکانیش کار لەسەر پاککردنەوەی ڕۆحی موسوڵمانەکان دەکەن و وەک تاک مامەڵە دەکەن، ئەمەش بە مەسەلەگەلێکی سیاسی بەشێوەیەکی جیهانی. ئەوان دەیانەوێت بەشێوەیەکی نێونەتەوەیی سیاسەت بکەن، یان تەنانەت بەشێوەی بنەڕەتی لەڕێی ئینتەرنێتەوە هەوڵی دروستکردنی ئوممە دەدەن.

ئۆلیڤەر ڕوا دەڵێت «من لەو بڕوایەدا نیم کە شتێک ببێت بەناوی ئیسلامی ئەمریکی یان ئەوروپی، بەڵکو ئیسلامێکی جیهانی هەیە کە لە هەر وڵاتێک یان کەلتورێکی دیاریکراودا دەگونجێت بوونی هەبێت، لەبەرئەوەی ئەو ئیسلامە ئایین بنیاد دەنێتەوە نەک لە کەلتوردا، بەڵکو بە زاراوەگەلێک کە دەتوانن لە ژینگە جیاوازەکاندا خۆیان بگونجێنن: بۆنمونە زاراوەی حەلاڵ، کە لە خواردندا بنەمایەکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو دەتوانرێت بەتەندروستی بکرێت، لەوانە خواردنی خێرا».

بۆیە لێرەوە لە دیدی ئۆلیڤەر ڕواوە حکومەتەکانی خۆرئاوا پێویستە پشتیوانی لەم پرۆسەی بەخۆرئاوایکردن بکەن بێئەوەی پێویست بکات هەوڵی ئیسلامیەکی لیبراڵ، مۆدێرن، یان سیڤیل بدەن. ئەوان پێویستە خۆ لە هەر هەوڵێک بۆ بنیادنانەوەی ئاین بپارێزن، بەڵکو دەبێت هەوڵی تێکەڵکردنی ئاینی ئیسلام بدەن بە دروستکردنی ڕوومێک بۆ ئیسلام و لەگەڵ ئاینەکانی تردا بەشێوەیەکی یەکسان مامەڵەی لەگەڵ بکرێت. لەڕاستیدا ڕێکخستنەوەی ئیسلام پێویست ناکات بلکێندرێت بە مەسەلەی کۆچپێکردن و فرەکەلتورگەراییەوە. ئیسلام پێویستە تەنها وەک ئاینێک مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، نەک وەک ئەو دەربڕینەی کە ئیسلام وەک گروپگەلێکی کەمینەی ڕەگەزی دەبینێت.

ئۆلیڤەر ڕوا لەم کتێبەدا جەغت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئینتەرنێت ئامێرێکی پێرفێکتە بۆ خولّقاندنی فەزایەک بۆ نزیککردنەوەی باوەڕدارانی کۆمەڵگە و دژ بە دەرگاداخستنی کەلتور یان دەوڵەتێکی دیاریکراو. سایتەکان جا عەرەبی بن یاخود ئینگلیزی، لینکەکانی دەربڕینی بیریارانی سەردەم لەخۆ دەگرێت (زۆرێک لەوان سەلەفیەکانن)، بەڵام هەرکەسێک ئازادە لەوەی چی دەخوێنێتەوە یاخود ئارەزووی کۆتەیشنی کێ دەکات یان بەمانایەکی تر دواکەوتەی چ بیروباوەڕێک دەبێت.

زیاد لەوەش، ئینتەرنێت ڕێگە بە تاک دەدات بەیەکسانی قسە لەگەڵ ئەویتردا بکات. لە ئینتەرنێتدا مەعریفەیەکی یەکبەدوایەکی هەرەمی بوونی نییە . هەروەها ئینتەرنێت ڕێگەخۆشکەرە بۆ کردنەوەی پەنجەرەیەک بۆ دامەزراوەکان: بۆ نمونە، هەندێک لە وێبسایتەکان فەتوا ئامادە دەکەن بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێت، بەڵام لە پێناسەکەیدا ئەگەری جێبەجێنەکردنی فەتواکەش لەئارادایە، لە ئینتەرنێتدا مارکێتێکی خۆڕایی ئاین هەیە، کە تێیدا کەسێک توانای مارکێتی هەیە بۆ چەندین بەرهەمی جیاواز، لە فەتواوە بۆ بەرنامەی خواردن دروستکردن یان ئامۆژگاری هاوسەرگیری، ئەمەش لە ڕوومی تەنها کەسێکدا.

**سەرچاوە:**

www.amazon.com

# پاشان ڕیشم تاشی.. ئەزمونی نامۆ بوونم لە گروپە ئیسلامییەکان

لە عەرەبییەوە: سەردەم

ئەم کتێبە، بەشـێوەیەکی سـەرەکی، بایەخ بە حاڵەتی (نامۆبون-اغتراب) لە ڕیزی ئیسلامییە توندڕەوەکاندا دەداتو گەڕان بـەدوای هۆکارەکانی ئەم نامۆبونەدا. ئەمەش لە میانەی ئەو ئەزمونەی نوسـەری کتێبەکە، لە پەیوەندیکردنی لەگەڵ سـێ گروپی گەورەی ئیسـلامییەکان، تێیداژیاوە. کەواتــە ئەوەی کتێبەکە دەیگێڕێتەوە، تەنها بیروڕای کەسـێک نییــە، موتابەعەی چالاکی گروپە ئیسـلامییەکانی کردبێتو ئاگاداری بەرنامەکانیان بێت، بەڵکو ئەمە پوختەی ئەزمونی ئەندامێکی لێهاتوویانە، ئەندامێک گەشـتووەتە پلەی (شێخ)و وتنەوەی زانسـتی شەریعەتو جێبەجێکردنی بانگەوازو سەرپەرشتیکردنی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز.

وەک ئـەوەی دانەری کتیبەکە ڕوونیدەکاتەوە، ئەو بەم کتێبەی نایەوێت سـوکایەتی بە گروپە ئیسـلامییەکان بـکات یاخود خەڵـک بۆ دژایەتیکردنیـان کۆبکاتەوە. بگرە ئەو ئـەم کتێبەی بۆ ڕێنمایکردنـی ئەم گروپانەیە تا بێنەوە سـەر (ڕێگای ڕاسـت)، ئەمەش بۆ ئـەوەی لەو (وەهم)و (خورافەت)و (کۆتوبەندانە) ڕزگاریان ببێت کە هیچ پەیوەندییان بە ئاینەوە نییە، بەڵکو خەڵکانێک هێناویانــە تا بە ئـارەزوی خۆیان، ئاینی پێهەڵگەڕێننەوە. ئەو جیهانەی ئەو گروپە ئیسـلامیانە پێشکەشمانی دەکەن، (جیهانێکی ساختەیە)و پڕە لە وەهمو ململانێی دروستکراو.

دانەر کتێبەکەی بە قسـەکردن لەسـەر سـەرەتای پەیوەندیکردنی بە گروپە ئیسلامییەکانەوە دەسـتپێدەکات، گروپە ئیسـلامییەکان ئەویان لە مزگەوتەکاندا بینیـوەو هانیانداوە نوێژەکانی لە مزگەوت، لە کات و سـاتی خۆیداو بەشـێوەیەکی ڕێکوپێک بکات. پاشان ئەرکی ڕۆشتن بۆ ماڵانو

بانگەوازکردنی خەڵک بۆ نوێژو خودا پەرستییان بە خۆیو بە هاوڕێکانی سپاردووە. دانەری کتێبەکە لـــەم قۆناغەدا فێری ملکەچیو گوێڕایەڵییەکی تەواو بۆ (شـــێخەکان) بووە، چونکە ئەو شـــێخانە (خاوەنی ئەمرو نەهینو ئەوان جڵەوی مەســـەلەکانیان بەدەســـتەوەیەو خەڵک بەڕێوەدەبن). لێرەدا دانـــەر تێبینی ئەوە دەکات چۆن خودی خەڵکەکە، ئەوانن کە شـــێخەکانیان کردووە بە (بت) تاکو لە پەروەردگاری مەزن نزیکیان بکەنەوە. ئەوە خەڵکە وایکردووە ئەو شـــێخانە (ببن بە وەکیلەکانی خودا لەسەر زەوی).

لەبەرئەوە دانەری کتێبەکە پێی ســـەیر نییە کە تەلەفۆنی شێخەکان، بە شەووڕۆژ ڕاناوەستێت، لەلایەن نێرو مێوە، پەیوەندییان پێوەدەکەنو تاڕادەیەک لە هەموو شتێکدا، داوای فەتوایان لێدەکەن. قەناعەتی خەڵکی وایلێهاتووە، هیچ کەســـێک ناتوانێت بچێتە بەهەشت، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە بە تەواوی ئەوەی شـــێخ داوای لێکردووە، جێبەجێ بکاتو لە هەموو ئەو شتانەش دوورکەوێتەوە کە شێخ بەڕاستی نازانێت.

دانەری کتێبەکە بەدوورو درێژی لەســـەر شـــوێنو پێگەی (جنۆکە) لای گروپە ئیســـلامییەکان ڕادەوەستێت. جنۆکە بەلای ئەم گروپە ئیسلامیانەوە، سیمبولی خراپەکارییە. چونکە ئەوە جنۆکەیە خەڵکـــی لـــە بەجێهێنانی ئەرکە ئاینییەکانیـــان دەخلافێنێت. ئەوە جنۆکەیـــە بەهاکانی تەمەڵیو پشتگوێخســـتنو داواکردنی لەزەتە هەستییەکانیان بۆ دەڕازێنێتەوە. سەرەڕای ئەوە جنۆکە لەوانەیە لەسەر شێوەی (پشیلەیەکی ڕەش) یان (بزنێک) دەرکەوێت، سا بۆ ئازاردانی ئیمانداربێت یاخود بۆ یارمەتیدانی خەڵکانی لاسارو ڕیاکار لە کارە ئەخلاقییەکانیاندا.

دانـــەر بۆمان دەگێڕێتەوە چۆن بـــاوەڕی بەو هەموو چیرۆکە کردووە کـــە پڕبوون لە خورافاتو هەڵسوکەوتی نالۆژیکیو ناواقیعی. چۆن لە کۆڕو کۆبونەوەی گروپە ئیسلامییەکاندا، ئەو چیرۆکانە وەک ئەوەی چیرۆکی ڕاستەقینەبنو پێویســـتە بڕوامان پێیانهەبێت گێڕدراونەتەوە. ئەو قوتابییەی باوەڕی بە خودا هەیەو لە خودا دەترسێت، لەکاتی نوستنیدا، خەو بەوەوە دەبینێت کە وەرەقەیەکی بۆ دێت، پرســـیارو وەڵامەکانی بەشـــێوەیەکی تەواو تێدایە، ئەمەش وەک پاداشتێک بۆ ئیمانەکەی. پیاوی ئیماندار کە لە ڕێگایەکی بیاباندا سەفەردەکاتو ئۆتۆمۆبێلەکەی بەنزینی نامێنێت، لەوانەیە خودا ئاوی ناو ئۆتۆمۆبیلەکەی بۆ بگۆڕێت بە بەنزین.

دانەری کتێبەکە لەناو گروپە ئیســـلامییەکاندا، باسی بارودۆخی خراپی ئافرەتمان بۆ دەکات کە پێیەوە دەناڵێنن. ئافرەت پەیوەستە بە خیانەتو کورتبینییەوە، ئەمەش وادەخوازێت چاودێرییەکی تەواوی بکرێت. ســـەبارەت بە مەسەلەی ڕێخستن لەناو گروپە ئیسلامییەکاندا، ئەوا لەسەر بنەمای داخـــرانو ملکەچیو بەدیهێنانی بەرژەوەندییە باڵاکانی گروپەکە، بەهەر نرخێک ببێت ڕاوەســـتاوە. ئەمـــە ماناى وایە گروپە ئیســـلامییەکان لەناو خۆیاندا، کۆمەڵگایەک بـــۆ خۆیان لەناو کۆمەڵگادا دروستدەکەن. بە جۆرێک ئەندامانی گروپەکە، بە شێوەیەک تەماشای کۆمەڵگا گەورەکە دەکەن وەک ئەوەی (ئەوی دی بێت) کە پڕە لە هەڵەو (دارستانێکی تۆقێنەرە)و پێویستە هیچ ئەندامێک تێکەڵی نەبێت، تەنها لەکاتی پێویســـتیەکی زۆر گەورەدا نەبێت. لەبـــەر ئەوەیە ئەندامەکان مەیلیان بەلای

گۆشەگیریو دوورەپەرێزیدا هەیەو پێویستیان بە تێکەڵبون لەگەڵ خەڵکانی دەرەوەی گروپەکە نییە.

ئەم حاڵەتی داخرانو نامۆبوونە، سەرەڕای ئەو خورافاتو وەهمانەی لەنێو ئەندامانی گروپە ئیسلامییەکاندا بڵاوبوەتەوە، وایکردووە دانەری کتێبەکە، لە هەموو عەقیدەو پرنسیپەکانی ئەو گروپە، بگەڕێتەوە بۆ عەقڵی خۆی. دانەری کتێبەکە هەستیکردووە ژیانیان ژیانێکی ساختەو ئاڵۆزە، عەقیدەکانیان دواکەوتوو کۆنە، پەیوەندییەکانی دەسەڵات لەنێوانیاندا زیادەڕۆیی تێدایە. ئەمە وایلێکردووە دواجارو دوای قەیرانێکی توندی دەرونی، لەم گروپانە بێتەدەرەوەو بگەڕێتەوە بۆ ژیانی میانڕەویو لێکبوردەیی. ژیانێک تێیدا مرۆڤ ژیانێکی سروشتی دەژی، گوێ لە گۆرانییەکانی «فەیروز»و شیعرەکانی «نزار قەبانی» دەگرێت، ڕۆمانەکانو کتێبە کۆمەڵایەتیو سیاسییە گشتییەکان دەخوێنێتەوە. ئەمە دوای ئەوەی پێشتر عەقڵی بەسەر کتێبەکاندا داخستبوو، تەنها کتێبە کەلتورییە سادەکان نەبێت.

دانەر لە کۆتایی کتێبەکەدا کۆمەڵێ خاڵ پێشنیار دەکات کە لەوانەیە وابکات گروپە ئیسلامییەکان زیاتر بکرێنەوەو هاوسەردەمیانەبنو هەم لە ژیانو هەم لە خەڵکییەوە نزیکبن. گرنگترین ئەو پێشنیارانە بریتین لە: ڕازیبوون بە فرە ڕەنگیو جیاوازی، ئەو گروپانە بێنە ناو کۆمەڵگای مەدەنییەوەو خۆیان لە کۆمەڵگای ئاینی قەتیس نەکەن، باوەڕیان بە پسپۆڕی هەبێت، پاشان باوەڕیان بەوە هەبێت ئەوەی باشەو خراپەی خەڵک جیادەکاتەوە، عەقڵو کارکردنە، ڕازیبن ڕەخنە لە فیکرو لە کەلتور بگیرێت، گۆڕانە دینییەکان لە سەدەیەکەوە بۆ سەدەیەکی دیکە وا مامەڵە نەکەن وەک ئەوەی ئەوانە سەوابتە ئاینییەکانن.

ناوی کتێب: پاشان ڕیشم تاشی، ئەزمونی نامۆبوونم لە گروپە ئیسلامییەکان
نوسینی: فەواز ئەلشروقی
بڵاوکەرەوە: دەزگای بەترا بۆ بڵاوکردنەوەو دابەشکردن، ڕابیتەی عەرەبە عەقڵانییەکان، دیمەشق ٢٠٠٩
ژمارەی لاپەڕە: ١٦٠ لاپەڕەی بچوک

## سەرچاوە:

رشيد الحاج صالح، مسارات البيان، ٢٠١٠/٦/١٩

# لەگەڵ تۆڵستۆیدا



لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

دەربارەی «تۆڵستۆی» وتویانە: (گەورەترین ڕۆماننوسە لە هەمو زەمەنەکاندا)، ڕەخنەگران لەنێوان «تۆڵستۆی»و عیملاقەکەی تری ئەدەبی ڕوسی «دیستۆفسکی»، تیامابوون لەوەی کامیان لەوی دیکەیان بە باشتر دابنێن. نوسەرو ڕەخنەگری ئەدەبی فەرەنسی «دۆمینیک فرناندێز» کە چەندین توێژینەوەی لەسەر ڕوسیاو ئەدەبەکەی ئەنجامداوە، خوێنەری خۆی بۆ گەشتێک (لەگەڵ تۆڵستۆی)، کە ناونیشانی دواهەمین کتێبیەتی، دەبات.

دانەری ئەم کتێبە، لەسەر ئاستی بەسەرهاتی ژیانی «تۆڵستۆی»، پێیوایە ژیانی «تۆڵستۆی» چەند قۆناغێکی یەک لەدوا یەکی بەخۆیەوە بینیوە. یەکەمیان بریتییە لە قۆناغێکی هێمنو جوانی منداڵی، دوای ئەو (دوو دەیەی پڕ مەترسی) وەک ئەوەی «تۆڵستۆی» خۆی دانیپێدناوە، لەو

ماوەیەدا ژیانی پڕ بووە لە پەشێویو لەسەر ئاستی گشتیش جەنگ لەئارادابووە. پاشان دوو دەیەی دیکـــە لـــە (ژیانی خێزانێکی خانەدانو ڕێکوپێـــکو ئارام)، لەو ماوەیـــەدا بەناوبانگترین کارەکانی خۆی نوســـیوە. دانەر دواهەمین قۆناغ لە ژیانی «تۆڵســـتۆی»دا، ئەو کاتە دەستنیشانی دەکات کە تەمەنی «تۆڵســـتۆی» گەشتووەتە ٥٠ ســـاڵ. ئەم ماوەیە بەوە جیادەکرێتەوە کە تێیدا ڕۆماننوسی گەورە»تۆڵســـتۆی» لە هەموو ئەو شـــتانەی چواردەوری، یاخی دەبێت. ئەمە جگە لە یاخیبوونی دژ بە دیاردەی دەوڵەمەندیو پارەو ئەو ڕژێمەی لەئارادابووە. لەوکاتەدا «تۆڵســـتۆی» خاوەنی ٢٠٠٠ هێکتار زەویو ژمارەیەکی زۆر لە دەستوپێوەندو خزمەتکار بووە.

دانـــەری کتێبەکە وەک خۆی دەڵێ، (ســـەرلەنوێ)و بە (چاوێکی تـــازەوە)و بەبێ هیچ فیکرێکو بڕیارێکی پێشوەخت، دیسانەوە هەموو بەرهەمەکانی «تۆڵستۆی» خوێندوەتەوە. تێیدا (نوسەرێکی تێکۆشـــەری) بۆ دەرکەوتووە، هەروەها تێیدا (یەکێک لەو کەســـە پێشەنگانەی بۆ دەرکەوتووە کە کارەساتو نەهامەتیەکانی جەنگی پرۆتستۆ کردووە)، بەتایبەتی جەنگی شیشانی ساڵی ١٨٥٠، کە بە جەنگێکی زاڵمانەو دڵڕەق وەســـفیکردووە. «تۆڵســـتۆی» هیچ دوودڵ نەبووە لەوەی ڕەخنەیەکی زۆر تونـــد، ئاراســـتەی سیســـتەمی دادگاو جیهانی زیندانـــەکانو چەوســـاندنەوە کۆمەڵایەتیەکانو دەستدرێژییەکانی دەسەڵاتو لادانەکانی کڵێسا بکات.

نوســـین دەربارەی «تۆڵســـتۆی»و بەســـەرهاتی ژیانی، وادەخوازێت باســـی هاوسەردەمەکەیو ڕکابەرەکەی لەســـەر لووتکەی ئەدەب، «دیستۆفســـکی» بکەیت. بۆ ئەم مەســـەلەیە، بەشێک لەم کتێبە لەژێر ناونیشـــانی (دیستۆفسکی یان تۆڵســـتۆی) تەرخانکراوە. دانەری کتێبەکە لەبەرامبەر کاراکتەرێکی (پەشـــۆکا)و کۆمەڵێ حاڵەتی هەڵچوون کە هەندێجار دەگاتە ئاســـتی (وڕێنەکردن) لای «دیستۆفســـکی»، لەبەرامبەر ئـــەوەدا، وێنەی پیاوێکی هێمنو (هاوســـەنگ)و عاقڵ لە بڕیارو هەڵســـوکەوتیدا، بۆ «تۆڵســـتۆی» دەکێشـــێت. دانەری کتێبەکە لەمیانـــەی بەراوردکردنی ڕۆمانە بەناوبانگەکەی «دیستۆفسکی» برایانی کارامازۆف، لەگەڵ شاکارە نایابەکەی «تۆڵستۆی» جەنگو ئاشـــتی، پێیوایە ئەوەی یەکەمیان وێنەی جیهانی حاڵەتە (توندڕەوەکان) دەکێشـــێت کە هەریەک لەو ســـێ برایە تێیدا ژیاونو پێیانوابووە ڕاستە، لەسەر شێوەی (تراژیدیا) کۆنەکانی یۆنان. پاشان دانەر دوودڵ نییە لەوەی بڵێ ڕۆمانی جەنگو ئاشتی «تۆڵستۆی»: (ئەو ڕۆمانەیە کە لە هەموو ئەو ڕۆمانانەی تا ئێستا نوسراون کامڵترە). لەکاتێکدا «دیستۆفسکی» دەیەوێت جیهان لە (بچوککردنەوە – الصغارە) ڕزگاربکات، کەچی «تۆڵستۆی» ئەو جیهانە دەکاتە کەرەستەی بەرهەمەکانی.

ئەو وەســـفەی بکرێت بەم کتێبە تایبەتەی بەســـەرهاتی ژیانی «تۆڵستۆی» بدەین، ئەوەیە ئەم کتێبە زۆر لەوە زیاترە کە تەنها بەسەرهاتی «تۆڵستۆی» بگێڕێتەوە. چونکە ئەم کتێبە تاڕادەیەکی زۆر لە گەشتێک دەچێت بە نێو ژیانی ئەم عیملاقە گەورەیەو بەنێو هەموو کارە جیاواز جیاوازەکانیدا. دانەر وێنەی تانوپۆی شـــاکارە نایابەکانی «تۆڵستۆی» دەکێشـــێت، لەپێش هەموویانەوە جەنگو ئاشـــتیو ئانا کارینا. بەڵام جگە لەوانە، ڕۆدەچێتە ناو دەیان کورتە چیرۆکو توێژینەوەوە کە باس لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی سەرکێشـــییە مرۆڤایەتیەکان دەکەن. دانەر پێیوایە دوو تەوەرەی سەرەکی

هەیە کە «تۆڵستۆی» بایەخی پێداون، ئەوانیش خۆشەویستیو مردنە.

دانەر لە میانەی بایەخدانەکانی «تۆڵســتۆی»و گەردونیبونەکەی، واتە دیارینەکردنی لە شوێنو زەمەنێکی تایبەتدا، جەخت لەوە دەکات: (کارەکانی زەمەنێکی دیاریکراویان نیە)، وەک ئەو بەشەی لە کۆتایی کتێبەکەدا هاتووە. بگرە بێ هیچ دودڵییەک دەڵێ: ئەو وەک (هاوسەردەمێک) وایە بۆمان. لێرەدا ئاماژە بەوە دەکات هاوســەردەمەکانی «تۆڵستۆی»، سەبارەت بە کەسێتی «تۆڵستۆی» بۆ دووبەرە دابەشببوون، بەرەیەکیان «تۆڵستۆی» لە ڕیزی (قەدیسەکان) دادەنێنو بەرەکەی دیکەیان بە (شەیتان)ی دادەنێن.

دانەری کتێبەکە لە یەکێک لە بەشــەکانی کتێبەکەداو لەژێر ناونیشــانی (بەلزاکو تۆڵستۆی)، بەراوردی نێوان ڕۆماننوســی ڕوســیو ئەدیبە فەرەنسییە هاوســەردەمەکانی بەلزاک دەکات. دانەر قســە لەســەر ڕۆمانی (البعـث) دەکات، دەکرێ بیروڕاکانی ســەبارەت بەم بابەتــە کورتبکەنەوەو ئەمە بخوێنینەوە: (نوســینەکانی ئەمیل زۆلا بێننەپێشــچاوی خۆتان، نوسینەکانی تۆڵستۆی لەو بەهێزتــرنو لایەنی هونەرییان هەزارجار لەوان زیاترە. بەڵام وێنــای ئەوە بکەن زۆلا پەڕەموچەکەی دەکات بەو مورەکەبەدا کە فلۆبێر پێیدەنوسی. ئەمیل زۆلا خاوەنی ڕۆمانی (جێرمنال)و (السمفونیە الرعویە)و ئەوانی دیکەیە، بەڵام فلۆبێر خاوەنی ڕۆمانی (مەدام بۆفارییە).

وەلێ لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێین «دۆمینیک فرناندیز»ی دانەری ئەم کتێبە، تەنها بە شــانوباڵی «تۆڵستۆی»دا هەڵنادات، ئەوەتا ئەو لەسەروبەندی قسەکردنی لەسەر ڕۆمانی جەنگو ئاشتی دەڵێ: (دوو هەزار لاپەڕەکەی ئەم ڕۆمانە، کەمە بۆ وڵاتێک پێوانەکەی زیاد لە ١٧ ملیۆن مەتری چوارگۆشەیە). پاشان دانەر ڕادەوەستێت تاکو حوکمێکی ڕەخنەگرانەی ڕوونو ئاشکرا لەسەر ئەم بەسەرهاتە بدات، دانەر پێیوایە «تۆڵســتۆی» خۆی هەڵدەستێ بە پێشێلکردنی ئەو یاسایەی کە خۆی بەشداربووە لە دروستکردنیدا، ئەو (بیروڕا شەخسییەکانی خۆی) دەئاخنێتە ناو ڕۆمانەکانییەوە، بەشێکی زۆر لەو ســەرچاوە مێژوییو فەلسەفییانە بەکاردەهێنێت کە پاڵپشتی بیروڕاکانی دەکەن. دانەر دەگاتە ئەوەی سەبارەت بە ڕۆمانی جەنگو ئاشتی بڵێ: (خوێنەر هەندێجار هەستدەکات ڕۆمانێک دەربارەی جەنگی سۆڤیەت دەخوێنێتەوە).

لە یەکێک لە ڕســتە کۆتاییەکانــی ئەم کتێبەدا ئەوە دەخوێنینەوە: (دووفاقی لای تۆڵســتۆی نەبووە)، بەڵام ئەم کەســە بەشــوێن حەقیقەتو دادپەروەریو خێردا گەڕاوە، ئەمەش وایکردووە لە هەمانکاتــدا داوای نەمــری ئەدەبیو کەماڵــی دەرونی کردووە، واتە ئــەوەی نمونەی (عەبقەریەتی دولایەنەیە).

## سەرچاوە:

مسارات البیان، ٢٠١٠/٦/١٩

# بڵاوكراوەكانی

## دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم









